١

گەنجینەیا

# زمانێ کوردی

بەرهەمێن کوردێن یەکیتییا سۆڤیەتێ

ب سەرپەرشتیا:
تۆسنێ رەشید

# گەنجینەیا زمانێ کوردی

## بەرهەمێن کوردێن یەکیتییا سۆڤیەتێ

### بەرگی یەکەم

ب سەرپەرشتییا:

**تۆسنێ ڕەشید**

## سەرمجەما پەرتووکان

# پێشگۆتن

وێژەیا کوردێن یەکیتییا سۆڤیێت ژ چاپ کرنا ڕۆژناما "رییا تەزە" ل ئەرمەنستانێ (یێریڤان)، ئادارا سالا ی دەست پێ دبە و هەتا ژ هەڤبەردانا یەکیتییا سۆڤیێت، سالاێ ۱۹۹۱، دۆم دکە.

ڕاستە یەکەمین بەرهەما وێژەیی ب زمانێ کوردی، پیپێسا عەرەبێ شەمۆ "کۆچەکێ دەرەوین"، سالاێ ۱۹۳۱ چاپ دبە، لێ مرۆڤ دکارە بێژە، وەکی بنگەهێ وێژەیا کوردی ل یەکیتییا سۆڤیێت ب وەرگەران و بەرهەڤکرنا فۆلکلۆرا کوردی هات دانین. ژ سالاێ ۱۹۳۱ هەتا ۱۹۳۷ان دۆر ۱۵ پرتووکێن ژ زمانێن ئەرمەنی و ڕووسی وەرگەراندی تێن چاپ کرن.

ژ ئالیکی مایی ڤە، ئێدی داوییا سالێن ئەمین، یێن سەدسالیا بیستێ، دەست ب بەرهەڤ کرن و چاپ کرنا نموونێن فۆلکلۆرا کوردی دبە.

ئەزموونا بەرهەڤ کرنا فۆلکلۆرا کوردی بال ڕەوشەنبیرێن ئەرمەنیا ژ مێژ ڤە هەبوو، یەکەمین نموونێن فۆلکلۆرا کوردی د دەستنڤیسێن ئەرمەنیا، یێن سالا ۱۷۷٤ ئان ڕاستی مە تێن. ئەگەر وەرگەر ژ بۆ هۆستاتییا نڤیسکارییێ و پێشخستنا زمانێ نڤیسکی بوونە ئەزموونەکە باش، فۆلکلۆرا کوردی ب خوە ڕە دەولەمەندییا زمان و هشمەندی، فەلسەفا کوردایە گەلەری دانی.

پرانییا نڤیسکارێن نڤشا یەکەمین ژ جڤاکێن کوردا دەر مەزن ببوون؛ عەرەبێ شەمۆ ل گوندەکی ڕووسا مەزن ببوو و خۆرتانیا خوە ل ڕووسیا دەرباس کربوو، حەجییێ جندی، ئەمینێ عەڤدال، جاسمێ جەلیل، جەردۆیێ گێنجۆ ل سێوێخانان مەزن ببوون، ئۆوسڤێ بەکۆ د مالبەتەکە ئەرمەنییان دە مەزن ببوو.

تو پێوەندییێن وان ب ڕەوشەنبیرێن کوردایە دەرڤایی یەکیتییا سۆڤیێت ڕە تونە بوون، زانەبوونێن وان سەر وێژەیا کوردییە کلاسیک ژی ژ ناڤان دەرباس نە دبوو.

چەندەک ژ وان ب داخوەزا دەمێ بوونە نڤیسکار؛ د ناڤ کوردێن وەلێت دە هەما بێژی بلی وان کەسێن خوەندا تونە بوون. لێ دیسان ژی ژ وان ڕە ل هەڤ هات د جیهەکی ڤالا بنگەهێ وێژەیا کوردی ل وی وەلاتی داینن.

ژ بۆ یەکەمین نڤشا نڤیسکارێن کورد ل ئەرمەنستانێ تۆماس بۆس د ئەنسیکلۆپێدیا ئیسلامێ دە دنڤیسە:

"ئەو کەسێن د ڤی واری دە پیێۆنێر بوون، کو پرانییا وان ئێزدییێن پەنەبەرێن ژ ترکییێ یە نەخوەندی بوون، ژ رەوشا جڤاکییە نوو سوود گرتن. بێیی کێمترین زانەبوونێن چاندا ئیسلامی، بێیی تو پێوەندییێن ب ئێلیتا رەوشەنبیرێن کوردە مایین رە، بەرهەمێن وان پر جاران یێن ئیدیۆلۆگی بوون، لێ ب هونەرێ خوەزایی".

داوییا سالێن ٥٠ – ئەمین و دەستپێکا سالێن ٦٠–ئەمین دەستە نڤیسکارێن نوو هاتن ناڤ وێژەیا کوردی. تایبەتییا ڤێ نڤشێ ئەو بوو، وەکی پرانیا وان د گوندێن کوردان دە، د جڤاکێن کوردان دە مەزن ببوون، ب خوە رە بین و بۆخسا زمانێ کوردی، هشمەندییا جڤاکێن کوردا دانین. پاشێ ژی ئەڤ کەس نە ب داخوەزا دەمێ ببوون نڤیسکار، لێ ئەو نڤیسکار هاتبوون دنێ، وان نکاربوو نەنڤیسن. ب تایبەتی چاپ بوونا یەکەمین پرتووکێن فێریکێ ئووسف چەڤکانی و شکۆیێ حەسەن ڤالچیچەک د وەژەیا کوردێن یەکیتیا سۆڤییێت دە دەورانەکە نوو ڤەکرن.

ژ دەستپێکا سالێن ٦٠–ئەمین، یێن سەدسالییا بیستێ هەتا هەڤبەردانا یەکیتییا سۆڤییێت، ل ئەرمەنستانێ ژمارەکە مەزن پرتووک ب زمانێ کوردی چاپ بوونە. بلی کتیبێن وێژەیی ژمارەک پرتووکێن ژ بۆ دبستانان، پرتووکێن زانییاری، جڤاکی، دۆختری و سییاسی چاپ بوونە. لێ ژ تالەبەختان رە پرانیا وان پرتووکان نە بوونە هەبوونا خوەندەڤانێن کورد و سەبەب ئالفابێنە.

یەکەمین ئالفابێیا کوردی ل یەکیتیا سۆڤییێت سەر بنگەها تیپێن ئالفابێیا ئەرمەنی ژ ئالییێ هاکۆب خازاریان دە (لازۆ)، سالا ١٩٢١ ئێ تێ ئامادە کرن و ب وێ ئالفابێ پرتووکا ب ناڤێ "شەمس" تێ چاپ کرن.

لێ ئەو ئالفابێ ل کۆمارێن گورجستان، ئازاربەجان و توورکمێنستانێ نەهات پەژراندن. ژ ئالیکی مایی ڤە کۆنگرا ئێزدییێن ئەرمەنستانێ سالا ٥ ئان ژ حوکوماتێ خوەست، کو ژ بۆ وان ئالفابێیا سەر بنگا تیپێن لاتینی ئامادە بکن. ئەو کار عەرەبێ شەمۆ و ئیساهاک مۆرۆگوولۆڤ پێک ئانین و سالا ئان یەکەمین پرتووکا کوردی ب ئالفابێیا سەر بنگەها تیپێن لاتینی چاپ دبە. دڤێت بێ گۆتن د ناڤبەرا ڤێ ئالفابێ و یا جەلادەت بەدرخان ئامادە کری، جهێتیکە مەزن هەیە. کەسێن ئالفابێیا جەلادەت بەدرخان زانبن، نکارن پرتووکێن ب

ئالفابێيا عه. شەمۆ و ئى. مۆراگوولۆڤ ئامادە کرى، ب هێسانى بخوينن.

سالا ١٩٣٨ ان ڕێژيما ستالين ب کار ئانينا ئالفابێيا کوردى، يا سەر بنگەها تيپێن لاتينى، چاوان يا ئيمپێراليستان، قەدەخە دکە.

سالا ١٩٤١ ئێ حوکوماتا کۆمارا ئەرمەنستانێ برييار دا ئالفابەيا کوردى سەر بنگەها تيپێن کيريلى ئامادە بکن. ژ بۆ ڤى کارى کۆميتەک هات دامەزراندن و ئەو کار سپارتن حەجييێ جندى. سالا ١٩٤٤ ئان ئالفابێيا نوو ئامادە بوو.

ژ سالا ١٩٤٤ ئان هەتاێ ١٩٩١، ل يەکيتى سۆڤيێت پرتووکێن کوردێ ب ئالفابێيا سەر بنگەها تيپێن کيريلى چاپ دبن.

ژ سالا ان دەستپێکرى هەتاێ ب سەدان پرتووک ل يەکيتيا سۆڤييێت ب زمانێ کوردى چاپ بوونە. لێ ژ تالەبەختان ڕە ئەو پرتووک ب سێ ئالفابێيان؛ يێن سەر بنگەهێن تيپێن ئەرمەنى، لاتينى و کيريلى هاتنە چاپ کرنێ، کو هەرسێ ئالفابێ ژى ئيرۆ نايێن ب کار ئانين و خوەندەڤانێن کورد نکارن وان پرتووکان بخوينن.

چڤواس ژى ڤان ساليێن داوى تيپگوهێرينا چەند پرتووکان هاتيە کرن و ئەو ب ئالفابێيا جەلادەت بەدرخان هاتنە چاپ کرنێ، لێ ئەڤ نە بەسە. دڤێت ڕۆژەکێ زوو وان پرتووکا گشکان بگوهێزن ب تيپێن لاتينى و عەرەبى.

بەرى گشکى ئەڤ بەرهەم بەشەکى وێژەيا کوردى، يا گشتى نە و دڤێت ب تيپگوهێرينە ببنە هەبوونا خوەندەڤانێ کوردا گشکان. ئەڤ بەرهەم نوسان ژى خزنەکە پەيڤێن کوردى نە، کو ژ بۆ لێکۆلينا زمانێ مە دکارن ببن بنگەهەکى کێراهاتى. گەلەک پەيڤێن د ڤان بەرهەمان دە ڕاستى مە تێن ئيرۆ ئێدى نايێن ب کار ئانين.

کوردێن يەکيتيا سۆڤيێت، بێيى تو پێوەندييێن ب بەشێن گەلێ کوردە مايى ڕە، بێترى ٧٠ سالى ژيانا خوە دۆماندنە. گەلۆ د ناڤ وان سالان دە چ گوهاستن د زمانێ وى بەشێ گەلێ کورد دە چێ بوونە؟ گەلۆ باندۆر، کارتێکەرييا زمانێن ڕووسى و ئەرمەنى سەر زمانێ وان چڤواسە و ب چ ڕێ بوويە؟ ب باوەرييا مە پسپۆرێن زمانێ کوردى د ڤان بەرهەمان دە دکارن بەرسڤا ڤان پرسان و گەلەک پرسێن مايى ببينن.

گوهاستن د زمانێ بەرهەمان دە نەهاتييە کرن، تەنێ ژ بۆ هێسا کرنا خوەندنێ مە هنەک بەشێن پەيڤا، گۆر ڕێنڤيسا دەما مە، ژ هەڤ جهێ کرنە.

تۆسنێ ڕەشيد

# عەفراندنێ نڤیسکارێ کورمانجا سۆڤێتییێ

نەشیر متا حوکومەتێ

یا ٤ ئا

هازر کر:

**جاسمێ جەلیل**

---

نەشیرمتا حوکومەتا ئەرمەنیستانێ

یێرێڤان



# Ә'ФРАНДНЕ НВИСК'АРЕ КÖРМАНЩА СОВЕТИЕ

ЙА IV–А



НӘШИРӘТА ҺÖКÖМӘТЕ

# حەجیێ جندی

## دەستەبراک

«هەرگێ سەرهاتیا من دپرسی، ئەو گەلەکی درێژە، گەرەکێ بینم بیرا خوە بەرخڤانی و شڤانیا خوە و گەلە-گەلە تشتێد دنێ. یەکێ ژێ: منرا دەست نادە، وەکی ئەز ب خوە بێژم، لێ تو وەرە ئەزێ دەرەقا هەڤالەکی خوە تەرا گلی بکم، پاشێ ناقلێ تە چاوا دبرە، نوسا ژێ بکە»، ب ڤی تەهەری خەبەردانا خوە، دەست پێ کر رێوییێ هەڤالێ من.

– ئەز دچووم ئەلەگەزێ، گوندێد کورمانجایە تەزە؛ من دخاست دیسا و دیسا بنڤیسیا دەرەقا کۆلخۆزا دا، چکا چقا پێشدا چوونە، چکا چقا و چقا کادر پێشدا هاتنە، چکا ژنا کورمانجا ئازابووی پێشداچوونێ چاوا دەست ئانینە، چکا و هەزار چکاییێ دنێ...

چیاییێ ئەلەگەزێ پێشبەری مە بوو؛ خانێ دکرن بەلەکیێد بەرفێ، حەواسا مێرڤ ب وانارا دهات.

رۆژە سایی بوو و خوەش. ئەرێ، جماعەتێ گۆتییە: «رۆژا خوەش، سبەدە خوەشە». و ئەز دنێرم و دفکرم. بیرا من تێ زارۆتییا من، وەکی من هەما وەعدەکی کندا ل ئەلەگەزێ دەرباز کر بوو. ئەو وەخت-وەختێ برچیبوونێ بوو، وەختێ کوشتنێ، وەختەکی نوسا، وەکی خەلایا مێرا بوو... سالا حەزێر نەهسد حیژدا: سالا شەرێ ئەرمەنییا و رۆمێ... چ بێژی، وەکی من بەر چەعڤێ خوە نەدیتن، جەو و کانییێ ب خوون، تالان و تاژان، هێسیر بوون، قوول بوون، ژنێ مەلوول و... ل هەر، هەر دەرا، ل چۆلێ، کەوشەن، ل هەر مالەکێ ترس و خۆف.. گەلۆ، گەلۆ قە دڤە، وەکی مەرڤ رۆژێد نوسا ژ بیر بکە...

«بەلێ، رەوییێ هەڤالێ من، مەرڤ دڤێ تشتەک ئانی بیرا خوە، فکرا منە بەلابوویی بەر ب خوە تەکلیف کر و دیسا دەست ب دوومایا خەڤەردانا خوە کر، ئەز وەختەکی لڕایۆنا ئەلەگەزێ دخەڤتیم: زەمانێ سۆڤێتییێ؛ ل هەر دەرا دهاتە دەنگێ کلامێ تەزە، جماعەت ئازا بووبوو: ئەوێ دەست ب عەمرێ تەزە کربوو: دەست ب خەڤاتا گومرووهـ بووبوو. پارتیێ، حوکومەتا سۆڤێتییێ دابوو پێشییێ مە، وەکی ئەمڕایۆنێ بوو د پرسا مالهەبوونا گومرووهـدا،

یا تەشکیلرنا کۆلخۆزادا، پرسا کوولتوورایێدا، پێشدا بڤن و هلبەت، بۆنا قەداندنا وان دەرەجا، بەرێ عەولن لازم بوو هازرکرنا کادرا.

ئەز ڤێ کاڤێ نکارم بینم بیرا خوە، چکا مە چقا کادر د وێڕایۆنێدا دانە هازرکرنێ، لاوکێ ئەرمەنی، کورمانج، لێ هەما ژ وانا، هەلا د وی چاخیدا یەکی دها بەر ب چەعف بوو، ئاکتیڤ. ئەو زلاما ڕۆژەکێ هاتە جەم من، ئەز دڤێم ڕۆژمکە وا خومش بوو. وەختا خەڤەردانێ ئەشقا من ئوسا پێرا هات، وەکی ب زار نایێ گۆتنێ. مەرڤ دگۆت، من و ئەوی، مە خەونا

شەڤادا هەڤ دیتیە و گەلەکی بەرێدا هەڤدو ناس کرییە. ئەوی ناڤێ من هلدا، من ژی ناڤێ وی و چاوا دخوەنییا، ئەوی ژی ژ من حزکر. ژ وێ ڕۆژێ شووندا خەڤاتێدا مە باوەربوونا خوە ل هەڤ ئانی و ئاریکاری ددا هەڤدو. ئەڤا یەکا ئای های بۆنا خەڤاتاڕایۆنێ ژی زەعف ڕند بوو.

لێ تو وەرە، هەڤالتییا مە و خەڤاتا مە گەلەکی نەکشاند. ئەم هندکی ل چیایێ ئەلەگەزێ گەرییان، مە هندکی ئاڤێد کانیێ وێ یە سار ڤەخار و یا سەری ئەو بوو، مە هێ د ناڤا جماعەتێدا خەڤاتا پێشیا مە هاتبوو دانینێ، ب تەمامی نەدابوو قەداندنێ...

چاوا زانی، هەزار نەهسد چل و یەکێ سالێ، بیست و دودێ ئییوونێ، تەقیان تۆپ و تفنگ، دنیا هەڤ چوو هات، بوو گورە-گورا تۆپا و پیلیمیۆتا، بوو قرچە-قرچ و ڤزە-ڤزا گولا، بوو هەوار و گازی ب هێوەرزە، دەست ب ڕۆژا ئۆغرمێ گران بوو؛ ڕۆژا باڤۆ-باڤۆیێ... و هلبەت، چاوا ئەز ئوسا ژی ئەو هەڤالێ منی جاهلی دەڤ ب کەن هازربوون هەرنە شەرێ وەتێن. لێ ئوسا قەومی، ئەز نەچووم شێر، پارتیێ ئەز شاندمە سەر خەڤاتەکە دنێ جاڤدار، هەما هەڤالێ من، هەڤالێ منی عەزیز، وەکی شیرنبوونا من، ژێرا دگۆت شیرن، مینا مێرخاسەکی سیلهـ، قەپەچەکر و بەرێ خوەدا جیێ ئێگر، شێر، وەکی وەتێن خای بکە. ئەرێ، بەری چوویینێ، ئەز ژی نزانم، چاوا ئەم چوونە ڕووێ هەڤ، و ئەوی گۆت: «برێ من، ئەز ئیدی دچم، توێ دمینی، کی زانە جارمکە دنێ ئەمێ هەڤ بڤینن، یانێ نا. ئەز دخازم هەرم مۆسکڤایێ خای بکم، مۆسکڤایێ». ئەوی دوجار کر، «گەلۆ، مۆسکڤا نین بوویا، حالێ مەیێ چاوا بوویا، حورمەتە هەر، هەر باژارڤانەکی وەتەنێ مەڕا، وەکی حەتا خوونا خوە ژی وی باژارێ ئازایێ، ل کیدێرێ ڕوودنی ستالینێ مەزن، خای بکە». کەلا ویڕابووبوو، من ل چەعڤێ وی ئاگری

نهێریی و گۆت حورمەتە. حورمەتە بۆنا هەر وەتەنحزەکی، بێ کو وێ مۆسکڤا ڕەنگین خای بکە... و ئەم جارا دودا ژی چوونە ڕووێ هەڤ، مە دەستێ هەڤ گرت، نزام چاوا ئەوی وێ لەزێ گوندێ خوە بەرێ ئانی بیرا خوە، جارەکێ ژی ل ئەلەگەزێ نهێری، من ژی زاروتیا خوە؛ مەرڤ دگۆ، مە هەسافداری ددا هەڤ، چکا ئەم کی بوون و نها بوونە کی... چڤا پێشدا چووین...

پاشێ ئەوی ل زارێ خوە پۆرکوریشکی، باڤێ کال و دیا پیر، ل برێ خومیی بەدەنشێر نهێری و گۆت: «چڤا شەرمە، هەرگێ ئەم فاشیستێ گێرمان بهەلن بێ هەیلۆ بگێژە چیایێ مە، ڤی گوندێ مە، بێ ڤان دەرا بهەرمینە، ئیدا ئەز، ئەم بۆنا کیژان ڕۆژێ نە. خایکرنا مۆسکڤایێ، ئەو خایکرنا ئەلەگەزێ یە» و ئەوی و دێ باڤ حەمێزکرن. باڤێ کال ئانییا وی ڕاموسا و گۆت: «ۆخر بە تەڕا، هەرە لاوێ من، هەما ناڤێ مێرخاسیێ ژ بیر نەکی: برا مەرڤ مێر بە، ڕۆکێ ل دنێ بە». دێ نەگرییا، دیسا چەعڤێد کورێ حزکیری ب شەوات ڕاموسا و گۆت: «شیرێ من ب تە حەلال بە، شوورێ تە شوورێ برا بە، ئۆغر بە لاوێ من، کێدەرێ کەڤی، شیرێ من ژ بیر نەکی». حەتا ک شیرن نێزیکی کور و قیزا خوە دبوو، من جارەکێ ژی ل دیا وی زەربەدەستە مێرانە نهێری و خوە-وەڕا گۆت: گەلۆ، هەما سەڤا ڤێ کولفەتێ نەگۆتنە، کو «شێر شێرە، چ ژنە، چ مێرە».

و شیرنێ مە ڕێکەت، ژ ئەلەگەزێ دەرکەت، وەکی مۆسکڤایێ-حەد و سەدا مە ب سینگێ خوە، ب خوونا خوە، تەڤی هەزار-حەزارا خای بکە، وەکی وەتەنێ سۆڤێتیە خای بکە، کو دیا وی تمێ سەرفناز بە، وەکی باڤێ وی کۆلۆزێ خوە قۆت گرتدە، وەکی جماعەتا وی، جماعەتێد سۆڤێتیێ د ناڤا دەست و پیادا پێپەس نەڤن، قوول نەڤن...

و ژ وێ ڕۆژێ دەستێ مە، دەستێ مە دەستەبراکا ژ هەڤ قەتیا. هەما ژ بیرا من نەدچوو خەبەرێ وی پاشن: «خایکرنا مۆسکڤایێ، ئەو خایکرنا ئەرمەنیستانا سۆڤێتییە، خایکرنا چیایێ ئەلەگەزێ». و ئەز ژی کاڤ و سەحەت دخەڤتیم، خەو نەدکەتە چەعڤێ من، گەلە جارا من نان نەدخار، من مال و زارو بیر کر-بووبوون: تەنێ و تەنێ دخەڤتیم، وەکی ب جماعەتێرا تەڤایی ئالی فرۆنتێ بکم، ئالی شیرنێ دەستەبراکێ خوە. و ڕۆژ دەرباز-دبوون، من جاڤ نەدستەند. شەڤ و ڕۆ شیرن ل بەر چەعڤێ من بوو. شەڤا من هەی د خەونا خوەدا ددیت: ئەوی دل ددا من، من دل ددا وی و پاشێ، پاشێ، گاڤا من بانز ددا سەر خوە، هەو دنێری خەونە... گەلەکی بەر خوە دکەتم. جارنا ژی ئەز دچوومە گوندە باڤێ وی؛ گوندێ سەنێ. من باڤێ دپرسی، باڤێ ژی ژ من دپرسی، لێ کەسەکی، تو کەسەکی دەرەڤا

شـيـرندا نزان بوو: «گـەلۆ سـاخـە، يانێ... مـرى يـە»؟ لێ مـە، هەمـا وان ڕۆژێ چەتندا مزگینیکە گەلەکی خێرێ بهیست، شابوونا لنگێ مە عەرد نەدگرت. ل هـەر دەرا بوو گممین، بوو هەیدادە، گۆتن «مـۆسكڤـايـێ ئالتكر»، گۆتن: «دژمن د بەر دەرگـێ مـۆسكڤـايـێ هاتە ئالتكرنـێ، هنجراندنێ»، گـۆتن: «ئەسكەرێ سۆڤـێـتـيـێ بەرى فـاشـيـستـا دان، فـاشـيـست درەڤن»، گۆتن و ل هـەر دەرا ئەو خـەبەرێ شايێ دگۆتن. و گاڤا ئەڤا خەبەرا چەعفرۆنكايێ گوندیێ سەنێیی عەیان بهیست، گۆ: ئێ، شکر ژ ڤێ گاڤێرا، وەکی ئوسانە، کورێ منی ساخە... مۆسکڤایێ ئالتکر!

و ڕاسـتـيـێ ژى، چەنـدەكى دنێ، من كـاخـەزا دەسـتـەبـراكێ خـوە سـتـەند. من سـتـەند و لەزەکی جیێ خوەدا بوومـە کەڤر، من تاقـەت نەدکر ڤەکرا خوونا سـەر کانڤێرتێ تشتـەکی پاک نەدگۆت.،. لێ چاوا هەبوویا،

من بەر خـوەدا و هێدى ب فەسـال ڤـەكر. خـەبەرا پێشن وا بوو. «مـەترسە، ئەزى سـاخ-سلامەتم»! بینا من هنەکی ڤەبوو، مەرڤ دبێ کەلا من دانی، هێسا بووم و هێژا، من دەست ب خـاندنێ کـر، ئەوى نڤـیـسـى بوو؛ «برێ منـى عـەزيـز، من نكاربوو نـچێ كاخـەزا خـوە ب خوون نەکرا، ب خوونا مێرخاسا، ب خوونا وان عەفاتا، وەکی مۆسکڤا دانە خایکرنێ.

مـۆسكڤـايێ ئالتكر، مـە دژمنـێ دەڤ ب خـوونى هـار هنجـراند و گـاڤـا مـە ئەو شـووندا دا، هێژا تو، دێ و باڤێ من، زاروێ من کەتنە بیرا من و من نڤیسـی... ئەز، ئەوى نڤـيـسـى بوو، وەکی دنێ، دەرەڤا لاڤردیێ مە خۆرتانیێ نانڤیسم، ئەز دەرەڤـا خوەدا ژى نانڤیسم و ئەزێ چمـا ژى دەرەڤـا خـوەدا بنڤـيـسم. کـا من چ کرییە. ئـەزێ بنڤـيـسـم دەرەڤا شـێـرۆدا، دەرەڤـا سوودیێ حـەلال، وەکی خوونا وی ل سـەر کاخـەزا تە یە. خـازل، خـازل، من ئەو د ڤێ ڕۆژێدا نەدیتا. خـازل، هەفت میرێ خـازل، قە نا، من بەرێدا ئەو ناس نەکرا. چـا خۆرت دڤێژم، مێر دڤێژم و نهـا، نهـا، برا تەڤـا عـەیان بە، چقـاسـی ژى تو نەخـازى باوەر بکی، ئەو، بەلێ، ئەو مێر لنگەکی بەلەنگاز بوویە... شێرۆ ب دارا ڕێ دچە... شـێرۆ ئیدی نکارە برەڤە، ببەزە... شـێـرۆ..گـەلۆ تـویێ باوەر بکی...لـێ پرس هەلا ئەو یەک نینە، پرس ئەو پـرسـە، گـاڤـا ئەز نێزیکی وی بووم و من ب کەلۆبین چەعڤێد وی وەکە تاس ڕامووسـا، ئیجار ئەوى دل دا من. شیرنێ برا، ئەوى گۆت، تو چرا بەر خـوە دکەڤی، کا من چ کرییە، حوکومەتا سۆڤێتیێ گەلە تشت مەڕا کرییە، جماعەتا مە ژ مرن و زەلوولیێ خلاس کر، کا من، کا من چ...»

و ئەز کـەر بووم، لێ ئـەوى هەلا من دنێـرى و مــەرڤ ترێ هێ دگـۆ: «کـا من، کـا من چ

کریه»؟ لێ ئەز دفکریم، کو عەولەدێ جماعەتێ مە سۆڤێتیێ

گهیشتنه سەر چ فەمداریکه بلند، چڤا پێشدا هاتنه چڤا وەتەنحزن... کا، من ژ بۆنا وەتێن چ کرییە. من وەکی دنێ تو تشت نەگۆتێ و گاڤا خوونا وی یە گارم هێ دنقتی سەر بەرفا سپییە یەک شەڤی، من کەرە-کەر ئەڤا کاخەزا دا بەر نقتکێ خوونا سۆر وەکی تەڕا بشینم، وەکی بشینم ڕێسپووبلیکا مە بەر ب ڕۆ، بۆنا کیژانێ شێرۆ شەر کر، بۆنا کیژانێ ئالت کر..

شیرن نڤیسی بوو: خوونا من دکەلە. من هەما وان ڕۆژا د ناڤا جنیازادا جنیازێ لیباریت دیت، یێ وی لاوکێ بەنگزخوەش، خیرەتی حەلال، یێ وی خۆرتی، وەکی ب مەڕا تەڤایی خەڤاتاڕایۆنێ پێشدا دبر و گاڤا ک نێزیک وی بووم، من کاخەزەک ل ڕەخ وی دیت، من بێ حەمدی خوە هلدا: «من ب ناڤێ وەتێن شەر کر، من ئالتکر» نڤیسی بوو. گەلۆ، کێ نڤیسییە ئەڤا کاخەزا، دڤە هەما لیبۆ نڤیسی بە. من خوە و حالاڕا گۆت و نێزیکی جنیێز بووم، ئەوی هەلا گەرم بوو، من دڤێ خوە کر گوهێ وی، سێ جارا گۆت، برێ منی شیرن، هەڤیێ ژی «ب ناڤێ وەتێن تە شەر کر، تە ئالت کر». و من کومێ خوە هلدا، ل سفەتێ وی نهێری، ئەوی ئیدی ڕازا بوو، کەتبوو خەوەکە شیرن و کبیر... چاڤا من نەدا، لێ من، من گاڤا خاتر خاستنێ، ئەو کاخەز هلدا، وەکی بشینم گوندێ هە و گۆت: بەلێ برایێ من، مێرێ مێرخاس وا دمرن، لەما گۆتنە: «مێر دمرە، ناڤ دمینە».

و سیلە د دەستێ مندا، ئەز پێشدا چووم: ئاها ژنێد زارێ خوە ئونداکرنە، گوندێ شەوتی، باژارێد تارم-تاخکری، من گاڤا ل وانا دنێری، من هەو زانبوو ئاگر ب دلێ من کەتییە؛ هێرسانا، کەربا ئەز د خوەدا دخەنقیم و وەختێ ئوسا من تەخمین دکر وەکی دو دەست هندکن، وەکی دو لنگ کێر نایێن.

«من دخاست، من دخاست ببوومە هەر تشت، وەکی ڕۆژەکێ زوو تەختێ هیتلەریێ وەلگاراندا، وەکی ئاڤا هێسیر بوون، مەرووم بوون نەکەتا دنیایێ... وەلات نەدیتا...» پاشێ ژی نڤیسی بوو. «چاوا بکەم، چەتنە، گەلەکی چەتنە نڤیساندن، دێ چاوا هەڤە، تو دنێری، هەرگێ ب زار تەڕا نکارم بێژم، لێ ب نڤیساری دنڤیسم. ئەز دڤێم تو فێرزێ گوندیێ ق. ناس دکی. ئەو کۆلخۆزنیکێ عەیان، شڤانێ بەرێ، ئەوێ پسپۆر. حەیف، سەد و سەد حەیف، ئەو ژی نها نە کو تەنێ ژ لنگەکی، لە ژ هەردو لنگا ژی مەرووم بوویە... فێرزێ ک تەمام دەشت و زەڤی ددە بن لنگێ خوە، ئیدی نکارە سەر لنگێ خوا بسەکنە. فکرا کێرا

دەرباز دبوو، کی باوەر دکە، یانێ ژی گەلۆ تشتێ باوەربوونێ یە. و وەختێ شەرمکی زۆر، گاڤا ک هەڤالێ وی گشک تێنە کوشتنێ، ئەو تەنێ دمینە. پاشێ، چاوا دڤێژن، ئەو لنگێد خوە کەلەمچە دکە، وەکی «کوشتنا وی هەیە، رەڤا وی تونە» و تەک-تەنێ پێشیا ئەسکەرێ پر شەر دکە، چەندسد فاشیست ژ گولا وی مێشنداری دەڤەروویی عەردێ دبن... و وەختێ هەوارییا ئەسکەرێ مە خوە ب وی زلامیرا دگینە، هاما وی چاخی ژی فێرز لنگا ئوندا دکە... گۆ، وی چاخی ژی هێ دسترا و دگۆت: «دە لێخن، برانۆ لێخن، چکا: کی ژ مە بەرخە، کی بارانە».

«نزانم، قە نزام، کا، دەرەقا کێژان مێری چێدا بنڤیسم، وەکی دلێ من دینج بە، هێسا بە...»؟ نڤیسی بوو: «برێ منی عەزیز، گاڤا ک ئەز زۆرێ ددمە قەلەما خوە و ڤان خەبەرا ل سەر کاخەزێ رۆ دکم، دلێ من هندک دمینە دەڤێ منرا دەرێ، تەڤی کاخەزێ، یانێ ژی هەما بێ کاخەز هەوابربە، بێ جام تە، بێ بێژە، بێژە و بێژە، نها دیسا ئاگر و ئالاڤ پێ کەتییە، من ددافینە بەر ب حەیفێ، لێ گەلۆ ئەزێ بکاربم حەیفێ هلدم، گەلۆ ئەزێ «تشتەکی» بۆنا وەتێنێ مە حزکری بکاربم بکم، یانێ نا، گەلۆ ئەزێ... « خەبەرێ وی پاشن، چڤا بیرا من تێن، ئەڤ بوون: «ئیدا، ڤێ گاڤێ، ئەز تەرا نانڤیسم. دو رێ ل پێشیا من هەنە - یانێ مرن، یانێ ژی سەرفناز دەرکەتن. من گومانە دەرەڤا یا پێشندا ژی، یا پاشندا ژی بێ شاندنا کاخەزێ من، ل کو هەڤە، تویێ ببهێی ژ دەستەبراکێ خوە شەرم ناکی، هەما، برایۆ، مەرڤ ب عەمرێ درێژ دگێژا مرازا.

### شیرنێ تە

«مەرڤ ب عەمرێ درێژ دگیژە مرازا»، من خوە-خوە گۆت و جارا دودا ژی خاند. من ئانی بیرا خوە بازارێ مۆسکڤایێ، ل کێدەرێ هێن بووبووم، ل کێدەرێ ئەو ژی هێن بووبوو، بازارێ لێنینگرادێ، ل کێدەرێ شیرن و شێرۆ خاندبوون و عەولەدێد گوندێد هـ. و ق، ناڤدار... وان گوندا، وەکی د بەرپالا ئەلەگەزێ پەر ڤەدابوون. ئەز خوەدا گەلەکی کەوکریم، خوونا سەر نەمێ گەلە تشت منرا دگۆت، و من ژی هەما ل ڤرا، دخاست، وەکی خەو و برچیبوون بهاتانا هلدانێ، کو ب جماعەتا مەرا تاڤایی دها و دها ئالی فرۆنتێ، شەرکرا بکرا. نەهـشتا، وەکی خوونا شەرکرێد نۆلانی شێرۆ برژیا سەر عەردێ. دژمنێ هاری داڤ ب خوون، دها زوو بهاتا ئالتکرنێ و هەما سەر ڤان فکرا، ئەز ژی نزانم، چکا چاوا رۆژەکە هاڤینێ چووما بەر ب کەوشەن. چەعڤێ من ب سملێ تژی کەتن، زاڤێد بێ سەرۆبن، بینا

من هنەکی ڤابوو: ئەز ڕەخ کۆلخۆزنیکارڕا دارباز دبووم، ئەوانا ب کود و جەعد ددرووت، دلەزاندن، وەکی نان ڕۆکێ زوو بگهین فرۆنتێ. بۆ وێ ئەز ب وانارا تەڤایی شا دبووم، هەما تو وەرە ئەوێ یەکێ گەلەکی نەکشاند. ئەز ڕاستی مەرڤەکی دنێ ژی هاتم. من دینا خوە دایێ، وەکی ئەوی گا بەردانە ناڤا زەڤیا کۆلخۆزێ، وێ دلێ خوەرا هێدن-هێدی دچێرینە. من لەزاند، چوومە نێزیک و گۆت: قوربا، من گۆت، تو ناڤینی، ئاخر ئەڤا زێڤی یە، چرا دچێرینی؟ ئەوی ژی گۆت: «خراف نینە، وەکی ب ڕیا خوەدا هەری». جانم، من گۆ، – ئەز دڤێم، زوو بکە، گا ژ ناڤا زەڤیێ دەرخە. «تە ژ من خێرە، وێدا هەرە، ئەوی ناڤبریدا خەڤەردانا من، ناڤینی فاشیست تێن، یەکە، ئەز نەچێرینم، ئەوێ بچێرینن» چاوا؛ فاشیست، من گۆ، کۆلێ تو د مندا بێی، لاوک ناڤا شێردا خوونێ برێژن، بۆنا ناڤێ مە، بۆنا کەوشەن، بۆنا وەتەنێ مە بێنە کوشتنێ، ئەڤا بێ ڕۆ ناڤا نیڤرۆ ئوسا بێژە؟ من ئیدا شڤدارا دەستێ وی نەنهێری و هەر قولخا خوە بیر کر...

ئیدی بوو هەوار و گازیا وی... لێ من، من خوە ئوندا کربوو... نها ئەز وێ ڕۆژێ تینم بیرا خوە و خوە ب خوە دکەنم. لێ وی چاخی، ئەزی لاپی باشقە بووم.

دیسا خەو نەدکەتن چەعڤێد من؛ من هندک دخار و گاف و سەحەت دخەڤتیم، لێ تو وەرە، تو جارا ژ خەڤاتا خوە نەرازیبووم. خەلقێ دگۆت: «تو ڕند دخەڤتی»، لێ من تێ دەرنەدخست.

و دیسا ڕۆژ دەرباز دبوون، ڕۆژێد وەکە سالا، گاڤا ک دهاتمە مالێ، منێ بەرێ عەول پرس بکرا، گەلۆ نەمە تونەنە، سەحەتا ئەز دچوومە ئیدارێ، من نەمە ژی دخاندن... کاخەزا شیرن تونە بوو، تونە...

و سڤەکێ زوو هاتن منڕا گۆتن، کو «گازێتێدا مقالەک سەر ناڤێ شیرن هاتیە نڤیسارێ» شابوونا من هەر خەڤاتا مالێ هشت، و ئەز ب لەز چوومە کتێبخانێ، من ئەو ئۆچێرک دیت، چەندک-چەند جارا خاند.

من جارا عەولن فکرا خوەدا خاند، کەرە کەر، لێ ئەو نەبوو، ئێژا من بلند خاند، زمانێ من گەریا، گوهە من بهیستن، لێ تو وەرە – دسا نەدبوو. د ئۆچێرکێدا هاتبوو نڤیسارێ؛ هەزار نەهسد چل و چارێ سالێ شیرنێ پۆدپۆلکۆڤنیک ل پارەجیا مینسکێ-بۆبرووپسکێ بوو. ل پێشیا وی پرسەکە گەلەکی فەرز هاتبوو دانینێ. ئەوی و شەرکرێ خوە ڤا گەرمکێ حجوومی سەر دژمن بکرا. شیرن ڕۆ دکر و دپیڤا، لێ وەختەک دەرباز

نەبوو، بەشەرا وی خوەش بوو و وەختێ حجوومکرنێ پەی هەر گلییا گۆت: باڤێ من، وەختێ ڤەرێکرنێ، منرا گۆتیبە، وەکی «برا مەرڤ مێر بە، برا ڕۆکێ ل دنێ بە»، نها ژی ئەز وەرا دڤێژم، گەرەکە ئەم ب مێرانی شخولێ خوە ئیرۆین بینن سێری. وی چاخی ئەسکەرەکی ئوورس، عەمردا نە ئاڤا چووک گۆ: «هەڤالێ پۆلپۆلکۆڤنیک، گەلۆ ئەو ب چ زمانی هاتیبە گۆتنە»؟ ب زمانێ کوردی، پۆدپۆلکۆڤنیک جاڤا وی دا. «ب زمانێ کوردی، ئەسکەر دیسا گۆ، لێ گەلۆ ناڤێ، وەکی ئەم ژی وێ مەسەلێ ڕند هین بن»؟ چرا نا، پۆدپۆلکۆڤنیک ب بەشەرەکە خوەش گۆت و عەمر دا: «پێشدا، گەلی هەڤالا، برا مەرڤ مێر بە، ڕۆکێ ل دنێ بە»! و کشکا ئەو خەبەر وەکلاند و حجووم کرن. ژ وێ شووندا نە ک تەنێ وانا بەری دژمن دان، ژ جیێ ویڕاکرن، لێ وەکە پەنجسد نەفەری ژی پلێن (هێسیر) گرتن».

ئەو ڕۆژ بۆنا ئەسکەرێ پۆدپۆلکۆڤنیک زەعف ڕند دەرباز بوو، لێ تەنێ ژ وێ ڕۆژێ حەیا ئیرۆ، ناڤێ وی ئەسکەرێ ئوورس، وەکی هەڤیێ ژی مێرانیکە زۆردا کفشکرنێ، بۆنا حزکرنێ ئیدا نەدگۆتن ڤاسیل، لێ دگۆتنێ: «برا مەرڤ مێر بە، ڕۆکێ ل دنێ بە».

ئۆچێرکێدا هاتبوو نڤیسارێ، وەکی ڕۆژەکێ ژی شیرن و ئەسکەرێ خوە گهیشتن چەمە نارڤایێ. ل پێشیا وی ئەسکەرێ وی هات بوو دانینێ، وەکی ژ چێم دەربازی وی بەری ئاڤێ بڤن، وەکی پلاتسدارمێ چێکن، کو کۆمێد ئەسکەرێد دنێ بێن بگیژنێ وانا بۆنا حجوومکرنێ و پێشدا چوویینێ. ئەو داریاسبوون گەلەکی چەتن بوو، لێ گەرەکێ بهاتا سێری، وەکی دنێ تو ڕێ و مکەن تونە بوو. و ئەو پارا ئەسکەرێ ب سەروێریا شیرن دەرباز بوون، دژمن دانە ئالتکرنێ و پێشدا چوون. ئەڤا، ئۆچێرکێدا هاتبوو گۆتنێ، دەست ئانینەکە مەزن بوو و نها دیسا ب مێرخاسی ئەسکەرێ وی عەفاتی پێ-پێ دانە پەی دژمن. تەنێ تشتەک ل پێشیا وانە، پێشدا هەرن و دژمنێ هاری-هور ئالت بکن ئۆچێرکە مەزن بوو، ڤێ گاڤێ کشک نایێ بیرا من، لێ تەنێ تشتەک ژ بیرا من ناچە: دلێ من زەرپ دکوتا و من د وی دلێ خوەیی شابوویدا دگۆت: دەستەبراکێ من، تە سەحەتە خوەش، ناڤ و حۆرمەت ژ تەڕا، دها ب سیانەت بی و نزام چاوا تەمیێ دیا وی هاتن بیرا من، پاشێ من خوە-خوەڕا گۆ: لێخە، برایۆ، لێخە، شوورێ تەیی برا بە دەستێ تە سەر دەستاڕا بە! مەرڤێد ڕەخ من ل من و ل ڤێ بەژنا منە بلند نهێرین. وانا تێ دەرخست، وەکی ئەز دەرەڤا یەکیدا ئاڤا تەڤ هەڤ بوومە، لێ تەڤی هەڤ بوونا من، ئەشق و حزکرنا من ئاڤاڕابووبوو، کو چاوا دڤێژن سرێ دەر بوون، لەما ژی وا تەهەرکی عەجێڤمای مان.

ئاخر، نە پرس دەرەڤا وی باتراکێ ئوندابوویی بوو، وەکی حوکومەتا سۆڤێتیێ دەستێ

وی گرت دا هینکرنێ، پێشدا کشاند، کره خەڤاتچیکی بەر ب چەعف، دەرمقا وی مەرڤیدا بوو، وەکی ژ تونەبوونێرابوو، بوو پێدپێلکێڤنیک، وەکی گەهیشتە وێ فەمدارییێ، کو خایکرنا مێسکڤا سێر، خایکرنا وەتەنێ سێڤیتییێ، ژ هەر، هەر تشتی بلندترە، لێ چاوا ئەز شا نەبووما، چاوا تەڤی هەڤ نەبووما، چاوا بەشەرخوەش نەبووما؟

ئەز چاوا شا نەبووما، گاڤا چەندەکی دنێ من بهیست، وەکی ئەوی دەستەبراکێ من، بەرخڤانێ بەرێ بوویە قەهرەمانێ (عەگیتێ) تڤاقا سێڤیتییێ. من لەزاند چوومە مالێ. من تێلەگرامەکە چەعڤرێنایێ شاند، تێدا نڤیسی بوو: شیرنێ برێ من، تە سەحەتە خوەش، ئەم ب تە کوبارن. دەرباز نەبوو وەختەک، من نامەک ژێ ستێند، ئەوی سلاڤی من و مەرڤێ مالێ کربوو، دلرازیا خوە گێتبوو دەرمقا تێلێگراما من و پاشێ ژی زێدە کربوو: «کا، هەلا من چ کرییە، حوکومەتا مە سێڤیتییێ گەلەک داییە مە، لێ من هێ هندک کرییە...»؟

ڕێوییێ هەڤالێ من گلیێ خوە کوتا کر، ئەم ژی دها دگهیشتن ئەلەگەزێ و گاڤا ک ئەم ژ ئاڤتێمێبیلێ پەیا بوون، ئەوی خاترا خوە ژ مە خاست و بەر ب مالەکێ چوو.

هەما وی چاخی، تەزە ئەز خوە حسیام، وەکی من تشتەکی مەزن بیرکرییە، من هەڤالێ خوەرا گێ:

– پاهـ، مالا من ئاڤابە، من ژ وی جامێری نەپرسی ژی، چکا ئەو ب خوە کی بوو.

هەڤالێ من گێ: –حەیف، ئەز ژی نزانم، لێ ل سەر پێسیرا وی نشانا دێپووتاتییا سێڤێتا تەورە بلند یا تڤاقا سێڤیتییێ سێسیالیستییێ ڕێسپووبلیکێ هەبوو.

– لێ کودا دچە،–من دیسا ژێ پرسی؟

– ئەز دڤێم دچە مالا دەستەبراکێ خوە.

– مالا قەهرەمانێ تڤاقا سێڤیتییێ؟ چرا ئەو هاتییە؟

– بەلێ،–ئەڤا چەندەکە،–ئەوی جاڤا من دا.

– دە وەکی ئوسانە، ئێدا ئەز چرا دچمە جیێ

دوور، هازر، وەرە، ئەم هەلا دەرمقا ڤان هەردو داستەبراکێ خودان ناڤێ ئەیان بنڤیسی و پاشێ... من گێت و هەما وێ ئێڤارێ دەست ب ڤێ گێتنا خوە کر.

## مۆسكڤا

و قوورتينا ماشينێ بوو د ڕاستێد مەزن.
ئەوێ بین هلابوو یا بایێ مۆسكڤایێ،
ئۆ جماعەت پێڕا دل و شا دبوو،
چەعڤنهێریا بازارێ مۆسكڤایێ بوو.

و ئاها ئەو: حەد و سەدا مەزن،
شەوق ژێ دبارە–ژ عەرد و عەزمان،
ئۆ، سەلام مۆسكڤا، تو کوورا ئێگر،
ژ بەرخڤانێ ئەلەگەزێ پریسکەکێ ژی هلبر!

ئەز ژ چیێ تێم، ژ ناڤسەرا ئەلەگەزێ،
ژ وێدەرێ، ژ هەزار–هەزار کەسی،
ب دەڤێ من، ب دلێ منی بەر
شاندنە سەلام–پالە و کۆلخۆزڤان.

هلدە مۆسكڤا، هلدە سەلاما من،
ژ کۆچەرێ بەرێ، کۆلخۆزڤانێ ئیرۆین،
ژ بندەستێ بەرێ، سەربەستێ ئیرۆین،
تو سەلامەکە شەوات، یەکە ب ئاگر!

مۆسكڤا، ناڤێ تە دلێ شکەستی قەنج دکە،
تو زۆری، بەختییار، ستالین ب خوە،
خان و مانێ تەدا ڕوودنی مۆسكڤا.
مۆسكڤا، مۆسكڤا، دلێ سۆڤێتێ مۆسكڤا!

سەلام، سەلام ژ دەنگبێژێ نها،
ژ کال و پیرا، ژنێ زەمین مۆسكڤا،

ژ بووک و زەعفێ تەزە، ژ کەچ و کورێ تفال،
ژ چیایێ ئەلەگەزێ، حەموو ژ تەرا مۆسکڤا!

## د ناڤا ستێرکێ ئەلەگەزێ

تەرجمە

ژ ئا. ئیساهاکیان

ئەلەگەزێ ها ل ناڤا ستێرکا،
دور و جەواهرێ تاجی ل سێری،
ژ چیا بلند، ژ عەورا ژۆرتر،
پالا خوە داییە تەختێ زمرووخت.

پەر و باسکێد سینەمێ ب منرا
فردم، بچمە ئەلەگەزێ،
ئانییا منە ب ستێرکێ گەشن،
دلێ مندا خەونەزێر.

دلێ مندا شابوون هەیە
گول و بلبل، موحبەتی ساز..
زمرۆکا من، ومرە حەمێ،
فردن، بچنە ئەلەگەزێ.

## ئەلەگەزێرا

(ژ ئا. ئیساهاکیان)

ئەلەگەزێ، تو مەرتالا ئالماس
شووڕێ برق و برووسکێ.
سەر سەرێ تە نۆتلا کۆنا
عەورێد گەرۆک ڤەگرتنە.

ل سەر زنارێد تە یە بلند-هێلینا ڕۆیێ،
گۆلێد تە زەلال، هن پیروزە،
جەوکێد تە، چاوا کو کەمبەر؛
کەمبەر ژ کەمبەرا زێر و زیڤ.

کانیێد تە، هەر شەڤ و هەر ڕۆ
ب هەڤڕا کەتنە خەبەرێ.
لێ ئەرقێد تە، ب خوشە-خوش،
چارهلقە دکن هەڤرمش.

پرپرکێد تە ب ئاگر و ئالاڤ
کولیلکێد تە ب بەنگزێ خومش،
د ناڤا خەونێ ژ مێرڤ ترێ
ژ عەردێ هلبوون، سلاڤ دان تە.

تو پادشا ئال، ناخێر، ئال-وەلە،
تو چەعڤکانییا بێهن و بۆخێ،
کولیلکێ تە هەزار ڕەنگی،
هەزار ناڤی، هەزار بێهنی.

## بهارا هێشین

ژ ئا. ئیساهاکیان

گۆندیێ ئارانێ بهارا هێشین،
ب کەری و سووریا چوونە زۆزانا؛
و وانا چیێ، ل ناڤا کەڤرا،
هۆلک چێکرن، هەی کۆن ڤەگرتن.

شڤان و گاڤانا ب هێلە-هێل،
دەوار و پەز دانا پێشییا خوە،

دڤن دوور، بەر ب چیێ خوەشچێرە،
پاشێ، وەختێ دەعنا، ڤەدگەرینن بەر ب مال.

کورکێد بەرخڤان، هۆتاخێد پچووک،
ل سەر جەوکێد گەلینگێ نێزیک،
بەرخ و گۆلکا هەی دچێرینن
و حەتا ئێڤارێ دسترێن، دلیزن.

کەڤانیێد ژێر بەربانگا سبێدا،
چاربەرا داددن، نانێ لۆش لێدخن،
مەشکێ دکلێن، مەشک دچن و تێن،
و ڕوونێ نڤیشکی ب ئادانی هلتێ.

ئێڤارێ، دەرەنگ ژ چاربەر و کوچکا،
دوو نۆلی شەڤێ ب حەمدی خوە دکشە،
مەرڤێ چیێ کەسری نانێ خوە دخون،
و شیرن–شیرن دلێ خوە ڕادزن.

## لەتیفە

ژ سارمێن

ئەز و لەتیفە–قیزەکە کوردا دێمقەمەر:
یەکە ب ناڤ و دەنگ–ب خوە ئینژینێر،
هەسپێد شینبۆز سیار، هەسپێد مەش کحێل،
د ڕیا پێهەڤرازدا – یەکە ب چڤانە،
کو ژ سیا زنارا ئەو هاتبوو گرتن:
ژ چل و چیا، چەما ئەم دەرباز دبوون.
لێ ل پێشیا مە نیڤەکا عەزمانێ هێشین
زەراکە مەزن ل وێ سەکنی بوو،

هیف ته قەی دگۆت گۆهارەکە مەزنە،
کو وێ شەڤا بهارێ شەوق-شەمال ددا
و د بن سمێ هەسپێد مە کحێل-
کەڤرێد هەستە ئاگر هەی ددان.

ئەم داژۆن یالێ ستالیناڤایێ،
مەسکەنێ هەڤالا من، گوندێ وێ بەرێ،
لەتیفە دلبارە و کوبار-کوبار،
ب دل و جەگەر دکە گالە-گال
دسترێ کلامەکە کۆرمانجا تەزە:
یەکە پر مقام، یەکە دلی ب دل،
ئۆ، د وێ کلامێدا هەبوو کەل و بین،
مەرڤێ تەزە، دنیا نوهـ، عەمرێ تەزە، گوندێ نوهـ..
و کاو-کوبارییا چیا و زنار-یێ وەتەنێ مە،
گلیێ سەرهەدێ د وێ کلامێدا بوون.
ئۆ، بلقین وێ کەتبوو کوبرا وێ خوەش بووبوو،
چاوا کو کانیک، نا خێر چەعڤکانیک...
بەدەو بوو ئەو، تە قەی دگۆت هیڤە،
د ناڤا عەزمیندا دچوو، هەی دهات،

و کتێبا عەمرێ خوە ئەوێ ب خوە دخاند،
وەکی د دلێ مندا هاتبوو نڤیسار.
ئەو قسە دکە، چاوا کو شەڤەکێ:
وەختێ فەروارێ دەری دکوتا،
وەختێ چرێ بزر تەمام ڤێسیا بوون،
بەخیرێ هوندوردا دکرە گورە-گور
و ئەوێ ب خوە چەعف نەدانە هەڤدو،
پر فکرییە، پلانەک دانییە

و هەما وەختێ بانگدانا دیکا
ڕکنێ چێکرنا گوند، هێژا دانییە...
و وا، ل کو عەورا دکرنە گۆڤەند،
تەلپێد ڕەشە-تاری بروسکێ ڤەددن،
و بایێ ساری هار گەمە قەتاندی،
ڤی ئالی، وی ئالی دکرە فیکین،
و چەمێ لال مایی خوشینا وان نین بوو،
ژ سەرمێ جەمدی ئەو ژی کەر بووبوون،
لێ نها، ئەو چیایێ وێ دەرێ تەڤ خەملێدا بوون،
ب کولیلکێ ڕەنگاواز ئەوە نەقشی بوون،
و ئاها، ل وێ دەرێ، ڤا یە گوندێ تەزمیی شێن،
مالێد تەزە و چەند قاتانی،
و هەما ئێمانێ تەعڤێ زەرقاند،
ئەز و هەڤالا خوە گهیشتن وی گوندی.

ئاها ئەم سەکنینە سەمتەکە بلنجی،
د حەوشا ئاڤاییکی گەلەکی ڕۆنایی،
ڤێزا ویدا باخێ ڕەنگ-ڕەنگی
و ژ هەر چڤێ وی حەوش لێ خەرقی.
یەک ژ هوندور دەرتێ، نێزیکی مە دڤە؛
دەرسدارێ ئاهل بەشەر لێ خوەش دڤە،
دەستێ من گڤاشت، چاوا ناسێ بەرێ
و گەلە-گەلەکی ب دل و شەوات،

ئەم مژوول دبن ب هەڤڕا یەکجار.
و ل حەوشا فرەدا مە مژوولی دکر،
هەر ئالی بین، بۆخ، ڕەزێ کولیلکا،
و ل وێ دەرێ من نزانبوو چ بگۆتا.

دەما گەرێ زەنگل کرە زنگین،
هلشیان دەرڤا پڕ شاگرتێ ژیر،
ئەز ب خوە ژی ب وانا شا دڤم،
نۆلا کەسکەسۆرێ ب وانا ئەشق دڤم.
حەوش ب زارا هاتە خەملاندنێ:
زارێد سەرەوەخت، ب ئاقل و کەمال،
د دلێ واندا ئاگر و شەوات
چەعڤێ وانا ب چرووس، چاوا یەک شەمدان.

دەقەکە بەتال بادلهەوا ناچە،
ئاها دەست ب مەشق و لیستکا سڤک دڤە:
ئەوە ب تڤاقن، ب یەک ئەبوورن،
چەعڤێد وان شەمدان، دلێد وان ب ئالاڤ.

ئەمە ل وێ دەرێ نە ئالیێ سەرهەدێ،
دبهێم دەرسەکێ ژ لیتێراتوورێ،
دەرسدار فاتێ یە ژنەکە بەژنبلند.
گلیا دڤێژە ژ فیردووسیێ مەزن،
خەبەردان ب خوە ب زمانێ دێ یە،
گلی-گۆتن، کلام ژ «شاهـ-نامێ»،
و چاوا کانیک، کو دەرتێ ژ عەردێ،
خەبەرێ وێ ژی ل دوو هەڤ پێل ددن،
و ناڤێ هاینێ جار-جارا هلددن.
قسا دڤێژە ژ نڤیسارا هۆمێر،
ۆ، چەعڤێد وانا ستەیرکێد نکاندی،
من دکن ڕساس، من ژ ئاقل دڤن.
کی ئالی دنێرم تەمز و لەتیفە،

دەرسخانێدا ڕۆنکاییکە بەعهرە،
و ژ پەنجەراڕا چیایێد مە بلند،
هوندور دنێرن، چاوا کو ئەژدەهـا،
و ژنا کورماناجە چەعقبەلەک کیمیک
ژ جیکی-جیێ دنێ نیشانی مە ددە.
مەرمە دکە، کو ئەم ژ وێدەرێ هەرن،
هەرنە مووزێی، کەلا کەڤنە ژۆرن.
د فێزا مەدا تو عەور تونە نە،
و لەیلان تو قەی دڤێژی ئالاڤێ پێگرتییە-
ئەم ژ حەوشا مەکتەبێ یەکجێرگە دەرتێن،
دچن بەر ب کەلێ، ئالیێ مووزێیا گوند.

مووزێیا گوند تەمام کۆچک-سەراکە،
د بژانگێ گرمکیدا ئەو چێکرنە.
ئەز و هەڤالێد خوە پێهەڤراز دچن:
جارنا کەرۆ-کەر، جارنا ب کەن
سەرێ ڤان چیا ئەسل بهارە،
ل وێ گول و چیچەک تە دکۆ خەملانە.
و پریسکێ لەیلانێ بێ ئالاڤ دچرووسن،
لەیلانێ ڕووێ عەردێ تەمام گرتییە،
و مێرڤ ترێ تەڤ ژی ب دلەکی سۆتە،
ئەینی نۆلی هەسن، وەختێ دحەلە،
و مەرڤ دکۆ ژ وی ڕەنگێ هێشینە،
وەکی تیرێنژا ڕۆیێ گورز-گورز دبارە.

ب ئەشق و دل ئەو منڕا دڤێژە
دەرەقا دلکەتنا سیابەندێ سلیڤی،

کو خەجا بەدەو چاوا حزکرییە،
ئاخریێ ب شەر ئەوی ژ ئێلێ برییە،
پێشیا مالدارا تەنێ شەرکرییە،
ئەو لاوکێ کەسیب، ئەو زلامێ کۆچەر

گەلەک میر، بەگ و ئاخاێد ئێلێ
ب تیرا مێشندار جەحنمە کرییە.
ئۆ چوویە سەرێ سیپانێ خەلاتێ
بوویە هەڤال هۆگرێ بزنێد د کووڤی،
ئەو خۆرتێ چێ، ئەو مێرخاسێ باڤچێ.

ئۆ، گلی دکە دەراقا سەرهاتیکێ:
شەرێ بندەست پێشبەری مالدار،
ب شەوات دڤێژە، دوجار ژی دکە.
هەر، هەر خەبەرمک ژ کەڤچکا دلە،
ئوسا یەکۆ-یەکۆ دوو هەڤ رۆ دکە،
و هەر خەبەرمکە وێ دلێ من دسووت،
لێ من دیسا دخاست گۆهداری وێ بکم.
کاڤا ئەم چوون هوندورێ مووزێ،
ل وێ دەرێ مەلوول، گەلەکی پەریشان،
سەراکە تەزە پێشیا مە ڤەبوو،
و هەما ل وێ بەر مە دیهار بوون
گەلەک شخولێد دەورانێد بەرێ.

ئاها عەرمبا کەڤنک، جۆتێ بێراتب،
چرا بزر، چەعقێد ب هێسر
و نیرێ گران، ل ستووێ گایێ ژار:
یەکۆ-یەکۆ تێنە پێشییا من،

لێ چەعڤێ من شکلەکی دنێ دڤینن،
ئیدا نالڤم، د جیدا مخ دڤم.
شڤانەکی کورمانج داری د دێستدا،
ئاها سەکنی بوو ل ئۆرتا دو ڕییا،
کنجێد وی جەلەب-جەلەبی بوون،
کۆلۆز ل سێری نۆلا قووچا بەرفێ،
و جی ب جی دەست ب گۆتنا دکە:
یەک شڤانێ زەماندە، یێ دنێ ئەز ب خوە.

ناڤا گونددا دچم و تێم،
چوویێن و هاتنێ ئەز مێزە دکم:
ئێدی کەس لێناخە ب فیقێ قامیش،
کەس ناسترێ دها «دلۆ وەی دلۆ»
ئۆ، ڤێ بهارێ، نە شەبەقا سڤێ،
دسترێن ژ دانگبێژێ کورمانجایی خەباتکار:
کلامێ ب شەوات، یێ ب عەگیتی.
د ناڤا کەنێ وانا کال-رەقاس هەیە:
تەقلایا سەوتا، کوبرا خوەش دەنگا،
ب دەنگێ خوە زیز خەباتێ دسترێن،
یێ ئوسا دەلال، یێ ئوسا ب شەوات.

کورمانجێ کۆمموونار ب زمانە دێ،
گەلەکی ب حەواس هۆمەرۆس- دسترێن،
و کەچکێد پر دەلالە سەربەست
د ناڤا خەڤاتێدا دها جەبری،
منرا دڤێژن دەرهەقا دنییایێ،
پرسێد بەرێ و یە نها، یێ تێ،
کا، کانێن گلێید گوهدیێ مە بەرێ؟

بووکێد لال و بێ بێزار و زمان،
چاوا کو ڕۆکە ب عەور و عەزمان،
ئەو ئیدی ناخەوێنن، تونەنە ئیدی،
ئەو ڕۆژێد زەلوول-ڕێوێد مەلوول،
دها توجارا ڤەناگەڕن ئیدا.
کا، کانێن شڤان، کەسیب و کۆچ؟
کانێن کۆنێد عەشیرێد کورمانجا؟
گەلۆ هلاتنە، گەلۆ تونەنە؟
کا، کانێن ژنێد نەزانە بندەست؟
یێ نەخاندی، لالمایی، بێخەبەر...
چاوا زڤستانا چیایێ مە بلند
ئەو ژی چوونە، دها ڤەناگەڕن.

کا ئەو کین و دژمنیا قەبیلێد وانا؟
شەڕێ وانا، یێ ب خوونا مێرا؟
بستڕێ لەتیفە، بستڕێ ب دەنگێ زیز
نە من گۆ: ڕۆژا خومش سبەدا خومشە.

## ئەمینێ ئەڤدال

### زەڤیا کۆلخۆزێدا

هاڤینە، ڕۆژ دقژلینە،
عەزمان ژۆرێ شین دخوێنە،
ڕۆژ پشتا مەریا دشەوتینە،
مەرڤ دخەبتن کەلۆ-بینە.
کۆلخۆزڤانا ب جێرگێ پر،
ب دلێ هەڤرا خەڤاتا گۆر،
ب کۆمباینێ، ب کێلەندیێ،
ئەو بەرهەڤ دکن ڕوویێ زەڤیێ.
لێ ڕۆ دشەوتینە ژۆردا،
خەڤاتکار ڕۆیێ ئندا ناکن،
نان دکشینن ژ ناڤ زەڤیا،
هنەک ژی ب ئەشق ساپ بار دکن.
سڤێدا، حەتا ئێڤارێ،
دخەڤتن ب ئەشق و دل،
بۆ هەبوونا کۆلخۆزا مە،
بۆ وەلێت، بە ئۆردیا مە.

١٩٤٦

## بهارا خوەش

چقاس خوەشن،
ڕۆژێد مه هان،
ئەم گولەشن:
ب ڕوهـ و جان.

بهارا ئیرۆ
ڕۆ دکەنه
وێ شەوق ڤەدایه،
مینا هەر ڕۆ.

کولیلک ڤەدانه،
دارێ ڕەنگ-ڕەنگی،
وان پەر ڤەدانه،
حەواسن ئەم بەنگی.

بنێرن هەلا هوون،
گول ژی دها ڤەبوونه،
پەلگێد وان مینا خوون،
هەر جیا خەباته، شابوونه

خەڤاتا هەڤڕا؛ ئەم دلبار ن،
ئەم ب هەڤڕا خەڤاتکار ن،
بینا بهارێ چقاس خوەشه،
مینا بهارێ ڕۆژێ مه گولەشن.

١٩٤٧

## فرندەچییێ عەگیترا

فرندەچییێ عەگیت، هوون بفرن،
سەر وەلاتێ مەی پر مەزن،
دها زێدە قەواتا خوە نیشاندن،
هوون زۆر ببن، دها قەوین بن.
برا ئەو مەرڤ ژ مرنێ بترسە
یێ ترسۆنەکە، هناڤێ وی زراڤ؛
رۆژێد ئۆغرمێد گران ئەو،
پاشدا تێ گاڤ پەی گاڤ.
دە ب فرن هوون ئازا،
سەر چیاڕا و بانیا،
ژ کانییێ مە، ژ زەڤیا؛
سەلاما وانا ژ وەڕا.
ب فرن، فرندەچییێ سۆڤێتێ،
دلێ وەدا عەمر ژیین هەیە،
ژ فرینا وە فرێقەت، ژۆرێ،
هەمین تمێ دلێ مە شا یە.
ب عەمرێ مە هوون شانە،
حوبا وەلاتێ مە با وە یە؛
لەما جەم وە خۆف تونە ،
ئەو ئەڤینا وەلات دایە.
لەما ژی ل هەر جیا،
وەلاتێ مە گشکیدا،
پەیێ وە ددن، دخازن،
تمێ هوون ساخ و سلامەت بن
لەما ژی ئەم دبێن

ژ جماعەتا مە دیتی،
ژ چیایێ مە، ژ چەما،
وەرا سەلاما ئالاڤی.

١٩٤٧

## لوری

ڕازێ لاوٚ، دەلالێ من،
ڕازێ، هشیار نەمینە،
بنێر باڤێ تەی ئامن،
کەتییە بەرا دەفینە!

باڤێ تە بوو بەریێ سوٚر،
سەر ئاڤێیە تمێ دوٚر،
ڕازێ لاوٚ، دەلالێ من،
تەیرێ بێ خەم، سەروٚ-بن!

بەرێ مەزتر، بەرا وا،
هەر وەلاتێ مەیە ئازا،
ئوٚکتیابرێ ئەو دا ڕەوا،
ڕازێ لاوٚ، حوبا دلا!

بەرێ هوکم، یێ دەولەتیا بوو،
ب خوونێ وەلات مە دەست ئانی،
نها مەڕا، هەر مەڕا نە،
ڕازێ لاوٚ، هەر مەڕا نە!

## ئه م

ئەم دنێدا هێسیر و قوول بوون
ڕۆژێد مە ب شین و گری بوون
لنگێ مە بووبوون قەید و چیدار
زەعمەتێ مە پر، دلی خەدار.

هات ئۆکتیابر، ئازای ئانی،
ملەتارا ئازای ئانی،
ئوسا ژی بۆ مە
ئەم کشک قال بوون.

ئەم ژ قەید و چیدارا ئازا بوون،
مە ڕوویێ ڕۆیێ دیت، ب ئەشق و شای،
ئاغا و کەدخور ژ ئۆرتێ ڕەت بوون،
ژ ئۆرتێ هلات برچیبوون، خەلای.

ب داینا لێنین-ستالین،
ئەم پێشدا دچن تەمامی.
زار و مەزن بوون هەمین
ئەو دخوونن ب ڕوهـ و جان.

## بهار

چ ڕۆژنە گەرم و تەعڤن،
بەرف و بووز هەڤرا دحەلن،
خولە-خولا ئاڤێ بەلەکیا،
دچن بەرب چەم و کانیا.

گوندی پێز-دێوێر دەردخن،
دڤن دەلاڤا ئاف ددن،

حەیان درەڤن، بانز ددن،
هەڤ بین دکن، شا دبن.

کۆلخۆزڤان هەڤرا کەتنە قالێ،
بۆ ڕاکرنا ئەکنێ سالێ،
وەکی تەمز نان باڤێژن،
بۆ پر کارێ ژێ هلینن.

١٩٤٦

## پیۆنێران

تمێ جێرگە دچە پێشدا،
هەرکاڤ خوەشە بەنگزێ وانا.
یەک، دو، یەک؛

بەیراقێ وانا دململن،
دەفێ وانا ڕنگەرنگن،
یەک، دو، یەک.

ئەو جاهلێ مەیە ژیرن،
ئەولەدێ مە پر تڤدیرن،
یەک، دو، یەک.

وەلاتحزن پیۆنێران،
دلێ مە دکن ئەشق و شا،
یەک، دو، یەک.

ب دل و جەگەر ئەوان یەکن،
ئەوانا ب هەڤ گ شیرنن.
یەک، دو، یەک

١٩٤٦

## لورِئى

لووری، لووری، لووری جان،
لەوزێ تەی تلتلان،
لوورکە، بەنگزخوەش ببە،
کولا پێچەکێ ژ بیرکە.

تو زووکە، مەزن ببە،
تو دەلالێ دلێ مە،
بکەن، بکەن، بکەن
تو رِۆنایا چەعڤێ مە.

لووری، لووری، لووری جان
لەوزێ تەی تلتلان،
لوورکە، بەنگزخوەش ببە،
کولا پێچەکێ ژ بیرکە.

## هەجهەجک

دایێ، تو بنێر هەجهەجکێ،
دانینا زلێ هێلینا وێ،
ئەشقا مەریا پێرا تێ.

وەختا دڤە بهار،
ئەو بیر ناکە توچار،
دیسا مە دڤە دیار.

چقا رِندن، بەلەکن،
نکولێ وانا خەلەقن،
لێ هەر پشیک پێ ناکن،

لاڤ:

گەرمک مەرڤ وانا خوەی کن،

ئەو ڕەورێ سملێ نان دخون،

هەجهەجک وانا دگرن، قردکن.

## پیۆنێر

ئەو ل زەڤیا کۆلخۆزێ نە،

دخەبتن، زبارە نە،

چەگیل دکن، کەڤرا تینن،

کەنار دکن، ژ زەڤیێ شینن

جیکی دنێ ئەو قووچ دکن،

هنەک کۆکا دادوەشینن،

مینا مووریا دلەزینن،

پێرا دسترێن، دلیلینن.

مەمێ سەرکار کرە گازی،

هەلا بنێرن هوون هەرڤازی،

کشکا ب هەڤرا پشت ڕاست کرن،

ب دێمێ کەن گوهـ لێ کرن.

گەلی زارا، مە کوتا کر،

کارمکە ڕند مە عەیان کر،

کارا زەڤیێ بۆ گشکانە،

بۆنا پالا و خەڤاتچیانە.

## لاوکێ دەلال

خازل ب تە، لاوکێ دەلال،
موحبا تە پر، فکرە زەلال،
کێفا تە جییە، دەنگێ تەی زیز،
کورێ تەمز، شیرنێ عەزیز،

تە نەدیتییە ڕۆژێد مەلوول،
تو نەبووی دز، تو نەبووی قوول
سەلام ڤێ ڕیا تە تەزەڕا،
شابوون گۆتی عەمرێ تەڕا.

## ناڤ ئا گڕدا

شەر سەکنی، هەر تشت کەر بوو،
هۆلکێدا خەبەر ددان زوو،
گلیێ زوودا بیر تینە هوور:
شەکرۆ دفکرە کوور و دوور.

ڕۆ هێدی-هێدی دچوو ئاڤا،
سەر دارێ مێشێ چامێڕا
شەکرۆ عەمرەک ستەند دزیکا ڤا،
بۆ هلانینا دژمنا.

خەولە گەرەک ئەو ڕێکەڤن،
گەرەک شتابا دژمن بێ دیتن،
دەقەکێدا ئەوێ ئۆرتێ هلدن،
ب دلەکی شا زوو ڤەگەرن،

چوو!... شەڤەکە ترسە خۆف بۆو،

چوو و ب ناف و نامووس ڤەگەریا،
لێ وێ گاڤێ دیسا ئەو تی بوو،
بۆ ڤەخارنا خوونا دژمنا

شەڤە، شەڤەرەشەکە کەرە،
هۆلکێدا ئاگر ڤێدکەڤە،
شەکرۆ دفکرە کوور و دوور،
گلیێ زوودا بیر تینە هوور.

١٩٤٤

## گەمیێ مە

گەمیێ مە قەوینن، زۆرن،
ئاڤێد مە شین دقەلێشن،
حەزار–حەزاری دچن و تێن،
گەمیێ مە قەوینن، گەمی زۆرن،

دژمن نکارن مە ئالت کن،
گەمیێ مە قەوینن، گەمیچی زۆرن،
گەمیچی ب هازریا خوە با تەمام،
بۆ وەلاتێ خوە هازرن ب رِوە–جان

گەمیێ مە قەوینن، زۆرن،
ئاڤێد مە شین دقەلێشن،
کەڤی–کەڤی دگەرن گەمیێ مە
گەمی قەوینن، زۆرن گەمیێ مە.

١٩٤٦

## بۆ ناموسیێ، بۆ وەتەن

ل دەشتا شێر عەگیت کەت،
خوون ل عەردێ بوو مینا خەت،
ئەوی، وەکی عەمرێ خوە دا:
«ئاخ» نەکربوو کولا دلا.

ئەو کێ دەرێ یە، لێ کێ ئالتکر
دفکری عەگیت خوەدا
لێ خووشکێ نێزیکی پێرا کر،
کەنەکی باش هاتە لێڤا.

لێ ئەو نەما، دێمە گولەش،
عەگیتێ مەی دێمێ وی خوەش
تەڤا رۆژێ ژی پێدا-پێدا
سینگێ مری رادمووسا.

گول-گولی بوون سوورتێ وی،
ئەو بەدەو بوو مینا چرا،
خەبەرا خوە پاشن ژی
وی نکاربوو قە بگۆتا،

هەڤالێ وی شێر گۆتن ژێرا
مە ئالت کر، تورازێ خوەرا،
وەکی ل دەشتا فرە، تو
تو جارا نەمینی دو دلە.

دیسا دوور کەتن ئەوانا،
دلێ واندا خەمەک ما،

دیسا دەنگێ سیلھا ھات،

بۆ ناموسێ، بۆ وەلات.

١٩٤١

## بەکۆ

### (پۆئێم)

برا ل وان بە خازلا من

یێ ک فێرزن عەگیت-زۆرن.

ئەگەر وانا خوون ژی رێتن،

لێ ئالت کرن، وەلات پێتن.

خازلا من بەکۆیێ عەفاترا،

ب سیاری ئەو پێشدا چوو، وەکی،

ناڤێ عەگیتیێ قازنج کر خوەرا:

بۆ دژمنا ئەوی مرن ئانی.

بۆ دژمنا ئەوی مرن ئانی،

بۆ -ماینا وەتەنێ شیرنە،

ئەڤین ژی ژ وی خوەشتر نینە:

چاوا حزکرن ئەو ھەر دمینە،

بەکۆ بن عەسمانێ وەلاتێ خوەدا،

چەعڤ ڤەکرن و زوو مەزن بوو،

بینا کولیلکا ئەوی ھلدا،

زمانێ دێ ئەڤینیا وی بوو.

ئەوی ک سەرێ خوە دانانی،

شوورێ ئالتکرنێ پاشدا ئانی .

ئەوی دژمن رند پەرتاند،

ناڤەکی تەزە وی ئەفراند.

چاوا چەماف وا پێل ددە ڕوهــێ من،
ئەوانا تەڤهەڤ دبن سەرۆبن.
دکم دەڤێ چێمڕا فیر بدم،
بۆ مەرخاسیا تە ئەز خەبەردم.

بۆ عەفاتی، عەمرێ تە ئۆکیان،
ئەز وا بێژم زمعف چەتنا پەیا دان،
بۆ دمرهەق تە باتا گۆتن چاوا شێر،
سەڤا وێ یەکێ گەرمک هەبیا هەر هۆمێر.

١

بەکۆی دەلال بەژنە زراف بوو،
ب کەمال بوو، هم خوون شیرن.
دلێ وی ئالی خەڤاتچیا بوو،
دۆر–بەرێ وی ژێ حزدکرن.

بەکۆ دچوو مەکتەبێ.
ئەو ڕانەدزا ڕۆژ و شەڤێ.
کتێب ویڕا هەڤال بوون،
خێر و شەر پێ عەیان بوون.

وەلات ددیت وی بەر چەعڤا،
فکرا خومدا ئەو دگەریا؛
کەلۆشکاڕا، چیا و بانیا:
مەرف دگۆت دفریا.

دفریا، دچوو ئێرێڤانێ
ژ ئێرێڤانێ مۆسکڤایێ:

باجارێ مەی لاپی ڕند؛
ب ڕۆنای، ئاڤایە بلند.

ئەوی وێدەرێ لێنێن ددیت،
چاوا مری: کو بەیتێدا،
باڤێ مە ستالین ئەوی ددیت،
وەکی پێڕا خەڤەر ددا.

ڕند هین ببە، ئەوی دگۆ،
کۆمسۆمۆلێ باش، بەکۆ، لاۆ.
ئاقل بە، خەڤاتێ حزکە،
ئەز ڕازی بم وەکی ژ تە.

بەکۆ دیسا ئەشق شا دبوو،
دچوو کلووبێ هەڤالاڕا،
خەلق ژ وییا هیندبوو،
ئەو بەنگزخوەش بوو، دکەنیا.

بهارێ گوندی خوەش بوو،
حەزار جوورە کولیلک ڤەبوون،
ویلینا ئاڤێد کانیا،
زوو پێل ددان بەر ب چەما.

کۆلخۆزنیک دچوونە دەشتێ
بۆ خەڤاتا خوە جماعەتێ:
خەڤاتچی ب هەڤڕا دلبار،
دخەفتین ئەوان بێ قار.

مینا عەیدێ ل هەر جیا،
ل سەرێ چیا، ل دەشتا،

سووری دچوو زۆزانا
ناڤا کولیلکا، رِهانا.

ڤیز ژی ب دێمێ گولەش،
چووبوون دەشتێ، خەڤاتێ
هنەک وانا ژ ئەڤینیێ سەرخوەش،
دووربا حەواس خۆرتا دنهێرین.

***

ئێڤارەکێ ژی ژ کلووبێ،
بەکۆ هێدی هات مالێ،
دێ، باڤێرِا خەڤەر نەدا،
کوور کەتبوو خیالێ.

شێکرۆ گۆ، چرا ئوستێنی بەکۆ؟
دو رِۆژە، وا دفکری شەڤ و رِۆ
دڤە تو نەخوەشی، وا نەشای؟
تو خەڤەر نادی، فکرێدا بەلای.

وێ دەرێ بەکۆی کەر بوو،
جاهلێ مەیی دلسار بوو؛
مەرڤ دگۆت فکرێدا،
ئەو تشتەکی دگەریا.

ل وێ دێرێ دگەریا،
ل وێ دەرێ دگەریا،
ل کێلەکا جەوێ،
ل سینگێ چیێ.

شەما دێ رِابوو، جی دانی،

کور ب وانڕا هەڤەکی کەنی،
پاشێ ڕابوو کەت ناڤ جیا:
ناڤ متالا، خیالا.

بەکۆ ناڤا جیێ خوەدا،
ڕێ ددیتن، دپیڤا
خەو نەدهاتێ،وەلدگەریا،
هەی دکەنیا، دگۆت خوەڕا:

ڕاستە، ئەم دخەڤتن،
خەڤات ڕندە، کار ژێ تێ.
لێ ئاخ، دەردێ حزکرنێ،
ئەڤین قە نایێ بیرکرنێ!

بەکۆ سەری کر ناڤ بەعلگی،
کر کڕازێ ئەو پاکی،
لێ متالێ خراب وێ گاڤێ؛
دگەریان چاوا ڕەشێ شەڤێ.

بەکۆ ئوسا متالادا؛
خەوەک هاتێ، خوەش-خوەش ڕازا.
ئەوی حزکریا خوە سەیران دی:
بەدەوەکە جەم چێم ڕوونشتی.

ئەو قیزا بەکۆ پێ دفکری،
قیزا دەلال، شاگرتا بکوری؛
دلکەتیا بەکۆ، کەوا حزکری؛
ئەو سەیران بوو، کەڤۆتکەکە پێجری.

وەختا نێزیک بوو، بۆ پێڕا خەڤەردە،

ژنرا بێژه، یا دلێ خوه: دەردە؛
لێ نشکێڤا بوو بلبلەکی،
و فری چوو باشقە-جیکی.

بەکۆییێ دلەکەتی خەوێدا دلخۆر بوو،
ئەو گەریا، بەرب هەر ئالیا چوو.
ئەوی سەیرانا خوە دەلال قە نەدی
بۆ جەم حزکرییێ دل ڤەکرا وی.

شەڤا درێژ ئانجاخ کوتا بوو،
ستەیرکێد زیڤین هەوا ڕازان،
هیڤا گولۆڤەر ژی ئوندا بوو،
هێدیکا قولبی ناڤ عەزمان.

***

بهار بوو، ڕۆژ گەرم دبوون،
کولیلک و گیا شین بووبوون:
دکشیان ئاڤێد چەعڤکانیا،
دحەلیان بەرفێد بەلەکیا.

تەبیێتە خوەش بوو، دکەنیا،
مەرڤ ژی ناڤدا کێف ددا،
زارۆ ژ سەرمێ ئازا بوون
ئەو دگەریان، شا دبوون.

لێ گوند هشیار بوو دیسا،
دیسا ڕۆژێ تیرنج ڤەدا،
سەر دەرمختا، سەرێ چیا،
ئاڤیت سەر پشتا بەرخا-میا.

بەکۆ چوو فێزا گوندە،
پەی ڕێچا کەڤۆتکا خوە،
وەکی ژ تو کەسەکی نەخەیدە،
وێیا ببینە، پێرا خەڤەردە.

لێ سەیرۆ تونە بوو،
تو دبێ ئندا بوو؛
دفکری ئەو گەلۆ،
دەرهەقا شکۆ؟

بەکۆ، سەیرۆ ناڤ گونددا هەڤ دین،
دل و جەگەر ژ ئەڤینێ پەرتین،
شیرن–شیرن ب هەڤرا خەڤەردان،
دەستێ هەڤ گرتن و مزدان.

ئەوی عەدەتێ بەرێ بیر کر:
باڤێ قیزێی نەپاک ژی ئوسا؛
دلێ خوە پێشیا وێ زوو ڤەکر
گۆ. تە حز دکم مینا دینا.

ڕەنگ و ڕوویێ سەیرانێ ڤەبوو،
نەلپتی، جیادا نەچوو؛
شەرم کر ئەوێ، ڕوونشت–ڕەهەت،
ئاگر و ئالاڤ دلێ وێ کەت.

بەکۆیێ دەلال حزنەکە، چاوا،
وی عەگیتێ جاهلی گوندا؟
لێ برا وی گلی کەس سە نەکە:
سورێ با شکۆ ئاشکەرەکە.

ب خاترێ ته، هەڤرا گۆتن،
دلێ واندا ئەڤینا شیرن،
وێ دەرێ کەڤرەک، چەعفنەبار بوو،
هەر وانرا تەک شهاد بوو.

٢

ئێڤارەکێ بەکۆ چوو مالێ
کاخەزەک دێستدا، ب ئەشق بوو.
دێ ژێرا گۆ:
چییە بانز ددی مینا چڤیکا،
مینا منمنیکا سەر کولیلکا.

دایێ جان، دایێ، دچم ئەسکەریێ،
کنجێ ئەسکەر خوە کم ل وێ دەرێ،
ببینم باژار، گوندێ تەزە،
ستویێ خوەدا کم شووریێ ئەسکەرێ مە.

دێ هەڤەکی بەر خوە کەت ئوسا،
چاوا ژ بەکۆ بقەتە ئەوا؟
ب دلێ خوە-نازک-نەرمینە،
ڕۆژێ جارەکێ ئەوی نەبینە؟

ئەوی لێ نهێری ئەو تەنێ نینە،
هەڤالێ بەکۆ هەنە: قاسی وینە،
هەر جاهلەک وێ بۆرج بقەدینە،
بۆ سۆڤێتێ شخولەکن دەست بینە.
پاشێ ڕابوو تۆریە ڕند گرێدا،
سەڤا ڕێڤا بەکۆ برچی نەمینە،

سەرێ خوە دانی بەر خوەلی-کەڤرا
بۆنا بێ قەدا مرازێ خوە ببینە.

بەکۆ سەیرێ دیت، ب خوون و قنێت،
ژ لێڤێ زراڤ هنگڤ مێت؛
کێلەکێ سەکنی مینا چیاکی،
گۆ، ئەزێ بێم، گەرەک سەبرکی

سڤێ زوو، بۆنا لاوکێ ئەسکەرییێ،
تەختێ کێفێ رند هازر کرن،
ب دەف و زورنە، بۆ رێبارییێ،
حەتا چیایێ نێزیکی گوند برن.

***

بەکۆ هلانین مەکتەبا ئەسکەرییێ،
ئەو کورەکی ئاقلی سەرومخت چاوا،
وەکی هینبە شخولێ ئەسکێرییێ،
پەیێ وی بێ داین، مینا مێرخاسا.

ئەوی حز دکر ژ شوور-لیستکێ،
وەختا بەزێ سیار دبوو هەسپێ:
هەر دچوو، دیسا پەیا دبوو،
چیا-بانیارا، ئەو گەلیارا دچوو.

وەختا کێفێ، شایا و عەیدا،
بەکۆ هەڤالارا دسترا،
مەرڤ دگۆت سەیرێ دبینە
چیا و بانیێ وەلێت بیر تینە.

کۆسڤین ب ئەشقا دلارا دگۆ،

جاسمۆ بێژە ، ئێتۆ خۆرۆشۆ؛
یێ دن ژی ب هەڤرا کرن قیرین،
بەلێ، بەلێ جاسمۆ، بلیلین.
چڤا دچوو، بەکۆ شا دبوو،
دلێ وی، ب وەلێتی بار بوو،
پێرا هەڤالێ عەگیت هەبوون،
لێ عەزمان ژی تژی ستەیرک بوون.

و بەکۆ بوو قۆماندار،
ستایرکا سۆرە سەری سەرکار،
بۆ خوەلیا مە وەتەنی؛
وێ ب ئەشق بچوویا، شەر بکرا.

مالێ بیرێدا، تەمام دو سال،
بەکۆ، ب تڤدیر، ڤێگەریا مال،
گوندی-جینار دۆرێ تۆپ بوون،
سەر ئەشق کرن، پێرا شا بوون.

دەلۆ هات: باڤێ سەیرۆ ژی،
ئەوی سەلامەک وانا ڤەدا ،
سەلام ڤەگرتن وانا ژی،
بۆنا بەکۆ چەعڤرۆنایەک ڕنددا .

بنێر، کورەکی ئاقلی چاوانە، هەش
گوهێ دەلۆدا حەسۆ کرە پسە-پس:
وەکی قیزا من قاسی سەیرۆ بیا،
منێ پێشکێشی جانێ وی کرا .

ڕەنگێ دەلۆ دەست-دەست خەیدی،

ئەو چ پرسە، ب هێرس گۆ ئەوی

ئەو ڕێکە دنێ دچە، زانی،

ڤیزێ چاوا بدم وی کوری؟

ژ جی رابوو، چەعڤێ ل دێری،

خاترێ خوێ خوەست و تەنێ چوو،

شکەکە گران کەت دلێ وی،

لێ کەنەکی دوروتییێ هاتە ڕوو.

ئەوی دلێ خوەدا دگۆت و دچوو،

شکۆیێ ببە زەعڤێ من، شکۆ:

ئەڤە فکرا من، کوتا بوو چوو،

برا هەرە بەر دەرێ خەلقێ بەکۆ.

لێ تا-تێومکێ سەیرانێ گرتبوو،

ئالیکی ڤا ئەو یەک ئەوێ دخاست.

دل دکوتا، چەعف هەر ئالی ڤوو،

بەکۆیێ شیرن بوو، هەر وێ خوەش هات.

هەر بەکۆ بوو، دها خێنژ وی،

کەس تونە بوو، مینا وی لێتیفی:

بۆ ویڕا، سەری دانیا سەر بەعلگی،

و پێڕا بخەڤتیا پاکی.

و ئێڤارەکێ، گەلیێ نێزیکدا،

وانا هەڤدو ب کەل حەمێز کرن،

بێ خەو ڕوونشتن، خەڤەردان هەڤڕا،

ستەیرکا ل عەزمان مێزە دکرن.

باڤێ من برا زوو-زوو بخەیدە،

و ب عەدەت بێشیککەرتمە بکە،

سەیران زانە، وێ ب دلێ خوە بکە،

عەدەت مر، دها ئەو حوکوم ناکە.

ئاخر نە ئەز کۆمسۆمۆلم،

سەر مەرەمێ لێنین ستالینم،

هەر مرن دکارە ب خاینی

نەهێلە بژین ئەم ئەڤینی.

بەکۆ ب ئەشق گوهداری کر،

چەعڤێ وی سۆرۆ-مۆرۆ بوون،

دنیایێ وی ئوسا مەرەم کر،

مەرڤ دگۆت ئەو ژی شا بوو.

سڤەترێ ئەلامەتی دان،

وا بوو دەنگی و خەڤەردان،

وەکی شەرە ناڤ مە و ڤینا،

ئەم هازر بن پێشیا وانا.

ئەڤا یەکا بەکۆ ژی بهیست،

چەعڤ لێ سۆر بوون، تامارا لیست،

گۆ، خرابی مە وان نەکرییە،

لێ هنەکا ڤینا هەرمم کرییە.

ژ بۆ وەلێت ئەو دشەوتی،

دل-هناڤ با ئەو دپەرتی،

گۆ، عەیبا گران ل من،

ئەگەر ئەز نەینم کۆکا دژمن.

برا شوور جیێ خوەدا زەنگ نەکرە،

ب نامووسی ئەم ڤەگەرنە مال؛
بەکۆ ئەسکەر هلانی: خوون گەرمە،
کەتە کوورانا شوور و هەرمە.

تۆپ-تفنگێ مە کرنە گمین،
تەبیێد دژمن ئاڤیتن عەزمین،
تانکا عەردێ واندا خوەلی قەلاشتن،
ئەسکەرێ مە پێشدا دچوو بەرۆ-پشتن.

تانکا عەرد و دەرەخت وەلگەراندن،
عەگیتێ مە گومرە ئاگر درەشاندن؛
گۆل، چیا و بانی، مێشە پارا مان،
چوون مێومکی دن، بەیراقا سۆر هلدان.

مەیتێ دژمن مانە عەردێ،
سەر وانڕا دهات هولما سەرمێ،

شەڤ سەردا هات، عەزمان بوو تاس؛
عەرد جەمدی، پێڤا بوو ڕساس.

نشکێڤا دژمن دۆر وانا گرتن،
نزام ژ کو هاتن، خوە ڕاگرتن،
ب تەمامیا خوە وانا دخاستن؛
ئەسکەرێ بەکۆ زوو تەسلیم بن.

بەکۆ هێرس بوو، و پاشێ گۆ، نا،
گەرەک ئەم شەر کن، ئەوی عەمر دا؛
دیسا دەنگێ پلیمۆتا هات،
گولە ئاگر بوون، دژمن بوو بەربات.

بوو شەرمکی وای زەعفی گران،
برینداارا دگۆتن واخ دایێ جان!
سێ کورێ قۆچاخ ژ مە هاتن کوشتن،
لێ مەیتە دژمن مە گەلە هشتن.

بەکۆ ژ ملێ خوە بریندار بوو،
ئەوی ملێ خوە گرێدا، دلدا بەر خوە،
ئەو ئالیێ دندا دوور کەت، زوو چوو
ب ئەسکەربا، بەرب مفرقێ قل بوو.

سور و سەرما بوو، بێ دکر گورین،
با پەی هەڤ دهات و بینا ساردا،
مینا هرچێ دکرە هولین؛
بەرف درەشاند سەر جقلێ دارا.

بەکۆئێ عەگیت پێشدا دچوو،
بۆ ئەسکەرێ مە ببینە زوو،
مەرڤ دگۆت ئەو قەرمتاژدینە،
عەفاتێ دلساخ شەردا قەوینە.
رێ ژ بەکۆرا ڤەبوو،
بەکۆ بەر ب گۆلەکێ چوو،
ئەو کەت گۆلێ نقۆ بوو،
کەتە ئاڤێ منا بوو.

بن بووزێرا ئەو دچوو،
دەردێ بینێ خوە دپوو
قاتێد بووزێ زراڤ بوون،
بینا بەکۆ چکیا بوو

ئەو ئێپێجە کەڤیێ دوور کات،
پاشێ ژ ئاڤێ ئەو دەرکەت،
میکایێل، شاهێن خوە گهیاندنێ،
پێرا کەنیان، دان کێلماندنێ

هۆلکەکێدا ئاگر دادان،
بەکۆ وا ڕند گەرم کرن،
ئایرۆپلانێ مە بانزدان:
حۆجوومی سەر دژمن کرن.

لەزمکی دن شووندا بوو هەوار،
ئەسکەرێ سۆر ژی هاتە خار،
بوو ڕنگینا تۆپا، بۆمبا،
ئوسا ژی دەنگێ مینیمێئۆتا.

چڤا چوو، شەر گران بوو،
ئەسکەرێ مە ئالت دکر زوو،
ژ وێ ڕیا مانەرهەیمێ؛
پەرچێ هەسن مان وێ دەمێ.

***

ب ئەشق ڤەگەریا مالێ بەکۆ،
وی سەیران دیت، حزکریا خوە،
دەرهەقا شەرێ دیتی گشکاڕا گۆ.
کولیلکا بین خوەشرا، بەیبوونا خوە.

٣

هەلا گەلەک وەعدە دڕباز نە بووبوو،
ژ ڕۆئاڤایێ عەورەکی ڕەش ڤردا قل بوو

ئەو فاشیستێ گێرمانیا بوون:
و پەر ڤەدا تەمام ڤەبوو.

چوو ناڤ خوەلی، وەلاتێ چێخا،
چاوا مار، کشیا و هەی کشیا؛
ئەو کەتە بێلگیا، کەتە فرانسیا،
گەلەکی چوو، گهیشت نۆرڤێگیا.

خوونا مەریا بوو چەم و کشیا،
ئاگر باری سەر، مەریادا،
ژ ئێڤاردا، حەتا تەعڤێدا:
هەزار و یەک تۆپ هەڤڕا تەقیان

دژمنێ نەتێر، نەیارێ مە،
دزیکاڤا کەت ناڤا خوەلیا مە،
لاپ لێ پۆشمان بوو، ئەو گلیێدا مە،
تەمامیا دنێ شاش و مەت ما.

فاشیستا ب نەپاکی، بێئار،
بۆمب ئاڤیتن سەر وەلاتێ مە،
وانا هلشاندن گوند و باجار،
ئاگر ڕەشاندن سەر دەشت و زەڤیێ مە

حەعیف هلانین دلێ مەدا هەبوو،
ئەم ڕابەری پێشیا دژمن بوون،
دەنگێ مە چوو هەر جیا، بوو گازی:
ئەم سەر ڕاستیێ نە، ئەمێ ئالتکن.

و وەختا بوو شەرێ وەتەنی،
ب گلیێ سەرکارێ مە ئامن،

مه كۆ، ئەمێ بێ گلی ئالتكن،
ناهێڤشینن، ئەمێ دژمن بەربات كن.

***

بەكۆڕابوو، بەر ب ڕاستیێ چوو،
بۆ ناموس-خیرمتێ شەركە ئەو،
سەیرۆ، بەسێ ژی خوەلیێ ڕاكن،
دایكێ وانا ژی ئالی وانكن.

دەنگێ تۆپا دهات، گەلەكی گومرهـ
دەنگێ تفنگا دهات بێقەیدمیه.
وانا داڤیتن، نەپاكێ بێروح،
ئوسا ڕۆنای بوو، چاوا سڤەیه.

نشكێڤا وێدا سێ سیار هاتن،
بەرب ملێ مه چەپێ هاتن،
بەكۆ یەک ژ وان وەلگەراند
لێ ئەوانێ دنێ ڤەنەگەریان.

پەی بەكۆ هێدی، كەرە-كەر،
هاتن میكاییل و ئازات.
وانا خوە ڤەشارتن، خۆرتێ شەر،
تڤنگ و بۆمب ژی دەستدا.

حەڤەكی دن ژی... نەلەت،
بەكۆ بۆمبەک وەركر زوو،
پەی ویرا ژی شاهێن ئاڤیت،
پەی هەڤرا بەردان ئاگر و دوو.

ژ سسیا دودو كەتن مان،

لێ یێ سسیا هەسپێ ڤا گرتن،
و ب لەز برن شتابا مە
ئەوان وێ دەرێ پرس وی کرن.

جەم وی دیتن کاخەزێ لازم،
ب نڤیسارەکە جوورەکی دن.
لێ ئەو یەک هات عەیان کرنێ،
کلیتارا ئاناخدار تێ دیتنێ،

بەکۆ وێ شەڤێ رازا بوو،
شنێلێ خوە ئاڤیتبوو سەر خوە،
ئەو چەند رۆژە رحەت دبوو
وی بیر دانی خەمێد خوە.

پاشێ ئەوی قەلەم و کاخەز هلانی،
سەیرۆرا نڤیسی کاخەزەکی دلشەوتی،
نڤیسی، وەکی وەختا شەر مرنێ،
دیسا دلێ ویدا سەیرۆ نایێ بیر کرنێ

ئەو قەوەتێ ددە ملێ بەکۆ،
دەرد و کۆلێ وی بەلا دکە هەر رۆ
ئەو دلامنییە، دوو و دەرمان،
مینا چرا زێر، بەر دلێ وی شەمال.

نڤیسی: هیتلەر تەنێ نینە،
چەند دەولەت ژی پشتا وی نە،
پشتێنە: ئیتال و هوونگار،
روومین و ڤین، هم ژی بوولخار.

دژمن دورووییە، قەوەتە هەلا،

خوه داڤێ هوندور ئەو مینا ڕەورا.
ب ڕێتنا خوونێ، پێشدا تێ، هەمینە،
باجار و گوندا ئەو هلدشینە.

لێ تو جارا وا نامینە،
ئەمێ گومرە وان ڤەگەرن،
ئیجار وێ وان ببە شینە،
ئەمێ بکن ئەو دۆر هەڤ ڤەگەرن.
هێدیکا بەرف دهات ژۆردا،
دگرت سەرێ چیا و مێشا،
مالێ خراب بووی، ڕێ گ گرتن،
دەشت و زۆزان گ ڤەشارتن.

بەکۆ ل چیایێ بەرفێ دنهێری،
دلی نەرەهەت بوو، دفکری
وەختا دەری ڤەبوو، کاخەزەک ئانین
سەلام دانێ، ئەو کاخەز بەر دانین.

میکاییل کەنیا، هێدیکا ب دل گۆ،
وا مەلوولییە، گالووبچیک بەکۆ،
عەمر هاتییە، گەرەک ئەم بقەدینن،
شەڤ ئەم دەرێن، دژمن بتەوینن.

شەڤە تاری بوو، شەڤەرەش بوو،
دیسا ژ عەزمین بەرف دهات؛
خۆرتێ مە قلخ ڤا سپی بوون،
مینا بەرفا قات ب قات.

لاوکە هەر جیا ڕند بەلەد بوون،

ئەوانا گاف ب گاف پێشدا چوون،
ب گاڤێ نەرم، دزیکا ڤا،
چوون ناڤ سینۆرێ گێرمان ئەوانا.

چوون، دەرباز بوون ئەوانا بێ خەو،
بەکۆ گۆ. دڤە ئەڤا یا پرا یە؟
ڕاستی ژی وێ دەرێ قەراتوک هەیە،
بەکۆ قەرچماند بوریێ خوە.

ئەو قەراولن وی جیێ سار،
ئەم بەرێ تێلا زوو ببرن،
پاشێ وان بکوژن یەک جار،
لاوکا گلیێ خوە یەک کرن.
وان قەراوەلاڕا خوە گهیاندن،
قرکێ وان گرتن، فەتساندن،
وانا دکر، ئاگر کن:
هەوار، گازیێ خوە پر کن.

ئەوانا چار مێر، خوونا دژمن ڕێتن،
پاشێ ڕوونشتن، شێور پێتن،
ب لێز بەر ب پرێ چوون ئەوانا،
عەرد کۆلان حەڤەکی هەڤڕا.

نیڤێ شەڤێ بوو، وەختا،
پرا تەمام گ پێ ڤا،
کرە گورین زوو تەقیا،
هاتە خارێ، وەلگەریا.

پاشێ لاوک کەتن چەعلکێ،

بەرف ژۆردا هات، ڕوویێ چەعلێ گرت

فریتس ب ئیشق وانا گەریان،

تشت نەدیتن، دیسا ڤێگەریان.

ب ڕێکە چەتنە دوور،

سێ خۆرتێ مە ڤەگەریان،

دلێ واندا شابوونەکە کوور،

ئەوانا خوەرا ڕەحەت ڕازان.

نیڤرۆ شوون دا، وەختارابوون،

بهیستن دەنگێ گورینێ؛

ئەسکەرێ مە سینۆر دەرباز بوون،

وان جیێ تەزە دان خلاز کرنە.

٤

پاش نەنهێری ئەسکەرێ مە زۆر،

پێشدا چوو، و دژمن خست دۆر ب دۆر،

سوورێ هەسن و چەپەر هلشاندن،

خوون پێش خوونێڤا، دژمن قەوڕاندن..

ئالت کرن شابوونە، بەر دلی،

وی چاخی مەرف دبە مێر،

لێ هەبوون دەمێ سەحەتێ مەلوولی،

چەتنای بۆ عەفاتا، بۆنا مێر.

ئەسکەرێ مە زۆری زۆردار،

ناڤ ڕۆستۆڤێڕا دەرباز دبوو

کشکا لێ دنهێرین دلبار،

زەعفەتر دلێ جاهلا شا دبوو.

کێلەکا خوە نهێری، بەکۆ دلخۆر بوو
گێرمان ئەو شەهەر خراب کربوو،
سەر وی باجاریدا ئاگر ڕەشاندبوو،
جاهل، مەزن داردا کربوون.

جنیاز دیتن، بێ خوەی-خوەدان،
بەر دارا، نێزیکی چەما،
زارێد دەرگووش، بەدەوە دەلالی:
کەتبوون پێخاس، برچی، جیێ خالی.

***

حەیف هلانین، ئەوی دلێ خوەدا گۆ،
هەسپێ خوە ئاژۆت و پێشدا چوو بەکۆ؛
برا قەدا شیرێ وی مەرڤی کەفە،
وەکی ڤەگەرە مالێ، حەیفێ هلنەدە.

ئۆهـــ! بەلەکی دها کەتبوون عەردێ،
لێ دیسا بەرف ڕادبوو بەر بێ،
مەرڤ دکۆ دگری بەر ڕۆژێ،
هێدی-هێدی دهات بینا بهارێ.

پاپاخی لێ خار، بەکۆ دچوو،
گولا سۆرە ل سوورەتێ بوو،
ئەشقا شابوونێ دلێ ویدا بوو،
بۆ نەما سەیرانێ نڤیسی بوو.

دلکەتیا وی ژ گوند دنڤیسی:
خێنژ تە تونە حزکرن جەم من،
تە کاخەزا دلێ من نڤیسی،

تو حزكری، تو دەلالێ دلێ من.

بەرفا چۆلێ وێ بحەلە،
ئەمێ دیسا زوو عەردێ ڕاكن،
وەكی زەڤی شین بە، زیل بدە،
ب دلێ ئەشق ئەمێ كێف بدن.

یا ڕاست من باڤێ خوەڕا گۆ،
شكۆ ناڤە زاڤێ تە، باڤۆ
دلێ خوەدا گەلەك شابوو بەكۆ،
بەر ب شتابێ چوو نێزیكی نیڤرۆ.

بەكۆ سەكنی، ڤایە ئەو كۆن،
ب ئیشێ ئەسكەریێ وێ بچوویا وێ،
وێ بسەكنیا حەتا نێڤارێ
و ئافیسێر دهاتن سرێ.

و سەر تەختەكی مەزن،
هەڤالێ باخرامیان كارتەک ڤەكر،
ئەوی سەرێ خوە سەردا بەرژێر كر،
پێ قەلەمێ نیشان لێ كر.

ئەوی كارت نیشانی گشكا دا،
دا پرۆگراما سەردا ئافیتنێ،
ئەوی جاڤا پرسا گشكا دا،
نیشان كرنا وێدا عەیان كرنێ.

شەڤ بوو، شەڤەكە تاری،
بایێ سار دلیلیلاند،
با عەور دقەلشاند،

ژۆرێ ستەیر دچرووسین.

خوەلیا وەلاتێ مە کەس نکارە،
ئەو دەست بدێ، خوەڕا بکە کارە
ئازای، مالێد مە ژ مەڕانن:
هەر ئەمن، ئەم خوەیێ وانن
***
ئانجاخ نیڤێ شەڤێ هەبوو،
وەختا ئۆردیا سۆڤێتێ زۆر،
یا ب دەستێ سەرکار چێبووبوو،
دا نیشانا شەرە وا دۆر.

بن عەوراڕا، سەر عەوراڕا،
ئایرۆپلانا ب هەزارا،
ئاگر رێتن ئەوان ژۆردا،
ئاگر ڕژیا سەر فاشیستا.

و مینا گورێ هار بووی،
دەنگێ تۆپ-تفنگا هات،
ژ دەنگێ تانکێ پێشدا چووی،
دژمن ترسا گرت هێبەت.

چاوا سێلاڤا بهارێ،
ملێ چەپێ، ئوسا ژی ڕاستێ،
پێخۆتا مە نەسەکنی،
ئەو پێشدا چوو ب مێرانی.

و مەرڤ دبێ نشکێ ڤا،
عەرد-عەزمان گهیشتن هەڤدو،

ل عەزمان سۆر بوو، حەلیا ڕۆ،
ئوسا چووک بوو، مینا تۆپکا.

ب وێ قەواتا مەزنڕا،
دچوو بەکۆیێ مەی مێرخاس،
وی دلەزاند بکۆما خوەڕا،
مینا مێرێ زۆری قەیاس.

توجار نەدقەتیان ژ بەکۆ
ویڕا دچوون میکایێل، کارۆ،
کو دەستێ فاشیستا وانا،
ب مێرانی ببریانا.

ب شەر، ب خوونا مە،
وەلاتێ مە بین کشاند،
مە ب هەزارا مەیتێ گێرمان،
تۆتۆ کرن، ل عەردێ دان.

دەشتێ خوونا ڕەش مێت،
مەرف دڤێ ڕەحەت بوو،
مێشە ژی هلدا خوون–قنێت؛
ئەوێ گاڤێ بینە بەر بوو.

چاوا چەمێ بهارێ،
عەمرێ مە پێڕا تەزە،
مە وەلات خوەی کر دیسا ڤێ جارێ،
دیسا ئازا بوو جیێ مە بەرێ.

و هەر جیا، هەر دەرا،
کەن و ئەشق بوو، شابوون.

عەزمانی تژی ب ستەیرا،
هنەک ژ مالێ کێفێ دچوون.

سەرێ چیا پاییزێ بەرف گرت بوو،
قرش و گهیا ژی زەر بووبوون،
ئاڤێد کانیا زەلال دکشیان،
ب دلێ خوەرا خەڤەر ددان.

سووری ژ زۆزانێ دهاتە خارێ،
رێڤا بارینا می و بەرخا بوو،
بینا هێشنای هندک بوو ڤێ جارێ،
مەرڤ زانبوو، کو پاییز بوو.

رۆ هێدیکا دچوو ئاڤا،
کو حەتا سڤێ رەحەت بیا.
دوو هلکشیا ژ ناڤا گوند
مینا گولیێ قیزا بوکور.

لێ قیزەکێ مینا خالفیا،
ب خەونا دیتی دگەریا،
شۆشێ دنێری، د شڤەریا،
دچوو ئوسا، خەڤەر ددا.

خازل ب تە، ئاڤا زەلال،
دەردێ تە تونە گەلۆ تو جار؟
تو هیڤیا دلکەتیا خوە نینی،
زوو دکشی ب کەلۆبینی.

دەرهەق بەکۆ زوودا نزانم،
ئەڤا دو سالە، ئاڤا زەلال،

ئەزێ بێ بەکۆ چاوا بکم
ئەز قوربان بم ڕۆژا وی شەمال؟

تو وێدا دچی پشتا چیا،
مەری رەورا دبینی هەر جیا،
چما ژ وان خەبەرێ ناینی،
بۆ ئەز ژی ببم خوێی بەختەکی؟

چەعفێ ل وی ڕەشە بەدەو بوون،
بەژنا وی مینا سپنداریێ بوو؛
ئەو خۆرتەکی پەش بوو جاهلێ ب ناف،
کێلەکا وی ئەز مینا تێلەکی زراف.

ئەوی نڤیسی بوو، ئەزێ بێم مالێ،
مە دژمن دایە بەر دەڤێ تۆپێ.
گشکی بلندترە نامووسا مە،
ب عەگیتی ئەمێ ببن هێژە.

بێژە، کێدەرێیی یە بەکۆیێ من نها،
ئەو دفکرە دەرهەرق سەیرانێ؟
دبینە ئەوێ خەونێدا جارا؟
ئاخ، ئەز قوربانا وی خەبەردانێ!

ئاڤێ گۆ. گومانا خوە نەبر
شەڤا مە وێ چوو، ڕۆژ ژی وێ بێ.
بەکۆیێ تە وێ ڤێگەرە ژ شێر،
ئەمێ بکن عەیدێ، دەعواتێ.

و سەیرۆ دلێ خوەدا گەلە شا بوو،
فکرە ئاڤێرا قلی جیێ دوور بوو،

گۆ، دژمنێ مە مەلوول بە برا،
پاشێ بەر ب مالێ زوو ڤەگەریا.

ئەورازا، خشینا ئاڤێ گۆهدا،
حەتا سڤێ خەونێ شیرندا،
شکلێ دلکەتی بەر بوو تمێ،
ئەو بهار بوو، ڕۆژمکە تەعڤێ.

دیسا ڕۆژ هاتن، زوو چوون،
ستەیرک هەوا د چرووسین،
ژ چیێ باکی سار دهات،
ب بین و بۆخزا پایزێ پاک.

قیزێ کورمانجا گۆتن هەڤرا،
سەیرانا دەلال، جان سەیرۆ،
تەڕا، نەمە مە ئانییە ڤرا.
چکا چ نڤیسییە تەڕا بەکۆ..

ژ شابوونا سەیرۆ گریا،
هێسر ژ چەعڤا هاتن خارێ،
نەمە خوەند، شابوو ژ خوەڕا،
وێ حەمێز کر کاخەز ڤێ جارێ–

ئەزی ل ڕێمە سەیرۆنگا من،
تو ڤان ڕۆژا هیڤیا من بە،
ئەزێ ئیجار گەلەکی جەم تە بم،
بهارا تەزە وێ ل مە ڤەبە.

گەلەک گلیا ئەزێ تەڕا بێژم،
دەرهەڤا شەرێ قەومی پر گران

فاشیستاڕا نەلەتێ بێژی وەکی،
ڕەحمەتێ بدی عەگیتێ مە کەتی.

من ژی ڤی شەریدا خوون ڕێتییە،
ناموسا باڤێ خوە خوەی کرییێ،
ئۆردێنا عەگیتیێ پێسیرا منە،
چ دخازی، خوەستنا من ئەڤینە؟

و تەبریک هات، زوو بەلا بوو،
ژ دلا، دەربازی دلا بوو،
و چاوا شەمالا چرا
دلێ دیا بەکۆدا شەوق ڤەدا،

باڤێ سەیرانێ کەت ناڤ متالا،
چاپ کر، پیڤا، کەت شکا دلا.
ئەو فکری: بەکۆ وێ هێژە بە،
وەکی قیزا وی ژی ژێڕا بە.

و مینا هەڤیر دلێ وی سوو،
وی سەیرانا ڕندک نهێری زوو،
دها وی شکۆڕا خەڤەر نەدا
بۆنا ئەڤینا هەردو دلکەتیا.

ئەوی دژمن ئالت کر وا،
ئەز شا بووم تەمام پێڕا.
برا ب هەڤرا بەختیار بن،
برا بێ قسوور، بێ قار بن.

***

ڕۆ تەزە هێدی دەرکەت بوو،

ئاڤێتبوو سەرێ چیا، مالا،
وەختا ئاهل، جاهل تەڤ هەڤ بوون،
تەختێ ئەشقێ ڤەکرن خالا.

ب دل و ئەشق گۆڤەندەک گرتن،
دەف و زورنە هەڤرا لێخستن،
جماعەتێ ب دلەکی شا،
دکر دەعواتا بووکێ-زەعڤا.

لێ مینا رۆا دچرووسە ل عەزمان،
رەنگێ شەمێی گولەش بوو،
کور-بووکێ دنهێری، تێر نەدبوو،
ب رۆژا خوە زەعف قایل بوو.

شەمێ دکەنیا، دلدا دگۆ،
بمرم ژی، وەکی ئەز نها،
من تالاش نینە، ببم چۆ،
لێ ئەز گهیشتم بەختەکی چاوا.

ئەوێ تەختێ دەعوەتێ ڤەکر،
گۆشت و برنج خارن بر،
شەرافا ئارتاشاتێ ئانی،
قەلیا سێلێ، تۆماست دانی.

خارن، ڤەخارن، تاری حەتا،
حەتا شەڤ هات، هیڤە زوودا
چا بووکا رووخێلی کەت بن عەورا،
لەزەکی دنێ دمرکەت ئەو دیسا.

شەکرۆ دووربا خازلا خوە،

ب شەمێ، بەکۆ ئانی،
کولا مەزن دلێ ویدا ما،
سەرێ خوە هەژاند، بر و ئانی.

## قسا جماعەتا ئەرمەنیا
(ژ ئا. ئیساهاکیان)

دبێژن، وەکی، وەختەک هەبوو، زەعف زوودا،
ل عەردێ می و بەرخ تونە بوون،
هەر مێرگ و چیمانێ جنەتێ ڕنددا،
می و بەرخێ -عەزمان ب ژیین دەبری بوون.

خۆرتەک ژ حزکرنێ بەرخو کەتی،
ل سینگ و بەرێ ئەلەگەزێ دگەریا،
دگەریا، بێ هەڤال بەرخو کەتی،
ژ کاکووڤیێ خوە قەتیای چاوا.

پێ بلوورا قامیش لێدخست فەرە،
یا دلێ خوە، تەنێ بوونا مەلوولی،
ژ کانیا، قەئیا دکر ڕمجا،
بۆ ببن هەڤالێ وی ژێ نەقەتیا.

کانیا کرن ئاخین، گۆتن:
«ئەم ژ چوویانە، ئەم چاڤا جەم تە بمینن»؟
قەئیا ژی کرن ئاخین، گۆتن:
چاوا ب تەڕا هەرن ئەم دمینن»؟

پەزێ ب ئاقل، مەعریفەت گوهداریا
دلخۆریا وی خۆرتێ دەردلو کرن،
و کرن کالین، ژ جنەتێ ڕەڤیان،

بۆ حەواسا کلامێ ژ چیێ هاتن خار.

بەرهەڤ بوون دۆرا وی بەرخ و می،
دۆرا بلوورێ یا دلا، شەواتی،
هەر جیا ب مەعریفات دان پەی وی،
بێ قەتاندن، ب دل-هەڤالتی.

وێ ڕۆژێدا شڤان و سووری، بساخلەمی،
هێلین دانین ل چیایێ بهورتی؛
وێ ڕۆژێدا ژ بلندایا چیایێ بهورتی،
دنێدا بەلا بوو، هات خارێ قەنجی.

## نادۆیێ دلکەتی
(ژ ئا. ئیساهاکیان کومەئیت)

نادۆیێ عەفات هەسپێ سۆر ئاژۆت،
زۆزانا ئەلەگەزێ،
ئاژۆت، هات، هات سەکنی
پێشیا کۆنێ گولیزەرێ.

ئالیێ کۆن ڕاستێ، ژ هەسپێ بانزدا،
هەسپێ سۆر چڤیێ کوتایڤا گرێدا،
نیزا تووژ کوتا عەردێدا،
ئالیێ کۆنێ چەپێ کوتا عەردێدا.

سەرێ خوە بلند گرت کاوی،
دەستێ خوەدا سەر دەستیێ
زێرین، یێ خەنجەرا داغستانی.
نادۆیێ عەفاتی بێ خۆف،
چوو کۆنێ باڤێ گولیزەرێ.

نادۆ بێ سەلام داین
پێشبەری گولیزەرێ سەکنی،
دزیکا ڤا دلێ وانا هەڤ زانبوو،
هەڤ هز دکن ئەوانا وەکی
لێ هەردو ژی کائوو-کوبار بوون،
نادۆیێ عەفات و گولیزەر.

یەکی دخاست بەری یە دن؛
یا دلێ خوە بێژە،
وەکی فەقیرێ ستوخار،
تەوەقە ژ یارا کوبار بکە.

ئاوا، بێ سەلام داین،
نادۆ گولیزەرێرا گۆت؛
کێ تەرا گۆتیە
تو خەجا جەعدو،
وەکی حزکریا من هەیە،
حزکرنا من ژ تە هەیە.

کێ تەرا گۆتیە
تو خەجا جەعدو؛
وەکی شەڤ و رۆ
دلێ من دشەوتە
متهەیرێ سوفەتێ تە مە.

ئەڤینا تە ب مژ
چەعفێ من نەگرتییە،
ب مژێ چیا و قورنە نەگرتیە

هەبوونا تە چییە؟
تو خەجا جەعدو،
وەكی ببم قوولێ بەژنا تە،
بحەلم، بماشم.

ڕاستە، وەكی چل گولیێ تە هەنە،
وەكی دۆرا تە د ئالن،
لێ بینا گولیێ تە خوەش نینن
مینا هەڤرمش ئەو نابرقن.

ڕاستە، چەعڤێ تە ڕەش هەنە،
دو مەعرێ ڕەشە وا فتقی؛
لێ چەعڤێ تەدا حزكرن تونە،
مرینە، مینا دلێ تە ڕەش، تەمری..

ڕاستە، بەژنا تە بلندە،
بەژنا تە بلندە، ناڤە زراڤ،
لێ بەژنا تە مینا دارا چیناریێ،
ناملمە.

و مینا قامیشێ خان-ئارازی،
ناڤا تە قەوین نینە.
تە ل خوە كریە گرێدایە،
ئاتلەس، قنائووز.
و دو خالێ كەسك سەر سوورتێ تە هەنە
لێ سوورتێ تە پەلگێ گولێ نینن،
سۆر و گولگولی، مینا گولێ شیرن.
حزكرنا تە ب مژ
چەعڤێ من نەگرتییە،

ب مژیێ چیا و قورنە نەگرتیە.
تو پاک زانبە، بێ دلێشی،
ئەزێ هەرم، ژ تە دوور کەڤم نها.

بێ ئاخین، بکەڤم چیا، بانیا،
کی بێ پێشیا من، پێرا شەر کم،
چۆلا دوومان‌دا بکەڤم بریندار،
ئەزێ بمرم، ناڤێ تە نادم،
و ناخازم، وەکی جارا پاشن،
بەر شێمیکا خوە بمرم
چەعڤێ تە ببینم.

ئاوا نادۆ گۆ،
قیزکێ تشت نەگۆ،
کێلەکێرا دەرکەت نادۆ.
ڕما خوە ژ عەردێ دەرخست،
ب موویێ هەسپێ گرت،
گرت، وەکی سیار بە.
یەکێ ژی پاشدا ڤەگەریا،
و ل شێمیکا کۆن چۆک ڤەدا:
«تو مەلەکی، هۆری-پەری،
دلکەتیا من گولیزەر،
خوەدێ زانە، تو ژی زانی،
وەکی دەرەوا دکم، دەرەو
دەرم بۆنا تە، ئاخ،
ڕۆحێ من هاتیە بەر دەڤێ من یار،
د دنیایێدا، سەر بەرا،
یا مینا تە تونە، یا مینا تە تونە،

گولیزمرا شیرنه بەدمو،

تو ڕندی، ڕندی، ڕند

هەزار جاری، هەزار».

## وەزیرێ نادرى

### دیسا هات بەرچەڤێ من

دیسا هات بەر چەعڤێ من،
ژنا تەزى، زارێ برچى و زارى،
هێسر تژى چەعڤا، کەل قرکێدا
ئەو یەکێ ئاخ و کەسەر دا من.
ئەڤا یەکا دکر گێرمان،
ب سەرکاریا موفتەخۆران،
ئاوا دیسا گێرمان مرنێ تینە،
ژن، زارا دکوژە، شەهەرا هلدشینە،
هاتنا ویرا ژى تێ برچى بوون،
زولوم و هەر دەر دبە خوون.
زەبیر و ئەسکەرێ وى سەرخاشە هار.
ئاها دەجال دگیژە کاڤکازێ.
لێ ئەم سۆند دخون ب نامووسێ،
وەکى ئەسکەرێ گێرمان هێ،
یەک ساخ ڤەنەگەرێ ژ کاڤکازێ.

١٩٤٣

## خازل

(گۆتنا کورەکی چووک)

خازلا ئەز خۆرتەکی چاردەسالی بووما،
یان ژی ئەسکەرەکی دەست سیلهـ بووما،
ئەزێ ب دل و جان بچووما،
پێشیا ئەسکەرێ هیتلێر.
باڤێ من چوویە، وی ل پێسیرێ نیشانە،
دیا منە مەزنە، بریگادڤانە،
من ژی هندک سال مانە،
کۆ تڤنگێ هلدم مینا وانە.
خازل بچووما ناڤ ئەسکەرێ سۆر،
لێ من بکۆشتا ئەسکەرێ هیتلێر،
سیار بووما هەسپێ، گرێدا شوور.

١٩٤٣

## کلاما من

نە ژ بیر دکم، نە دگریم ئەز،
ناترسم ژ کوشتن، و خوونا گەڤەز
ژ مالێ خرەب، چرایێ تەمری
بازارێ کەر، مەرڤێ مری.

ژ قیرینا فاشیستا، تالانچیا،
قوورینا تانکا، چنگینیا مسریا؛
ژ زارینیا و ژنێ کەڤگری،
ژ نالینیا بریندارا، دەنگێ گری.

برا خوونا گەرم، ل ئاسیمان،

تەڤی عەورا بە، چاوا تەلپ و دوومان
هێسرێ دنیا لێپدن، ببن تووفان،
چێکن ئۆکیانێ، سەرکەڤە لۆدکا ئالمان،

دیسا ناگریم، نە ژی بیر دکم ئەز
ناترسم توجار، ژ کرنێد وانە لەز
قەوین هینکریا دێ ئەز
هێدی چووی دها زوو دگیژە، نە کو بلەز.

هەر دێکە وەلات سیمرە، پۆئێت دبێژە،
هێلینێ بەرنەدە، تو دژمن بکوژە،
هلدە حەیفا زارێ کوشتی، مێرێ مری،
بستینە تالان برێ وان شەهەرێد خرابکری.

من ژ وەلێت هلدا تیرێز و مەیا،
پاشلێدا مەزن بووم مینا حەمیا،
ئیرۆ ب خوونا من چێکرن، گول دان،
ب ئەشق دل ددم بەری حەمیان.

ئێڤرۆیێ هێسر دکنە ئاڤا هەریێ،
زولم ژ دەنگێ ئەسیمانا ڤەکەری.
هەردەر کوشتی، بریندارێ ئالمان،
تانکێ خراب، کو ل سەر نڤیسینە «گێرمان».

تالان، توورە، دەست ل فاشیستا سار بوویە،
نێزیکە ئەو رۆژ، بێ گلی گۆتن،
کو ئەینی وێ ببە ئاخر دەوران،
گێرمانیا وێ ببە دێمۆکراتستان.

لەما نە دگریم، نە ژ بیر دکم ئەز،

ناترسم ژ کوشتن، و ژ خوونا گەڤەز،
کورێد وەلێت، لۆدکا هیتلێر وەلگەرینن،
قولبا بگرن، ئاتماسفێرا برجفینن.

دژمن نکارە کەوشەنێ مە داینە،
عەرد هەژ نکارە دنیا مە هلنینە،
بۆی نامووس کرنێ هێ دەرمنگ نینە،
کو گۆتیە: «مێر دمرە، ناڤ دمینە»

ئەزی کاوم، چمکی ژ جنەتا شێورستان،
ل کێدەرێ تو فرقی ناڤ ئینسان،
ئەز ژی تەڤ وە، هێی ڕووسس، ئەرمەنی، ئازربێجان،
ئازا کن مەخلووک ژ جەحنما ئالمان.

لێخن، مینانی بێ، برووسکێ ڕەقینن،
زەرپێ خوە تەڤ زەرپێ مێرخاسا کن،
مە خراب کر دەرگێ هیتلێرە پرانی،
هلشینن، خراب کن، ژ سەر حەتا بنی!

وی چاخی ئەم شابن، بکەنن هەمین،
دیسا شێن کن، وەلاتێ خوەی توونجین،
ل بەرخن ستوونێ چریسۆنەکە زێرین،
مێرخاسێ بستینن نیشانا «لێنین»

ئازای ساسوونێرا داڤید ئانی،
کلاما توومانیان تەنێ پێک ئانی.
ناڤ دەنگێ کۆرۆگلی جماعەتێ سترا،
لێ لاشێد هیتلێر وەلگەریان.

لێ یا عەگیتێ وەلاتێ منی ڕند،

ژ گەلیێ کوور، چیایێ بێحەساب بلند،

ژ ڕاستیێ فرە، بازاریێ مەزن، گوند،

چووک و سەرە، بووکێ بەدەو، قیزێ ڕند،

بلوورڤان و سازبەندێ وەلاتێ مە،

نڤیسارکار و ڕەقاسچیێ مەسکەنێ مە،

وێ بنڤیسن، بسترێن، ب پەسنن،

پاریزێ، بێرلینێ و ستەمبۆلێ پێ بهسینن.

١٩٤٢

## جاسمێ جەلیل

### ئێرێڤان

ئاڤا یێرێڤان، باژارێ مەی تەزە،
چێکریە ژ بێتۆن، کەڤر و پۆلا،
ئاوا ئۆردیا مە ب قەوات،
ئۆردیا جێرباندی هازر ژ عەگیتا.

ل وەدەرێیە ئوسا ژی تێخنیکووما مە،
ل کێدەرێ زارێ کورمانجا ئەشق و شای،
کەتنە ناڤ ئولم کوورای،
هازر دبن بۆی ڕۆژێد مە تەزە.

ل وێ دەرێ قیزێ کورمانجا بێخەم،
یێ ک هاتنە ژ عەمرێ تاری، پاش مای.
کلامێ دبێژن ب عەمرێ تەزە، و شای
ب کەن، ب تەڤا شێورێ، ئازای.

و قیز و کور پر شا دبن،
دخوونن، ڕند هین دبن،
چمکی قەوەتا تەزە لازمە عەمرا،
ک ڕۆنایێ بەلا کن ناڤ کۆلخۆزا.

و ئێرێڤان ببیە حەدادخانەکە مەزن،
ب ئولمێ لێنین چەک و سیلەح بووی
یا ک ڕۆنایێ ددە ملەتێ چووک

ئەشق و شا دبە ب پێشداچووینێ مە.

جماعەتا ئەلەگەزێ گازی وان دکن
خونکارێد مە قەوات ب گومان،
وەرن، زوو وەرن، قەلام دلێ مە،
کۆلخۆزڤان هیڤیا وە نە!

ئێرێڤان، بکە زنگین، مینانی ئەلەگەزێ،
بلند بە، ب کوبار، ب قەواتا گومرهـ،
ئەمێ ب سینگێ خوە تە خوەی کن
مینانی ئەسکەرێ عەفات، سیلدهار!

١٩٣٢

## کورێ من

کورێ منی بەدەو بهارا منە گولدای،
تو مەزن دبی بن تەعڤا شێورێە زەلال!
بەژن ددی ب شای و بێخەم،
تو قۆچاخێ سڤێ، شەرداریێ منی ب گومان،
لێ ژ وەلاتێ مە دەر، ل جیێ باشقە،
هێ هەنە گەلەک زارێ مینا تە بەدەو،
و بۆنا وان گەلەک پالە و گوندی:
شەر دکن، وانا ئازا کن ژ زولومکارا.
ئەو هەڤالێ تە هێ بەلەنگاز و بێ تیرنجن،
و ل وێ دەرێ هێ بەرفە، زڤستانە، چەتنە،
هەلا ئەوانا سەرمێدنن، بێئیلاج.
دژین کەسیبیێدا: تی، برچی و تەعزی.
تەمێ جوورە-جوورە، کنجێ رِند،
و بهارێ ب گول، بۆنا وانا نینن.

ئەوانا دگەرن شاش بووی و مەتەل،
مینانی ئێتیما بێ ئولم، بێ خوەندن.
کورێ منی بەدەو، بهارا منی گولدای،
زووترێ وورا ژی وێ ببە شەر،
زووترێ وورا ژی وێ خوون برژە،
بۆنا ئازایا پالا و گوندا وێ ببە دەعو.
بۆنا وان ژی وێ بلند بە،
ئۆکتیابرا تەزە، چاوا ک یا مە،
وێ ببرە دەستێ زولومکارێ زوربە،
بڤە ئازای بۆنا پالا و گوندیا!
و وی چاخی ئەوانا مینانی تە
وێ بسترێن و بکن شای،
وێ مینانی تە بخەڤتن
سۆتسیالیزمێ چێکن ب ئەشق و شای.

## گولانا سۆر

جان، دیسا هاتن ڕۆژێ گولانێ،
چار ئالی ڤەبوون گولێ ڕەنگ-ڕەنگی،
تو گولانا سۆر، شای و زەلال،
چاوا کو ملەتێ تڤاقێ ب هەزار.

گولانا عەزیز، چاخێ کو تو تێی،
کەوشەنێ هاسلەتێ ژ تە دبرقن،
تو ڕۆژێ شەواتێیە زێرین ددی مە.
تو نیشانا خەباتێ، پێشدا چوونێ.

چاوا سور و سەرما زڤستانێ،
مە زووری دەرخستن ژ مەیدانێ،

زاڤۆد و خوەلی، هاسلەت یێ مە نە،
ئەمن نها خوەی و خودان.

لێ ئاڤاس نێزیکی مە، وەلاتێ مە دەر،
دیسا زەعف مە دەر هەنە ورا،
ئەوانا ئازا نینن، لێ چاوا مەری،
روهـێ وان هەسنە، دەستە وان پۆلا.

ئەوانا ژی زووترێ وێ بڤن مینانی مە،
وێ بزووزێ، ئاغا و دەولەتیا دەرخن،
لێنین ژی نەمری ل وێ دەرێ دگەرە،
ریا شەرکرنێ نیشانی وان ددە.

و رۆژێ گولانێ وێ دیسا بێن،
چار ئالی وێ ڤەبن گولێ رەنگ-رەنگی،
ئەمێ دها ب ئەشق کلاما بسترێن،
بێ پاتشایێ زولومکار و خوەی.

زینێ

چەعڤێ تە رەش، برو قەیتان، زینا مە،
چەعڤێ تە قەمەر، ب ئاگر تژی زینا مە،
ناڤ زەڤیادا چرپانگ ددی زینا مە،
ب دەنگێ خوەش، ب کلامێ تەزە، زینا مە!

وەختا ناڤ بۆستانێ کۆلخۆزێدا،
تە دگۆت دەردێ خوەی دەرباز بووی،
وەکی ب زۆر، تو ددانە مێر،
بۆنا نەفسا جانێ تەرا تونە بوو خێر.

تو مینا منمنیکا کەوشەنی،
و تەزە پێ دکی شیمیکا چاردە سالی،
تو دخازی هین بی و ب خیرەت بخوونی،
و خوەندنێ، ئولمێ بلند دەست بینی.

تە چەفا کشاند، گەلەک وەخت،
تە پێپەسکر عەدەتێ کەڤن
تە وێدا دا، هینبوونا کەڤن، زراردار،
چووی ناڤ پیۆنێرا دل ڤەکری و کوبار.

تە گۆ وانرا ئەز دخازم بخوونم،
ببم پیۆنێر، کێلەکا وە ئەز ڕوونم،
وەکی تو تشتەکی تاری نەمینە دۆرا من،
ئەز هێ زارم، ئەز دخازم پێشدا هەرم.

و پیۆنێر ب ئەشق و دل هاتن پێشیا تە،.
گۆتن، وەرە ڤرا، تو هەڤالا فکر فرە،

چ ک تو بخازی، ئەمێ بگهینن، بدن تە،
بەسا، چقاس تو بێ کولیلک، بێ گول بووی!

ژ وێ ڕۆژێ چار سال تەمام دەرباز بوون،
بوو کۆلخۆزڤان زینا مە یە، چەعف قەمەر،
دخەڤتە ب دلێ تەمز ب جەگەر،
خومیا عەمرێ تەزە، زینا مە جاهل، دیندار.

## رۆژێ من

ئەز دەرباز بووم، ژ کەوشەنێ خرە-خالی،
ژ گوندە بێخوەی و مەلوول،
باڤێ من، ئەز دبرم ب ترس، زوور بووی،
ئەم دەرڤیان، دچوون، مە خوە ژی نزان بوو بەرب کو.

چەعڤێ من ب هێسر، خوونێ ڤا تژی،
دۆرا من تژی جنیاز، مرن و کەتن بوو،
و کووچک ژی بێ خوەی سەر خانیا کەتی بوون،
دکرن کووزە-کووز و تمێ بێ خەو بوون.

ئەم ژ کەوشەن کەر و لال دەرباز دبوون،
وێ دەرێ زەڤیێد ب ئاڤ زوو ڤا هشک بووڤوون،
وێ دەرێ خوونا گەرم گول گرتی، سەکنی بوو،
وێ دەرێ مرن هەبوو، هەر تشت خراب بووی.

عەزمان ژی نەرازی بوو، ب عەور و بێ تەڤ،
ئەم وەستیای بوون، برچی بوون و تاقەت کەتی،
لێ ئەم تمێ دەرڤیان ب لەز و بێ قەوات،
ب ریا گەلەک چەتن، ژ دەشت و بانیێ بێ مەری،

ژ وان رۆژێد زەلوولە و ب خوون،
رابوون سەر پیا پالە، گوندیێ خەباتچی،
و وانا ئالت کر، ڤەبوو شەڤەقا تەزە،
و هات ئۆکتیابرا سۆرە ئازادار...

باڤێ من دلشا، بانزدا مەیدانێ،
گازی کر، گۆت، لاۆ، ئەم ئازا بوون

ئیدی دەشت–کەوشەنێ مە نامینن بێ چاندن،
زووترێ مالێ مە وێ هەبە ئوسا ژی نان.

مەرڤ کو ڕەڤی بوون چیا، ژ چیا ڤاگەریان،
و ژ گەلییێد کوور، ژ مێشا هاتن،
گوند چێکرن مینانی جێرگێ مرجانا،
ڕابوون کولیلک دان و هێشنای گرێدان.

و باڤێ من گۆت، هەرە کورێ من،
بخوونە، هین بە و باش ئولم هلدا،
ئەم ئیدی برچی، تازی ناگەرن،
ئەم ئیدی بێ کام، بێ نان نامینن!

من کتێب، قەلەم و دەفتەر هلدا،
چوومە مەکتەبێ تەڤ هەڤالێد خوە،
ئەز تمێ هین بووم و خەفتیم،
وەکی ژ هەڤالێ خوە شووندا نەمینم.

نها گوندێ مەدا مە کۆلخۆز چێ کریە،
خەڤاتا خوە ژی ئەم پێشدا دبن،
خەڤاترۆژێد مە هەر یەکی ژی هەیە،
ب تراکتۆر–ماشینە کەوشەنێ مە تژینە.

هێشنای هەر دەرا بەلا بوونە،
چیا و بانی کنجێ خاس خوە کریا.
عەمرێ تەزە کولیلک ددە ب خەڤاتا مە،
و ب خوودانا تە گول ڤەدبن.

لێ چاخێ دبا ئێڤار و تاری،

ئەم بەرەڤ دبن ل کلووبا خوە تەزە،
ستالینێ مەزن ژی ب مەرا خەڤەر ددە،
تووێ بێژی قێ لێنین ژی سەکنیە، سەرکارییێ دکە.

و ئەم دبهێن و دیسا هێن دبن،
ناڤ مەکتەبا شەرێ سنفێدا،
وەکی ئەم چێ دکن عەمرێ تەزە، باش،
ئیسانەتێ تەزە، بێ سنف و بێ خەم.

## مارۆ
(تەرجمێ ژ ه. توومانیان)

١

ئەوە گوندێ مە، کو کوبار،
ناڤ زنارادا مژ گرتی،
کەلیێ کووردا، دەڤ زنێر،
دەست دایە بەر ئەنیا خوە
فکرێ دکە مەلوولی،
چ دخازە، نزانم...
ئەم ل وێ دەرێ پارێزێ ناخون
و ب دلێ ئەشق دوعایێ دکن،
هەر رۆ ئەم دچن دێرێ
لێ هەرتم دەردێ تەزە،
هەرتم زرارەک دەردەک،
دگهیژن تە هەرتم،
ئاوا، قەوماندنەکێ وەرا بێژم،
سەرهاتیک، کو تو جارا،
بیرانینەکە مەلوولی،

ڕحەتیێ نادە دلێ من.

٢

ژ گوندێ مە ژۆرتر حەتانی ئیرۆ،
دارەکی بیێ مەلوولی وێ دەرێیە،
ژ مێشێ مەزن ئەو باشقا بیە
ژ بالتێ مەریا ئەو ئازا بیە،
ئەو سەکنیە هەلا وێ گەرمێ،
و سیێ ددە ڕێنجبەر.

جەوەکە چیێ دین بیا،
و دخولخولە ل بن وی،
دلیزە ناف شینکاییدا،
نیڤرۆ ئەم وێ جەوێدا،
چاخێ کو ژ گەرمێ ئەجز دبوون،
ئەم دچوون، دکەتنە ئاڤێ.
تەعزی، ب کۆما شای.
ب قیرین، قیژین
مە دلیست و ئەم دبەزیان،
د ناڤ خیزکا ڕەنگرەنگیدا
یان ژی ئەم پەی منمنیکا
درەڤین، هلکینا مە بوو،
و هەرتم، وەختێ وەستیای،
بن وی دارێ تەکدا،
مەلوول ڕوودنشتن سەر کەڤرەکی،
سەر تربا مارۆ.
مارۆئا بێ بەخت زوو مری،
تو هەڤالا زارۆتیا من،

چقاس مه لیستیه ب هەڤرا،
مه هەڤ حزکریه و هەڤ کوتایه.

٣

مارۆ ژی بوو، دەلال بوو،
تەزە ئەو نەهـ سالی بوو،
چاخێ رۆژەکێ دو رێوی،
هاتن مالا وان مێڤان،
چاخێ کو سنی ئانی،
تژی دانی بەر وانا،
گۆتن، ئەم زەعف رازینه؛
تەشتا وه تژی نان بە،
دمرێ وه هەرتم ڤەکری بە،
ئەم نان نەخومزن ژ وه،

خوەلیێ بدن مه ژ مالا خوه...
وی چاخی باڤێ مارۆ
ئاراق ستەند
ستەکانا وی تژی، گۆت:
عەمرێ ته بە، خومدێ...
نیشان کرن مارۆ،
دانه شڤان کارۆ.

٤

کارۆئێ شڤانی چیای
ئەو شڤان بوو تەرکی،
ومختێ بەژنێ دنێری،
ساو دکەته سەر مەریا:

لێ خوەسیا وی گەلەکی
هەرتم حز دکر ژ وی،
مارۆ ژی زەعف ژێ حز دکر،
ئەوێ دگۆت، باشە، کارۆ،
منرا هەر ڕۆژ تینە،
کانفێت، کشمیش و سێڤ...
یەکێ ژی کارۆ ب هێوورزە
هات ب دەف و زورنە،
و مارۆ خەملاندن،
تەمەزی ئاڤیتن سەر سەری،
حنە دەستێ وێ خستن...
کەشیش خاچ ڤا هات
بەر دێرێدا سەکناندنێ.
تو خوەیێ وێی، لائۆ، ژێ پرسی
کارۆیێ مە گۆت خوەی مە!
مارۆ کەر ساکنی بوو تمێ،
باڤ ژی هات وێ عەیدێ،
وا دوائا لێ زەعڤێ کر:

ئاشێ تەدا، تمێ سرێ بە،
پشتا تە کەلا متین بە...
لێ کەنگێ کو گۆتن «برن وا»،
ئەوێ برن مالا زاڤێ.
دانە مێر مارۆ،
دانە شڤان کارۆ.

ب كرنا فەعلچیێ نەپاک،
ب نڤیسارا وی، چرینا وی،
دلێ وێ، جاهل برین،
دۆنێ گور، پیرا جەدو
ب نێپاکی، نێتا خراب
ئانی ل کنجێ وێدا...
ئەو تو کەسەکی نەبهیست زەلال،
تەنێ بووکا تەزە هاتی.
مارۆ حز نەکر ژ مێرێ خوە،
ڕەڤی، پاشدا هات مالا باڤێ خوە.
ئەو هات گریا ب کول
ئەز ناچم جەم وی،
ئەز ژ دیا خوە حز دکم،
ئەز ناخازم بڤم ژن.

٦

باڤ وێ سەحەتێ هێرس بوو،
ئەو کوتا و گۆ:
دەرکەڤە ژ مالا من، ڕوو ڕەش،
تو پاشدا مە نەنهێرە،
لنگێ خوە دها دانەینە مالا من،
تە ناڤێ من خراب کر...!
مارۆ ب گری، ڕوویێ خوە گرتی،
ئەو ژ سڤدەرا باڤێ خوە دەرکەت.

٧

باڤێ مارۆ بەری دایێ،
مارۆ ڕەڤی ژ کارۆیێ شڤان،
برچی، ب کنجێ قەلشی،
ئەو ئندا دبوو ب ڕۆژا.
دقەفلی ب بەلەنگاز،
ل بەر ئۆجاخێ خەلقێ،
یان ژی دگەریا تمێ،
ل دەشتێ مە، چۆلێ.

٨

گەلەک مەهـ دەرباز بوون...
ژ چیایێ پێش شڤانەکی
ڕۆکێ دەنگ دا مە:
بزانبن، وەکی وا
ب کنجێ سۆر قیزەک
کەتە ڕیا خار گەلیدا...
ئەم ژ گوند دەرکەتن،
دوور سەکنین ژ ترسا.
مە دیت، وی گەلیێ مەزندا،
چاوا دگەریا و قیژیا،
باڤێ مارۆ کال بووی،
دێ دگەریا، شین، گری،
و کارۆ ژی زەعف گریا...
مارۆا مە مر و چوو.

٩

لێ جنیازێ وێ بێ بەخت
دانین بەر دارەکی،
ژ گوند دوورتر، حەتا ئیرۆ،
هەیە دارەکی نە شین بووی.
بن وی دارێ تەکدا،

چەلەکە کوورێ لێ کۆلان،
بێ دێر، بێ پاتاراک
مارۆ دانین هوندور،
کەڤرێ ڕەش ژی تەرشاندن،
ئانین دانین سەر وێ.

١٠

من زەعف دیتیە، چاخێ ب گری،
دێ ب تەنێ، ب کنجێ ڕەش،
قووز دبوو سەر وی کەڤری
دەی مارۆ دکر
کێ تو کوشتای، مارۆ جان،
کێ نفری کر، مارۆ جان،
تو ڕەڤی کو، مارۆ جان؟
وەرە، وەرە مال، مارۆ جان!
ڕازای،ڕانابی تو، مارۆ جان،
دها هشیار نابی، مارۆ جان؟
ئەو قووز دبوو، سەر وی کەڤری،
دەنگ ددا مارۆ.
خوونکێ دوو دکر، مووم دشخولی،

گەلەک وەخت، ژ چیایێ دوور

ئەو دبرقی ب تەنێ،

ئەو شەڤا تەری.

# جەردۆیێ گێنجۆ

## بەرب گوندێ کۆلخۆزڤانییێ

١

هاڤینێ تەزە دەست پێ کربوو. دەشت و زۆزانێ سەرهەدێ: گەلی گوهێرا، مێرگ و چیمانا هەلا خەملێ خوە نە شێلاندبوون، دگول-گولین.

سڤەکێ ئەم ڕابوون ئوسا زوو، وەکی تەزە کەو کەتبوو سڤێ، بازارێ ڕەوانێ د خەوا شیرندا بوو، تەنێ خرینا دەنگێ ترامڤا، یێ کو هەرتم وی وەختی بەری گشکا سلاڤ ل سۆقاقێ شەمشاتکری دکرن، کوبار و سەربەست، هەرڤاز، بەر ب سەرێ بازارە ژۆرین هلدکشیان، پاشێ شووندا ڤەدکشیان عەگیت و دەربدارێ زاڤۆد و فابریکا بەرژێر، بەر ب سەرێ بازاری ژێرن هلدکشیان.

ل وێ دێرێ، هوون زانن، چقاس فابریکا و زاڤۆد هەنە. ب سرێ، ل پەی هەڤ، ئۆهـ! هەساڤ تونە...

گەلۆ کێ ژ وە دیتبوو بازارێ ڕەوانێی بەرێ؟ ئەگەر تە ڤان سالێد پاشن نەدیتییە، تو چقاسی ژی ب زێن و سرافەت بی، چەتن کاربی ناسکی...

ئەو کراسێ کەڤنی، هزهزی زوو با ژ خوە شقتاندییە وێدا ئاڤیتییە، شەوتاندییە.

نها، پر خەملییە، سۆر گرێدایە.

کۆچک و سەرا، برج و بەدەنا، گیگانتێ ئەژدها سەری دانە سەر هەڤ بلند وەکە چیا.

برجێد بەدەو، باخێ تۆرکری، سۆقاقێ شمشات ب دارێ خەملی گۆڤەند گرتنە، تەڤ دلیزن، ئۆهـ! د وێ گۆڤەندێ دا، هوون زانن، چقاس عەگیتێ دەربدار هەنە... ب ئۆردیێ گران، حەزار-هێزار مێر و ژن، قیز و خۆرت...

٢

بوو ویقینا ماشینا مە، دوو ل پەی خوە کرە ڕێز، سۆقاق-سۆقاق فرقاز کر.

چەند دەقا شووندا ئەم ژ بازار دەر بوون.

ماشینا (ئاڤتۆئا) مە ڕوو ڤەکری بوو، مە چارنکالێ خوە فرێقەت ددیت، لێ ماشینا مە ئوسا ب زەرپ قل دبوو ڕووبارێ عەردێ، تە قەی دگۆت ئەوە، وێ هلپارکی عەزمان بە.

خێلەکە ئێپێجە ئەم چوون. تەزە تەعقێ دا، پەنجێ خوە کوتا ناڤ سەرا چیا. ڕیا مە، وەختا خوەدا ڕیا دو قۆناخا بییە، لێ نها، دەقە دژمرین.

جێرگێ گوندا کەتبوون پێشیا مە، هنەک ئەم د ناڤڕا دەرباز دبوون، هنەک د کێلەکێرا.

دوور با زەلال خویا دکرن گوندێ بەر پالا چیا: جی-جینا دوویێ تەندوورا قولپ-قلوپ هەڤراز هلدکشیا بەر ب عەزمانێ شین، د ناڤ هەوێدا تەلپ دگرت، ل هەڤ بەلا دبوو ل سەر گوند دسەکنی.

وەعدا گهیادروونا گوندێ چیا یە، خەبات ل کەوشەنێ

سۆسیالیستیێ دکەلە، عەکیت و دەربدارێ کۆلخۆزا ڕەو گرتنە چارنکال، قیرینا خۆرتانە، شنگینا کێلەندیا یە، دسترێن کلاما کۆلکخۆزێیە هەرجار.

ماشینا مە مینا برووسکێ قل دبوو ب ئاواکی، ناڤا سەحەتەکێدا ناڤبریدا ٦٠ کیلۆمێتر ڕێ، ٦٠ ئیدا ل نێشیا مە ڤەبوو وەلاتەکی تەزە.

ئەم سەر ئاخبارانێدا دقولبین. گوندەکی هێسا د گەرمکا فرەدا پەر ڤەدایە، ئوسا، چاوا گەلەک گوندێد مە بوونە وی قراری، لێ ناڤێ ئاخبارانێ د قرنادا هاتییە گلی کرنێ، گەلەک نەحیێ ئەرمەنیستانێ و زاکاڤکازێ، گەلەک ناڤێ گوندێ هەڤ نزانن، لێ ئەو گشک ب هەڤڕا ناڤێ ئاخبارانێ ڕند زانن، چما ک وەختا خوەدا ئاخباران گەلێکی شووندا مای، تارێدا بییە، لۆما ژی، گاڤا ک گەلەک گوندی و بازارڤانێ ئەرمەننستانێ قار و قسوور دانە سەرێ هەڤ، ئەڤا پرسا هانا وەکلاندانە، «تو کورێ ئاخبارانێی، بێفەمی، نەزانی، سەر هشکی، سەرگەدانی»

هەی گدی! زەمانێ منی شیرن، ئەڤا ئەو گوندە، یێ ک نۆلا قیزا بکورە ل بەر مرازا، لێ نشکێڤا وەختا خوەدا ڕوورەش بووبوو، کەسی پۆز پێ نەدکر، ژێ حز نەدکر، ئەڤا بازارێ چووچکی بەداو چەند سال پێشدا گوندەکی کەڤنک بوو، لێ نها، تو وەرە بنهێرە، توێ گەلەک نەخش و نمووشێ تەزە ببینی.

برج و بەدەنێ وێ دەرێ ژی سەری دانە سەر هەڤ: کارخانا مەرمەر، زاڤۆدا شیر، حمام، فرنا نان، ئاشپێژخانە، مێڤانخانە.

چار-چارنکالێ گوند دارێ باخا تەزە نکاندنە بنی گرتنە، شین بووش، ل همبەرێ ئاڤایێ دیوانخانا و قولخدارا، گەرمکە پر فرەدا، ب سرێ و قەیدە، هەلا پار ڤا دار نکاندنێ. باخەکی سەیرانێ تۆر کری ئوسا چێکرنە، وەکی مەرف حەواس-حزمەکارە لێ بنهێرە،

چ سەرێ وە بێشینم، ئەز نزانم کیژانێ بێژم، وەکی سفەتێ ئاخبارانێ عەیان کم.

دو دەقە شووندا ئەمە ل ناڤا ئاخبارانێ بوون، ل بەر دەرێ دیوانخانا مەزن.

ڕۆژا ڕەحەتیێ بوو، لێ دیوان ڤەکری بوون، وەکە بیست مەری ل بەر دەرێ باخچێ تەزە سەکنیبوون، مەسلەهەت دکرن، دو-سێ خۆرتا بەری هەڤ دن، یەکی سێڤەک ژ دەستێ هەڤالێ خوە ڕەڤاند، فرقاس کر، ژ ناڤ وان دەرکەت، یێ دن دانە پەی، لێ نکاربوون بگرتانا، خۆرت چوو دوور سەکنی، دەستمالا خوە ژ جێبا خوە دەرخست، سێڤا خوە تەمز کر، دوورڤا دەی ل هەڤالێ خوە کر، وەکی ببینن، ئەو عەیناتی وانڕا سێڤا خوە شیرن-شیرندا بەر گەزا.

وە گرتە خوە، گۆت یەکی ژ وانا، ل بەستا همبار وەکە دەهـ-دۆنزدەهـ خۆرتا هەسپێ هەسنی ڤی ئالی وی ئالی دچەرخاندن، ئوسا سەربەست، قەی تە دگۆت زکماکیدا ل سەر پشتا وان هەسپا مەزن بوونە.

ب ملێ ڕاستێ کێلەکا چەمێ سپی ئاڤای هەبوو، من بەرێ خوە ژ لیستکێ خۆرتا کوهاست و خوە ل ئاڤایێ تەماش گرت.

ئاڤای نە پر مەزن بوو، لێ شکلێ وی نیشان ددا، وەکی ب مۆجێ تێخنیکا پاشن هاتیە چێکرنێ. ل بەر دەرێ ئاڤای وەکە شەش-هەفت ئاڤتومۆبیل پەی هەڤ سەکنی بوون، هوندور ئاڤایدا چار گۆشێ باشق-باشقدا سنەتی تەشکیل بووبوو ژ چار قسما، سێ سنەتخانادا کەس تونە بوو، تەنێ دەزگێ چێکری، ل سەر هەر دەزگەکی جوورە-جوورە هاجەت و پەرگالێ هۆستاتیێ تەمز و تۆندرست دبرقین. ڕۆژا ڕەهلتیا وان بوو،

د هەر ئۆتاخەکە سنەتێدا یەک ساندقێ دوو-دەرمانا داردا کری بوون.

تەنێ ژ سنەتخانا چارا شنگینا چاکووچ و زندانا دهات، گاڤا ک ئەم چوونا هوندور، خەباتچیا ب تەماميا خوە با بەرێ خوا دان من، سلاڤ ل من کرن، من سلاڤا وانا ڤەگرت.

فیرە-فیرا کوورما حەدادا بوو، پریسکێ سپی ڤی ئالی وی ئالی دپەکیان، خۆرتەکی سەربەست سرنیکی فرخوونا ژ کوورمێ دەرخستدا سەر زندان، دو خۆرتێ دن ب قرانێ یەک پووتێ هاتنە ناڤ چەعقێ هەسنێ سۆر بووی.

ئەز نێزیکی تەنەکچیا بووم.

هۆستا، ڤی وەختی ئاقاس سۆبە چ هەواله؟

بۆنا مەکتەبێ نە؛ ئەم گەرەک وەختەکە کندا ٢٥٠ سۆبەی تەمام کن.

ی، چ حەساب ئە؟ نەهیا ئاخبارانێ ٢٥٠ گوندە، ئاقاس ژی برا مەکتەبێ وان هەبن، لێ ئاقاس سۆیا؟ مە هەڤەکی حەنەک ب هەڤدو کرن، و ئەز دەرکەتم چووم بازارا ئاخبارانێ. وێ دەرێ گەلاک ژن و مێر ل هەڤ دو دگەریان، چ بێژی نانی بوون؛ ڕوون، پەنێر، هنگڤ، هێک، مریشک، ساڤار، برنج، کنج و مداس، سووک هاتبوو خەملاندنێ، هەر گوندیکی کۆلخۆزڤان: ئەرمەنی، کورمانج، ئەجەم هاتبوونە سووکێ.

حەواسا من ب سووکا ئاخبارانێڕا دهات، ئەز مەتال مام، چمکی عەمرێ ئاخبارانێدا ئەو چ ک من بەر چەعەڤێ خوە دیت، تشتێ تەزە بوو، چمکی ئەز زوودا نەچووبووم ئاخبارانێ. نها گوندیا، کۆلخۆزڤانا گرتنە ڕیا دەولەمەند بوونێ، ئەوانا دها ستویێ خوێ ل بەر کوولاکا خار ناکن، ژ وانا جۆت و نیر ڕەجا ناکن. ئەوانا خوەیێ کەدا خوە نە خوەیێ ئیزن و ئازایا خوە نە.

## قاچاخێ مراد

### سەمەندێ سیابەندرا

هیڤا تەزە خرخالێ تە،
گول و سۆسن بەرپالێ تە،
ئەز هەیرانا رهالێ تە،
جەواهرا سینگێ بووکا!
ناڤا مێرادا تو تاجی،
تەعڤا گەشی ل گێدووکا!
ژ بەنگزێ تە زمان لالم
ستەیرکا زەرین وێ گەش دبە
سینگێ کوردێ کەلەش دبە
نسلا ستالینرا خاش دڤە
سەرفنیازێ کال و چووکا!

### وەزیرێ نادررا

بن شووشێدا دانیە شکلێ وی بەر من،
خوودانەکە سار داکەتیە ل سەر من،
ئەو دکەنە، ئەز مرووزم سەبا وی
من دپرسە، ئەز نادمێ جابا وی.
بەرێدا ئەم برا بوونە دل حەلال،
نۆلی شرکێ ئاڤێ ژ کانیا زەلال.
وەختا ب شا، ئەو دمەشیا ناف باخا
نۆلی برا ددا حەموویا تەمیێ خوە!

کێ باوار دکر، وەکی قەزیا بێ ئامن
وێ جلەتکە، خۆرتێ تالیان-حوبا من
و ئەو بەژنا نازکە و نازانی
تێکە خورێ خالیا سارە بەیانی.
کێ باوارکە، وەکی ئەو ناڤ مە نینە،
کێ باوارکە، کو ئەو ناڤێژە «هەڤال»
کێ باوارکە، بن خالیێدا دێم زەلال!
ئەز سۆند دخوم ڤرا ل بەر شکلێ تە
ژ هێژیا چێتر کەنێ هەرۆ ئەکلێ تە
ب ئەڤینتی وەتەن حزکن شڤێتا تە،
میاسەرکن ئەم هەر جارا نێتا تە!

### مەیانە

ڤیزکا دەلال تو، مەیانە
کێ هەژاندیە بێشیکا تە؟
ژ چ گولا ناڤا باخا
تە هوونایە گەردەنا خوە؟
گولیێ بەدەو، ڕۆژ و شەڤ
ل بەر ڕۆیێ دچرووسە ئەو!
دبە، کو ژ دیلبەرا فەقیێ تەیرا
بەدەویا وێ تە ژێ هلدا؟
یان ئادانا وەلاتێ مە،
نۆلی مێخکێ باخێ دەلە،
بوو شەمالا پەنجێ ڕۆیێ
گرتە ژ تە و خەڤخەڤکێ!
ل ستوێ تەدا دەستمالا سۆر
سەردا خارن چەعڤێ تە مۆر،

نۆلی گولا، حەواسا تە
ب ئەڤینتی هەرجار سەرە!
تو ژی زانی، چ مسکەنە
ناڤدا شین بووی، نۆلی گولا!
تو ژی زانی شای هەنە
جەم مە تونە ئیسکینا دلا!
دە تو بلیز، دەلال بلیز!
شا بە، نۆلی گولباخانا
هوون بسترێن و دەنگێ زیز
برا دەرێ ژ پالا هانا!

## وەلاتێ شێورێرا

دچمە گوند ژ باژێر،
کەوشەنێ گول دبهێ،
ژ ئادانا تەعمە تێر،
مسکەنێ منی شێورێ!
وەتەن – وەتەنێ تە
کانیێ ئاڤاز ل سەر.
ماشۆقم ل ڕحانێ تە
ل ڕەزێ تەی نەدەر!
تو گولا دەڤ گێلیدا،
تو ئێورا زارێ دیبە!
وەتەنێ من تە زیلدا
ب کوبرەکە تەزە.
ژ هەزار تەریێ تەجبەتی ئەز،
ژ دلێ وانی ئێتوون،
فری شابوون پێدا بوو ڕەز،

پێدا بوو گول ڤەبوون.
تو هلدا ڤی شایری
ژ توسحیدێ خوای تەزه
مقامەک دانیه وی
مقامێ حوبا تە.
سەر تەدا تێم ب تال
تالا من تەڕا کلام.
بچووک، جاهل و کال
دشینن تەڕا سەلام!

## گوندێ مەڕا

تە گول ڤەدە دەلالۆ،
ژ دەست قەواتا زۆر.
نە یێ بەرێی گوندۆ،
ب بان ڤەبووی ژۆر.
ئەو نینی، تو ئەو نینی،
وەختا کووڤی بووم ژ تە،
د من بوو کێریێ خوونی
تووژە نۆلی نژدە.
ئەز بیر تینم پایزێ،
بەر تەڤیا ل بەر گۆلێ.
بن نڤێژا دارا گووزێ
تە ئەز شاندمە چۆلێ.
لێ حوجەتێ ئەز نزانم
تونە قەلپی جەم من،
ب کوبرا تە ئەزی جانم
یا شیرنە ب ئامن

کەوشەنێ تە گولدایی
تراکتۆر ناکا دقووژە،
و شەوقا تەڤێ ب شای
سەر تەدا درژە.
چنگرێ تەیی هەڤدا
ئەو بوونە دەشت، چیمان
کۆمسۆمۆل وێ ناف ڕەزادا
دخەبتن ب گومان.
نها وەختا دنهێرم
ل کەوشەنێ تەیی حەواس
هم شا مە، همی تێرم
ژ کۆلخۆزا تەیە خاس.

## ژنێ وەلاتێ شێورێڕا

ب گازیا وە و شابوونا دلێ ئالاڤ
و وەلاتێ عەمرێ ئازا هوونە د ناڤ،
خووشکنۆ، ئاقل و قەلەما منە زراڤ
شکل دکن وە و بەژنا وە دێمێ گولاڤ!

من ناس دکن؟ برێ وە مە ئەزی تووسن،
ناڤ پێچەکێ سۆڤێتستانێ ئەز خوای کری،
خووشکا منە ناف وەلاتێ تەوری دەنگز
بێشیکا من هەژاند دەلال و حزکری.

ئۆ، خووشکنۆ! تفاقا مە شایە و حزکری!
ئەو چاوا پۆلا وێ قەیمبە حەتا-حەتێ!
وێ ژێ بڤە زورەتا مەیە نەئالتکری
زورەتا ستالینە، کو دبینە مەعریفەتێ!

بیرا وە تێ، خووشکنۆ، ئایکێ دلێ قوولا؛
بیرا وە تێ قەتلا بەرێ پادشێ ئوورس؛
بیرا وە تێ خوونێ خووشکا، کەربا دلا؛
ژ دلێ مە دهات بینا بارووتا مز.

بیرا وە تێ، سەر مە بلند قامچیێ پۆلا،
لێ دەستێ بەگا قنییاتێ مە دهنجراند،
ژ پشتا مە چەرمڕادکرن، نۆلی زۆلا
و تەیاخە خوە، ژیینا پاشن مە دکشاند.

و ئەم بووبوون کڤاڤا پەتییە ل سەر ئاگرێ
ئانجاخی دوور دململی نۆلی چرێ.

مە دهەملاند پاشن عەمرێ چەتهن
و هیڤیێ بوون دمرێ بهار-برا مەزن!

نها، یەک وە شۆفێر، یا دن پیلۆت د عەزمانا،
هوون داربدارن، هوون سەدرێ کۆلخۆزڤانا.
ئیزنا وە ژی نکا همبەرە ئیزنا مێرا،
باڤێ ستالین ئانی سێری ئەڤ قرارا.

ئەم شاییشا ناکشینن ژ تو کەسا،
و چێدکن سۆسیالیزمێ ب دلێ بەر
کی جلەتکە، دەست درێژکە وەلاتێ مە شا،
ئەمێ پشتێ لێ بشکێنن لێ تێخنە باگەر!

## عەیدا یەکێ گولانێ

ژ جماعەتێ ب فینجانا سۆر

من حوبا گەرم ژێ هلدا.

تیرێنجا تەڤا ژێر هاتە خار،

شابوونەک کەتە دلێ من دا!

***

شەمالا کار ڕژیا عەردێ،

بینا گولانێ تەڤ وێ تێ،

مینا کەڤرێ بری تەعتێ

پێلا مەریا دچە تێ.

دچن و تێن پێلێ مەریا،

کال، جاهل، بچووکێ دەست دیا،

کلامێ برژە حەموو گەلیا

برا تە بسترێن حەموو جیا.

***

زمینەکە گران کەتیە عەردێ،

دەنگێ وێی زیز دچە دنێ،

هەڤال کێف بن هوون وێ عەیدێ،

عەئیدا ئازا، ڕوحێ دنێ!

***

تاقێ خالیێ مە ژ هەڤ ڤەژاند

ب ملێ قورمیە نەئالتکری.

عەگیتێد مە دنێ هەژاند

دەست هونورێ خوە حزکری!

ئەم کو لنگێ خوە داڤێژنە جیا

دەست داڤێژنە چ پێشەی،
ناڤێ ستالین دەنگ ددە هەر جیا،
ستالین گۆتی، مەرا شای!

## عەیدا ئۆکتیابرێرا

هەزار تولە عەمر دشخولە و بەنگزێ تە تینە بیر.
بیست و نەهـ سال، نۆلی دور لال کەغبێ هێشین دیت
تڤدیر.
ژ تە ڤالدیە و ڤال بوونە قەهرەمانێ مە پەرگال،
یێک بۆی وەتەن شەر دکرن نۆلی رۆستەم-زال!
تەک تە شووشتیە ب کوتاسی ئیسکینی و عەمرێ تسی
چەعڤێ نەپاک، دلێ قۆمسی، دەستێ زۆرێی عەورنسی.
ئەز بیر تینم سێ سالیا خوە-رەڤا پاشن خوون دکشیا.
جنیاز سەر هەڤ ل بەر تەڤێ، خوونا کو ل عەردێ پژیا.
دێ ئەولادێ خوە داڤیت و دەست داڤیتە تڤنگێ
دچوو تیپیا و شەر دکر، کو هلاتا زولما هنگێ.
ئەز بیر تینم ناڤا قەتلێ عەمرێ کۆچەر و کورمانجیێ.
نیڤ بەیانی، هنی فەقیر، شڤدارە دەست ل سەرێ چیێ،
ل بەر سورێ، ل بەر شۆیێ ئەو کاڤانێ گوهێ گوندا
تە دەمین لێکر، وی تڤنگ هلدا کەتە تەڤیا رۆژا
تە دا.
چی مەرا بوو تەبیەتا ئەکل و بێ فەیدە دەستی نەدای،
چی مەرا بوو ئەو عەمرێ کن هن زێراندی، هن لێدای،
چی مەرا بوو چەعڤێ ل دەستا، نەفسا برچیە قشا گرتی،
یاک چووکتیێدا نەسەقری و رۆژا خوەش قەت نەدیتی!
ئەم بیر ناکن وی حەیامێ، خەدەر ناڤا دەلکا؛
مە تۆخمێ بەختێ مرووز درەشاندە سەرێ سووکا،

ب قەرپالێ ناڤا مالا ئەم دگەریان ل گێدووکا،
وەکی دەرێن ئەم ژ وێ پارسا چێر لێکرن ل بەر دەریا،
کو هلچینە ئازایا شا، ئەو چەعڤێ ل دەستا، چەعڤێ، کۆ
زێریا.
نها، وەختا دنهێرم، بەنگزێ مەریا گولڤەدایە!
گوندێ، کو بەرێ دخەنقی ناڤا تەریا مژا سەقر
ب هەزار لەمپێ ئێلێکتریکێ، نها ئەوی شەمال دایە!
نها تراکتۆر گور دقووژە ل سەر عەردێ دەورایی قر!
سی سالێ کەل قەفەسا تەدا ئەم دەست تینن بەرێ ڕەزا!
نۆلی بەرا بێ سەر بنی، وەلاتێ مە سی پێلدا خوە،
هەر پێلەکێدا پێشدا چووین، هەر پێلەکێدا عەمرێ ئازا.

## تەیار

گەلیێ کووردا، تێرێک دلەمە ب گور،
گەش هەر ئالیا بهار دەرتێ ژ بوهور،
و قالچیچەک بوونە خەملێ تیتال،
شرکێ سپی ئاڤێ کانیانە زەلال.
هێ تێ خانێ تیپیێ جەنگێ پش زنار
کۆلا تەبی تە خوەڕا کرییە یەک وار
ل وێ دەرێ، جیێ کو دوژمنێ بەدی هار
دخاست چەعلکە ژین، ئازاتی، نامووسێ،
و خەلقێ چیا تێکە قوولێ عەمر مرووز.
لێ ڕوکنادا ناڤێ کالا و باڤا
ب گازیا خوە گورە، نۆلی ئالاڤا
تەمی ددان خایکن دلادا کینێ،
و وەتەندا فاشیستا بدنە تەلینێ،
کو نامووسێ دکە پۆلێ کۆری پووچ،

هم دکوژە زارێ دەرگووشە بێ سووج.
دەنگێ دایکا دەرتێ شیرن و باش،
و دبێژە حزکن وەتەن، ب حوبا خاس،
چەوا وانا ژێ حز دکر ب ناری،
چەوا وانا ئەو خای دکر دیهاری!
لێ دەڤی ڕێ بن سیپا دارا چینار
قازاخەک دیت، نۆلی تەڤا پەنج شەمال؛
وێ دهوونا گەولەزێ کولیلکێ بین
و دادانی سەر کەڤرێ تربا ئەڤین!
ب دەستێ هۆستا، یان قەلەما نوهـەدار،

ب حەرفێ زێر سەر مەرمەردا بوو شەمال
سەرهاتیا وی؛ «مێرخاسیدا هات کوشتن»
خەبەر کێمن، خو سەرهاتیا وی کشکی
نانڤیسن ب هێکێلا زوو دانی
لازمە وەخت کتێبێ هەزار بەلگانی،
وەعدە ژی دچوو، نۆلی مەرڤا دلیڤی
بەر ب وێ ڕۆژێ، کو ئالتکرن دخانی،
پیرێ نەرما ڤەگەریا بەرب قیزێ
و گۆتێدا ب زارێ شیرن، کێلما دێ:
«بێژە دەلال مێرێ تە یە، یانێ باڤ
ئەسکەر کوشتی، کو دبارینی هێسر-ئاو»؟
«نا، نا... ئەو هەڤالبوو ناڤ قالێ،
وەختا برووسک دچرووسی ل پالێ،
و دەشتێ مە خاکربوو خێلیا ڕەش
خوە ڤەدشارت دێ دەرگووشا خوە نەخاش،
نۆلی کورکا، ژ تەیرێ دەجالی قەرتەل.

وەختا عەردێ دکر گازی، نەعلە-نەعل،
چەوا بریندارێ خەداری بەتحال؛
هاتە جەم مە ژ ئێلا ئەلەگەزا دوور
خۆرتێ تەیار ب سفەتەکی گەلەک نوور،
کورێ کوردا، پر فراسەت و کەمال،
دەڤی ب کەن، خالا سوورەتە شەمال.
وی شرۆ دکر سەرهاتیا خوە ئێڤارا،
نۆلی شاروور، دبلبلاند ژ دارا
ژ عەمرێ خو و جاهلتیا مە عەیان
ژ خەباتا ناڤ کۆلخۆزێ بوو بلیان.
ڕۆژەکە سار، زیپک دباری عەردێ،
وا گوندێ مە، تو دبینی وێ تەپێ،
ئەم ورابوون و چرکینیا سار دهات،

عەرد و عەسمان هەر ئالیاڤا دنڤات
ژ دەست بۆمبا، گولا، تۆپێ هار،
یێ کو زیپکی ژۆردا دهاتنە خار؛
مەری نکاربوو سەری دەرخە ژ تیپیا
هەر ئالیا ڤا گولە گورتی دزووکیان
جەنگ گەلەک بوون، لێ تو جارا جەنگێ وا
نەقەوییە ل تو دەورا، ل تو جیا؟
پاشێ فریتسا کریە گازی و هەوار،
بەر ب مە هاتن ئەو جەلاتێ خوونخور،
ژ وان چیتەک کەت، یا دن ڕابوو و قیژیا
خوونا وان ژی ل عەردێ سار نخم پژیا.
لێ ل بەر من شەش فریتسێ بێ ئامن
ژ جی ڕابوون و برکرن قەستا من،

من ئاگر کر، یەک کەت، یێ دن وێ شووندا
گوڵە من کەت عەرد سنجری بن مندا
بەر چەعفێ من عەسمان بوو عەرد زڤری
ڕۆنکایی بەرە بەرە تەمری،
ئەز بەستێ مام، نۆلی مەیتێ دەمنی.
کزبەتێ من یەکی دەستێ خوە ئالاند،
ئەز کشاندم بووزێ برین بەرکاند،
من چەعف ڤەکر، ڤیژیام نۆلی گۆرا چیا.
دوژمنا زوو ئەز دبرمە ئالیێ خوە
لێ ڤر تەیار، ئەو تەیارێ دل جەگەر
بانزدا ورا هەرچار کوشتن ب ڕکا گەرم
و ئەز ئانیم، لێ نشکێڤا بوو گورین
تانکێ «پلنگ» سەر مەدا زوو دخوری
لەزمک مابوو، لێ وێ شووندا خو زانی
نها تەڕا شرۆن دکر ڤی جانی.
تەیار ڤرا بوو پلنگەکی شپووک،
مینەک هلدا مچقیبوو دەڤدا تووک،

و شوولکی بەرب هەژدادێ ب لەزی،
مین گرێدا ل بەژنا خومیە نازی،
خوە ئاڤێتە بن تانک بەلووی، عەردێ ما!
و ئالاڤێ تەوشە وی زوودا بەر خوە.
بەرێ ژی هەبوون عەگیت، مێرخاس و بەدەو،
لێ مێرێ وا دبوو نێتا خەونا شەڤ،
ئەز تەڤزیم، ژ من دکشیا خوونا ئال،
پۆر سەرێ من بووبوو پەنیرێ ڕیچال،
من دێ ئانی بیر دێ شیرنە و دەلال؛

نزام چما وەختا مرن بەر چەعڤە
تێ بیرا تە ئەڤینتیا دێ و باڤە
مەرڤ ترێ ئەو مرنێ هێسا بە.
من تو لەزا ئوندا نەکر خوە گومان.
و چەعڤنهێریا هەوار و گازیا دمام،
وێدا دکر بەر ئیشقا خوە دوومان.
کۆ هێسابم ژ فکرا دووره و نەخێر،
لێ تەوشێ تەیار، ئەو تەیارێ نۆلی شێر،
بەر چەعڤێ من دبە خایێ جلەتێ،
و پۆلارا دکە سەفەر حوجەتێ.
و ئەو ورا مر، عەگیتێ مە.

لێ وێ شووندا هەڤالا ئەز ئانیم مال،
برین ساخبوون، کوتا بوو سەفەر و قال.
کێ چەعل کۆلا، ئەو خۆخوە کەتە چەعلێ،
نۆلی حرچا کەتی تەلا ناڤ دەعلێ.
و ناکا من کریە قەسەم و قەرار،
حەتا ساخم روو دونیایێ، ئەز هەر جار،
ژ کولیلکێ نوهـ بهارا مە رەنگین
ئەز تەیاررا تێکم هێکەلا بەنگی.

هاتنە خار چەند هێسر ژ چەعڤێ پیرێ
بەر ب قیزێ چوو و ئەڤینتی گۆتە وێ:
«تەبیەتا مە دەولەتی یە، دەولەتی!
ژ وێ دوەلدن عەگیت وەلاتێ مە کشکیدا
و قەوزەک گول وە ژی چنی، گولێ ئال
و دانی سەر تربا خۆرتێ مەتایار.

١٩٤٧

## عەتارێ شەرۆ

### عەتار و ئاڤ

ئاڤا زەلالە ڕەنگ هێشین،
هێ دوخولخولی شۆردا تێیی
بەسە بکە هەوار و گمین،
ل بەر تە تێ ئاڤدانێ ئەکن و زەڤی،

ل دەشتێ کۆلخۆزا حەموو ئالی،
هیڤیا تەنە ڕەز و قنیات
ئەوێ ل تە بڤنە ئاڤی
تو شێن دکی بەرب وەلات.

جەم وە دنیا شەڤ و ڕۆک،
هین شێن دکن وەلاتە مە ،
بەر وە نە زاڤۆد و ئاشێ بتۆک.
کارێ ژ وە دستینن کۆلخۆزێ مە.

### وەتەنێ مە

وەلاتێ سۆڤێتستانێ دەلال،
ب هەبوونا مەزن تو بوویی بەر،
تە شەوق ڤەدایە چەوا شەمال،
تو ب ڕوکونبا بوویی ملکێ جەبار.

تو وەتەنێ مەی گەلە شیرن،

ل ناڤ ته ئەم دخەڤتن ب چەعف و گاڤا
ب سەرکاریا حوسنێ پۆلا ستالین،
تو شیرنی مەڕا ژ دێ و باڤا.

وەتەنێ مەیی مەزن شێر و زۆر،
ئەم ته خوەی دکن مینا شێرا
هەنە ناڤ تەدا ل هەزارا عەگیت
تو مەڕا ملکی دیسا ژ مەڕا.

تو وەتەنێ مەی عەسل دێ،
دەربێ خەدار ژ مه بەرب دژمن:
ئەوێ کو خراڤی بەرب ته بێ.
تو وەتەنێ مه، شیرنێ مه.

## عەمرێ کۆلخۆزا

ئەو کار–هەبوونا مال ژینێ،
تڤقیه عەمرێ شای ل ڕوو دنێ،
تەمام گوندی و هەر باژارڤان
ب وێ هەبوونێ دڤنه قایل و خنێ.

ب خێڤاتا سۆسیالیستییه عەزیز،
چەوا ب محوبەت هەڤرا بن خۆرت و قیز،
تەڤ–هەڤ شا دڤن ب ئەشقا دلا،
یان ژی وەکه حزکرنا ئۆرتا دو برا.

عەمرێ کوبار تەڤ شەمالێ،
پێشدا وەرمق دده سال ب سالێ،
خەڤات دقەده قەومتا تۆکێ،
کرنا دەهـ ڕۆژا دکن ڕۆکێ.

ل سەر عەردێ، بن عەزمانێ هێشین،
ب کاڤێ مەزن دقەدن پلان،
ب سەرکاریا حوسنێ پۆلا ستالین
سۆسیالیزمە ئیدی مەڕا زممان.

## ڤیزا بەدەو ب خوە خەڤاتچی

ب مێزمکرنا ئەشق و دلا.
کەزیێ زێرین ل سەر ملا،
کوبار-کوبار هە دململی،
بەردا بەردایە جۆتەک گولی.

ئەو ڤیز نین بوو، جەمالەکە زمر،
ژ فابریکێ دهاتە دمر،
مینا شکلەکی ل دکانا،
گولی ژۆردا هاتبوونە سەر بستانا.

حەوەس تێ ب وێ ڕێڤاچوونا مەش،
ئەنیا کەڤەر دێمێ فرە قەرقاش،
مەری نە نان بخوە، نە ئاڤێ
تەنێ ل وێ بکە سلاڤێ...

دلێ من ب شابوون کەلیا،
ئاقل و سەودا ژ سەرێ من فریا،
ب وێ قزکا خەڤاتچیە دمربدار،
ئەز شاش و حەیری مام بەندموار،

م دلێ خوە زمڤت نەکر،
چوومە پێشیێ، من ژێ پرس کر:

– وەرە بێژە من گلیێ ڕاستی

تو ژ کیدەرێی و ژ کو هاتی؟

ب زمانێ نەرم لێڤێد تەنک خەبەردا

هێدی-هێدی ئەوێ جاهبا پرسێ من دا،

ب گلی و خەبەردانا وێ یە شیرن،

ئەز ئوسا شا دبووم، ڕوحێ من بووڤوو گولێ بین.

شۆفێر ئاڤتۆدا سەکنانﺪنێ،

کەرەمکە! گۆ، ئاڤتۆیێدا ڕوونێ!

ڕەنگێ ئاڤتۆیێ دبرقی کەسک شین،

دەرکەتبوو ژ زاڤۆدا سەر ناڤێ ستالین.

ژ جی ئۆردام ڕابوو گولیزەر،

ئاڤتۆیێدا ڕوونشت دەستوور خوەست،

تەزە ئەز بوومە دل خراف و سەوداسەر،

من ترێ خەونەکە، من دیتیە ب قەست.

ئەو دیتنا ڤیزێیە ب قیمەتی،

من ژ وێ هلدا مەعریفەتی،

ل بەژن بالێ قاماتێ تەمام،

ئەز جیدا شاش و حەیری مام

ئەو ڤیزا کورمانجە خەڤاتکار،

ب سەدا ڤیز کربوونە دەربدار،

ب بۆلشیڤیکی دکر خەڤات،

ب خوە ژی بژارتیبوون دێپووتات.

## بۆنا ناموسێ ئەو خۆرت چوو

وێ تارێقا چل و یەکادا،
فاشیستا پێ خوە ل گوهـێ خوە دا،
ومتەن مەی مینا گولا گەش
ئەوانا ئاڤیتنێ لەپێ خوە یە ڕەش،

ئەو فاشیستێ گێرمانە لەپ گور،
مینا سەیێد برچیە و بێ هونر،
دادانە سەر وەلاتێ سۆڤێتستانێ
لێ ب خوە کەتنە ناڤ قەبرستانێ.

ب هونرێ ستالینێ مەزنی پۆلا،
جەندمکێ فاشیستا مانە دەشت و چۆلا،
ئەوانا خوە دانە جێرباندنێ،
ل سەر چەرمێ خوە هاتنە هنجراندنێ..

ئەو شەرێ سەر ستالینگرادێ،
چارنکال دژمن ها دهاتێ،
ل فاشیستا بووڤوو هەوار،
ئەو تالانچی بوون مینا سەیێ هار.

ئەو خۆرتێ لێیتێنانتی توونسز،
بەرب دژمن ڤەکربوو ئاگر و بەیسووز
دژمن ل کووچا هەڤ دگەراند
جەندمک ل سەر جەندمکا وەلدگەراند.

فاشیست هاتنە ڕاقەتاندنێ،
وی شەریدا خۆرت هاتە کوشتنێ،

ئۆردیا بۆلشیڤیکا حجووم لێدان،
ب میلۆنا حەیفا خۆرت هلدان.

## کەوێ

بێر ها بێر، پەزدا بێری،
دەرگیستیێ وێ ل ئەسکەریێ،
کۆفیا ب لقاف خەملا سێری،
حەڤت سال تەمام بوو چەعقنەهـێری.

شنگ ها شنگ هری با دا،
ب ڕەنگێ قیچک ملک زەندا،
دەستا و پێشا کەدا شیرین،
ب ئەشق و حەواس دکە گمین.

مینا گولا ل زۆزانا،
کەو ب خوە قیزا کۆلخۆزڤانا،
بەر چادرا گەورە سیسە،
قیز ب ڕەنگا دتەیسە،

دەڤ و درانا خەبەردانێ،
گولیێ ڕەش ل بەر قەتانێ،
وەرەق ددن مۆریێ نارینج،
خەمل هاتیە سەر کتانێ.

ب ئۆرداما چەعف و کاڤا،
ئەنیا کەڤەر دەوسا زێرا
نامووس خوەیکریە وەکە کاڤا
سوورەت سۆرن دەم-دەمێرا.

کەوا بەدەوە ئەسل زادە،
ئەو گەردەنا خالە و نیشان

زێر ل سێری بوونە شەعدە
خۆرتێ قمەرێ لێ بڤە مێڤان.

خەڤاتا شیرین دایە بەر خوە،
حەتا بەختێ وێ ژێ نەبرە،
ناڤێ مێرکرنێ نایینە سەر خوە،
خۆرت ژ ئەسکەریێ ڤەنەگەرە.

ل ناموسا وێ بەلەدن خاس و خام.
سەر دستێرتێن دنیا و ئوم.
ئەو سەرکارا فێرما کۆلێکتیڤێ،
شەمال ددە وەکە ڕۆژ و هیڤێ.

ئەو سینگ و بەرێ خالی دەفتەر،
هێڤشاندیە بۆنا خۆرتێ ئەسکەر،
ناموس نە پەرەتیە، کو ئەو بکرە
لێ ئەو دوور و کوور خوەرا دفکرە

سوورەتێ وێ سۆر تەڤی خالە،
ئەشق و محوبەت ژێ دبارە،
کەوا بەدەو کۆمسۆمۆلە
ناڤ خەڤاتێ ئەو دەربدارە.

مینا گولا ل سەرێ چیا
محوبەتێ دکە دلێ حەمیا،
ئەڤینیا دلا دکە بێتال،

ل سەر کوولتووریٚ ئەو بیە هەوال.

شەڤەکە پایزا وەکە جەبار،
وە شەڤێ بێ گومان ڕازا قیزا دەلال،
ل سەر کەت حسەکە نەناس،
ئەو جیدا بوو ئاڤ و ڕوساس.
ژ خەریبیێ مێڤانەک هات،
دەری کوتا ب دلە ڕەعەت،

جارەکێ نەرم گۆت: کەوێ
دەری ڤەکە ل مێڤانێ شەڤێ...

کەوە حەزنگ ڕاهشت ب دلێ کوور،
دەنگ ل بەر گوها بوو خەونا دوور...
دیسا نێتا خۆرت کەتە دلێ وێ.
ئێ، گۆ، کێ گازی من بکە ڤێ شەڤێ»

خۆرۆت ل خوە نانی سکان،
جار ماین دەنگ دا، گۆ، کەوێ جان
هشیار بە ژ خەوێ...
ئەزم مێڤانێ تەی شەڤێ...

چوو دەری ڤەکر کەوا قیز،
ژ دەردا چوو ئەو خۆرتە عەزیز،
ب دیتنێ هەڤدو نازکرن،
بێ قەیاس هەڤ حەمێزکرن...

## بەسە قەلەن

لێ ئەو چەوا دل بوون نەحـەليان،؟
يان پۆلا بوون جيدا نەتەقيان،؟
خراڤ بە حالێ بەرێ و تونە بوونـێ،
ئەو ژی بەرانبەر بوو وەکە مرنێ.

باڤێ زلفۆی بێ ئینساف،
ئەوی ڕوحـێ خوە دانيبوو مەيدانێ،
قرار کربوو و دخوەست قەلنێ زەعف
بۆنا قەلن و قيز فرۆتانێ...

ئەو ڕۆژە، خازگينيە ڕوونشتينە،
خەبەرددن ژ قەلنێ زلفۆ
کا وێ چقاس قەلن بستينە،
لێ تکە-تکا دلێ سێڤدينە.

ئەو باڤێ بێ ئينساف و بێ کێر،
تەنێ ناڤ قەلن بری دەهـ زێر،
گۆ قيلەنێ من ژی چل می نە
هەسپ و زين ژی یێ ڕیسپی نە.

یێ، ژ کو بينە سێڤدينێ بەلەنگاز،
عەيانە، وەکی ناقەدە ئەو مراز،
... ڕێ و نێت ل سێڤدين بوونە قات،
خێنجی وی قەلنی دیسا هەیە سێ خەلات.

خۆرت زانە مال تونە ل بەر دەری،
قيز ژی زانە ئەو مراز ناچە سەری.

ئەو عەدەتێ کەڤنی بێقەیاس
وێ کو بقەدە ئەو مراز؟

خازگینی ژ مال دەرکەتن پۆخسیدە،
بێ، گۆ خراڤ بە ئەو ناڤێ ل سەر تە.
ئەڤ شخولەکە نەهەقە بێ ئیتباریە،
کێ ب قەلەنا حەتا نها تێر خواریە؟

زلفۆ د حالێ خوەدا کرە پۆرە-پۆر،
تەزە دلێ وێ بوو پەلەت ئاگرێ سۆر.
سێڤدین ئاخێن کر ب کەوگری ڕابوو،
دلێ وی ژ ئاخرییێ زەعف سار بوو...

دیا وێ قیزا دەلال،
سەر مێرێ خوە بوو هەوال،
گۆ من کریە مەرێ نیڤکوشتی
بۆنا تمایا دنێ، ئەو بەدەو

دیسا وەکلاند دیا پیر،
وێ ئەوقا قەلان کو بینە؟
ئەو بەلەنگازێ فەقیر،
لێ قیزک ئاشکەلا وی دستینە.

مێرک، وەرە گونا مەکشینە،
مرازا ژ هەڤ مەقەتینە،
ئینسافا نەهەقییێ ژی نابە،
برا قیزکا مە مرازا شابە.

نابە! هێرس کەت ئەو بێ ئیمان،

دێ و ڤیز جیدا هش بوون و مان...
ژ کەربا تەشی هلدا و بادا،
لێ دلێ وێ ب ئاگر مینا کوورێ حەدادا.

خۆرت دخوەست ڤیزێ برەڤینە،
لێ تەک مێرمیە پشت-بەزا وی تونینە،

باڤێ ڤیزێ بێ ئیساف
ڤیز دفرۆت ب پەز و دەوار.

ئەو ڤیزا خەملی ژ سۆر و گولاڤێ،
جێر هلدا، ب کوبار مەشیا ئاڤێ.
سێڤدین دیت ڤیز وێ لەز تێ،
ئەو هێدیکا بێر ب وێ چوو، سەرێ رێ

ئەوانا تەڤ چوونە سەر کانیێ و بەر زنارا،
دیسا ب کێف و حەنەک وەکە جارا...
لێ مخبوور هەبوون ل سەر وان...
ب ئەڤینیێ ترس نەدهاتە بیرا وان.

ئەوانا ئوسا خوەرا کر تڤدیر،
نشکێبا شک چوو دلێ دایکا پیر،
ێ، گەلۆ زلفۆ، چرا ئەگلە بیە،
دڤەک ئەوێ سێڤدین هەڤدو دیە؟

ئێ، چ بکە هنداڤا خوەدا زەعف دترسە،
زانبوو تەڤ سێڤدین ڤیز ئەگلە بوو،
گۆ وەی، تو وەرە ئەو بێ ئیمان پێ بحسە؟
رابوو قەستا کانیێ کر و بەر بێ چوو.

هه خه‌به‌ردا خوه‌ڕا و داخوشیا ژێر،
گازی کر نه‌رم: زلفۆ، زلفیا،
ته چرا ڤرا بێخوه‌ی هشتیه ئه‌ڤی جێر؟
وه‌ره، پۆر-کور دنیا ل ته حسیا!

ئاپێ زلفۆڕا گۆتن گلیێ باش،
دلێ زلفۆ بوو گولا گه‌ش...
لێ ئه‌وێ نزان بوو جیێ سێڤدین،
بووڤوو مینا مه‌ریکه عه‌وته‌ر و دین...

سێڤدین ئیدی هلدابوو سالخێ وێ،
هما نه‌وێربوو به‌ر به وێ بێ...

دێ وه‌ختێ ئه‌وی ژی زانبوو ئینگلابه
دگۆ هێ برا ل وان ده‌را به...

ئه‌و ساله‌ک بوو زلفۆ ل کالێ بووڤوو چه‌عڤناس
هێ قه‌وماندنا خوه ل ور نه‌کربوو به‌عس.
ئیدی دیوانا ئازا عه‌فری ژ جمعه‌تێ،
عه‌مر بوو شایی ناڤ فرێقه‌تێ...

ڕۆکێ ئاپێ کال چووبوو نه‌حـیێ
زلفۆ لێ گوهه‌دار بوو، که‌نگێ بێ؟
ئه‌وێ دینا خوه تووژ دابوو ڕێ.
دیت، سیاره‌ک وێ بله‌ز داژۆ و تێ...

سیار هات ناڤا گوند، نێزیکی مالا،
پرس-کر ژ ده‌ر و جینارا:
کیژانه مالا ده‌ورێش؟
بنیشان داینێ، ئه‌وی ئاژۆت، هاته پێش.

پیرێ ژ مال دەرکەتە دەر،
خۆرتەکی مەحبووبوو سەکنی ل بەر،
سەلام، دیا پیر، خۆرت گۆت!
ئەلێکم، سەلام، پیرێ گۆت.

پاشی هەڤ حەمێز کرنێ،
پیرێ پێ هاتە حساندنێ،
وەکی ئەڤانا سەر هەڤ بەنگینە،
بەرێدا ب دلە ئەڤینی نە...

ئێڤارێ ئاپێ کال ژ نەحیێ هات،
ئەو ژی پێ حسیا و شابوو
سبێ هەردارا کرە کێف و دەوەت.
ئیدی مرازێ هەردو ئەڤینیا بوو.

## ئووسیکێ بەکۆ

### زەڤیا کۆلخۆزا مە

چقا شینە زەڤیا مە،
چقا ئەشقە دلێ مە،
تو کولیلکا گوندێ مە،
بەژندە، شینبە زەڤیا مە.

ب خەملە، تژی بە،
سەلام تەڕا، زەڤیا مە،
هەر سال هاسلەتێ ددی مەڕا،
تو زەڤی تونە سەر تەڕا!

وەختێ بهارا شین دبی،
مینا کولیلکا بین ددی،
تو زەڤیا مە یە کوبار،
تو نازکی، ئامندار.

لێ هاڤینێ سەرگران،
سملێد تێ یە تژی نان،

چقا باشی تو حەیران،
تە ڕازینە کۆلخۆزڤان.

داینا تە یە گەلە گران،
ژ چۆلێ دبن کۆلخۆزڤان،

تژی دبن عەمبارێ مە،
تو گومانا دلێ مە.

لەما ژی ئەم شەڤ و ڕۆ،
ئەشق و کوبارن هەر ڕۆ،
کلاما تە ئەم دسترێن،
ئامنیا خوە تە دسپێرن.

چقا شینە زەڤیا مە،
چقا ئەشقە دلێ مە،
تو کولیلکا گوندێ مە،
بەژندە، شینبە، زەڤیا مە!

## ٨٠٠ سالیا مۆسکڤێرا

سەلام، مۆسکڤا عەزیز،
گۆمانا دلێ مە،
ڕۆنایا چەعڤێ مە،
نەفەسا بەر مە،
تو کانیا عەمرێ مە،
مەرکەزا نێتا مە،
ستەیرکا عەزمانێ مە.
بازارێ براتییێ،
تو سەروێریا ژیینا مە
کوباریا وەتانێ مە!

ژ چیایێ ئەلەگەزێ
من کولیلک ئانییە،
ڕەنگ-ڕەنگ، حەموو بینا،

ژ وی چییایێ، کێ دەرێ
دفریا تەنێ تەیرێ
سیمر، کوبار، فرۆنە.

ناڤێ چیێنە «ئەلەگەز»
کۆلۆز سپی ژ بەرفێ،
ناڤ کولیلکێ خەملاندی،
پاتشێ گەلیا و کانیا
شەعدێ بەرێ و نها.
کالامێر، دنیا دیتی،
چیایێ بلند سەر سپی.

ئەو کولیلکێد، کو من
بۆنا تە ئانییە،
ئیزنا جمەتا
مە یە بەرێ بین.

ئیزنا عەمرێ کەڤن،
عەمرێ زەلوولتیێ،
یێ بن بەرفا حەتا
حەتایێ گران.
نەپەدیایی، سەرم، سار
تو جارا شین نەدبوون،
نە بلند دبوون،
نە بین ددان، نە رەنگ.

تو جارا تەعڤێ گەرم
نێدکر ئەو ئیزنا مە،
تو کەس نە دشەوتی

سەر وان ڕوحبەرا،
حوکومەتا بەرێ
گوهـ نەددا وانا،
نەخەندیا، بێ ئەختەریا.

ئاوا، بن تەڤا تە یە
گەرم ڕوهـرەهەم، ڕۆنای
بن شەوقا تە یە زەلال،
بن دەنگێ ستالینێ
مەزن، باڤ و برا،
ئەو کولیلک هێشین بوونە
و ڕابوونە نها
بێن خوش بوونە، کوبارن.

بن ئازایا فرەی
بن کانستیتووسیا ڕۆنای،
ئەو کولیلک خەملاندنە
چییا، جەو، کانیا و گۆلی،
گۆڤۆند گرتنە،
دەڤ کەنن، شا دڤن،
و ناڤێ تە ددن.

جاسمێ پێخەسی شڤان
ئیدی ناخەڤتە بۆنا
دەوێ ترش، زکەکی نان،
ئیدی ناڤێژە «ئاخ.
ئاخ، پشتا من، باڤۆ»!
ئەو پێشدا هاتیە

ناف جێرگێد مەریا .

بۆنا ستالینێ مەزن،
بۆنا تە مۆسکڤا
بۆنا وەتەنێ مە یە
حزکری و شیرن،
تەڤ هەڤالێد ئورووسا
ئووکرایینا، بێلۆرووسا .
و گەلە ملەتێد ئوسا
ئەم ژی ڕابوون پیا
تۆپ بوون ژ گوندا گەلیا، چییا،
ژ بانێاڕا و حەموو جیيا .

مە سۆندا مەزن خاربوو
سۆز دابوو ستالینێ
عەزیز و مەزن
حەتا دژمن ئالت نەکن،
حەتا یێرا خو ئازا
نەکن، تو ڕەحەت نەڤن
ب خوونا خوڤە سۆر
مە ئەو سۆز قەداند
وەعدەکی چەتن و زۆر:

نها لاییقی مەریێ
ئالت کرنە بەرەمبەر
هاتمە عەیدا حەیشتسد سالیا

تە بڤینم ئەز حەیران.
تو، مۆسکڤا، گولگەش،

ژ سینگێ ئەلەگێزێ
ژ چییایێ بەرفا قەرقاش،
ئانیە کولیلکێ بینخوەش،
یێ بن تەڤا تە یە
حزکری، گەرم و خوەش
ڤەبوونە و گرتنە
گەلی چییا و کانیا
ئانیە تەرا پێشکەش!

خاترێ تە، باژارا رۆنکایێ
تو نازکی، تو سەرکاری،
ئیرۆ نینە مە تو بیر ئانی،
ئەڤ کولیلکا تەرا ئانی
ناڤێ تە، سەر لێڤێد مە،
قەوات و نێت بین بۆنا مە.
ب ناڤێ تە و بۆنا تە،
مێ ئالت دکر نەیارێ تە.
ئەو، ناڤێ تەی کوبار
بین سڤک، چەوا بهار،

نێزیکی دلێ مە، ئامندار.
رییا خوەر و دوور نێزیک دکر،
بەرفا قورنا دحەلینە،
چەعڤێ دژمنا دەرتینە.
بەرا هەبوونێ یە بۆنا مە،
باڤ و برائەیە بۆنا مە
ئولم و زمانە بۆنا مە.

ئەز، وەکیلێ جمعەتا مە،
دیسا وێ بێمە جەم تە،

و کۆلیکێد تەزە بینم،
کووچێد هێ تە بخەملینم.
ڕکنێ ڕۆنکایێ، ئولما.
خوەستنا من ئەوە، کو
هەرتم بسەکنی تو
حەزار-حەزار قورنا،
شەڤقێ، ڕۆنای بدی
وەتانێ مەڕا.

گومانا دلێ مە،
ڕۆنایا چەعڤا مە،
نەفەسا بەر مە،
تو کانییا عەمرێ مە.

١٩٤٧

## میکاییلێ ڕەشید

### پایزا ئێریڤانێ

پایزە، پایز هێسا و هێنێک،
چقا بەدموە ئەڤ شەهەرێ مە،
باخێ وێ زێرن، باخێ وێ ڕندن،
کیە مینا مە بەختێوار و شا!

تو، شەهەرێ مە، چقا بەدەوی،
چقا عەزیزی تو دلێ مەڕا
ئاخ، چ بخازی، حەموو ژی تە ڕە،
ڕوحێ من تەڕا، دلێ من تەڕا!

### زەڤیا کۆلخۆزێ

زەڤی چ زێرە و چ بلندە،
باکی تەنک وێ سەڕا دگەرە،
زەڤی دهەژە مینا بەرمکێ،
جان، ئوسا هێدی، نازک و هێسا.

و کۆمبایین ناڤا زەڤیا زێردا
هێدی تێ-دچە و نان ددە هەڤ.
هان، چقا زەعفە ئیسال نانێ مە
ساڤا وی نانی کی ناخەڤتە!

# خەزال

**سیما سەمەند**

---

نەشەرتهوکوم

یێریڤان ١٩٦١

СИМА СӘМӘНД

# Хәзал

Нәшәрмһөкөм
Еревин
1961

# خەزال

بهار بوو، بهارا ئەلەگزێ یە گولینە هێنک.

کێ چوویە ئەلەگزێ زەعف رِند دکارە بیر بینە وی وەعدێ جنەتی، وی وەعـدمیی ، گاڤا کولیلکێ وێ دبشکڤن، گول-سۆسنێ وێ شین دبن، ئێ کو رِوح ددنە مەرڤ. لێ خولە-خولا ئاڤا کانیێد وێ یە سار، کو بەلا دبە دەشت و مێرگا، چیا و بانیێ وێ، ژ کیژانا ب سەوتەکە خوەش چیڤە-چیڤا چڤیکا و قبە-قبا کەڤۆتکا تێ، کو تەڤی دەنگێ کلامێد ڤیز و خۆرتا ددن و ناڤا پێلێ هەوێدا دچن و دگهیژنە هەیلۆ جیێ دوور...

ڤی جیێ جنەتیدا نە گوندێ ئەلەگەزێ. چار چارنکالێد وی چیا و بانی نە، ژ ئالیێ مفرقێ ڤا بلند دبە و کۆلۆزێ چیل و قەرقاش سێری تێ خانێکرن چیایێ ئەلەگەزێ.

بنەلیێ ڤێ دەرێ گشک ژی خەباتهزن و مەریفەت.

چڤا رۆژە سبێ شەبەڤێ هەر کەس لەز بەر ب خەباتێ، بەر ب دەشت و فێرمێد کۆلخۆزێ دچە.

سبەکە بهارێ یە خوەش بوو، کۆلخۆزڤانێ گوندێ ئەلەگەزێ دلەزاندنە بەر ب خەباتێ.

ب لەز ئوسا ژی دو هەڤال-کارێ و خەزال دچوونە خەباتێ.

لێ کارێ مەلوول بوو. خەزالێ نهێری کارێ مەلوولە و خەبەر نادە دەست خوەدا ژێ پرس کر: – کارێ، چرِا ئوسانی، دڤە دیا تە، باڤێ تە، ناهێلن؟

خەبەردانا خەزالێ هێ دێڤدا کارێ گۆت:

– ئاخ، خەزال، ئەز ئیشەڤ قە رِانەزامە، حەتا نیڤێ شەڤێ مە ئوسا بەر هەڤ دایە، باڤێ من ناهێلە ... ئەوی کتێبێ من گشک قەلاشتن، چ بێژی ئانی سەرێ من و دیا من. دڤە: 'نا کو نەبوویە، گەرە ڤیزا من ئیدا هین نەبە، حەتا کۆما دەها خوەندیە بەسە، ڤیز چ یە، وەکی خوەندنخانا بلنددا هین بە .

خەزالێ گاڤا ئەڤ یەک سەکر رِساسەکە سار سەری حەتا بنێ لنگا هاتێ، چەعڤێ وێ تژی هێسر بوون، لێ خوە زەڤت کر، کارێ حەمێز کر، بەر دلێ وێدا هات.

– کارێ، تو لاپ ئەڤسەنەیی، ئیژا چ، زەعف ژی جارەکێ گۆت، تە ترێ وێ نەهێلە؟ باڤێ

من ژی دگۆت ناهێلم، لێ ئەز و دیا خوە، ب لاڤا دیلەکا هاتنێ، حەیران، حەتا ئەو قاییل بوو ڕوحێ مە کشیا. تو قە گومانا خوە نەبرە، وێ بهێلە، ئەزێ ژی بێم لاڤا لێ بکم. دە بەشەرا خوە خوەش کە، ئوسا لێڤ–لۆیەر ئەز نکارم تەڕا بێم، وێ بێژن چکا مە شەر کریە. ئەوێ کارێ حەمێز کر، ڕامووسا و هەردا ب کەن چەعڤێ هەڤ نهێرین تەیێ بگۆتا هەردا ژی دخوەست بگۆتا: هەڤالتی چقاس شیرنە.

وێ دەمێ پش واندا دەنگێ لنگا و خەبەردانێ هات، گاڤا ئەوانا پارا زڤرین خەباتچیێد برگادا وان–قاچاخ و باخچۆ نێزیکی ڤیزا بوون، سبەخێری دانە وان و تەڤایی چوونە دەشتێ.

کارێ و خەزال نێزیکی هەڤالێد خوە بوون و ب کەن گۆتن:

– سەلام، هەڤالنۆ، وەڕا قەوات بە!

– سەلام، سەر چەعڤا، سەر سەرا، – وان جاب دا، پاشێ یەکێ پرسی:

– گولنۆ، هوون کو بوون، چرا دەرەنگی کەتنە؟ وەلە بێی وە ئەم مەلوولن.

– ڕاستی ژی هوون گولێد بریگادا مە نە، – برگادیر ئاڤاکیان گۆت.

– دە بەسە حەنەکا مە بکن، دها ڕندە ئەم بخەبتن. هەردا گۆتن و ب دێمەکی گولین دەست ب خەباتا خوە کرن.

کارێ و خەزال ب کەن و چەعد دخەبتین.

ئەوانا شالکێ سەر شالکێ پنجار ژ ناڤا زەڤیا تۆپ دکرن و ڤالا دکرن. حەتا قاچاخ و باخچۆ قووچکەک تۆپ دکرن دبرن سەرێ کەوشان، ئیدا ئەوانا قووچکا دنێ بلند دکرن. حەتا وەختێ نانێ نیڤرۆ ئەوانا ئوسا ب حەواس دخەبتین، لێ قاچاخ و باخچۆ، تە هەو دنهێری دسەکنین، هەڤڕا ب هێرس خەبەر ددان. وەختێ نانێ نیڤرۆ هەر دو ئیدی کرت و کال کەتبوون. ئەوانا ڕوونشتن و هەڤڕا خەبەر دان. باخچۆ ب پرچووکری قاچاخ نهێری و گۆتێ:

– قاچاخ، ئەڤ گشک کرنا تە یە، تە ئەم کرنە ڤی ئاگری، عەسە گەرە بال خەزالێ بخەبتی، تە یا من بکرا، ئەمێ بال سینەمێ و مەیۆ بخەبتیانا. ئەوانا خوە مینا ڤان بێ خودێیا نین، دڤینی چقا ڕەحەت دخەبتین.

ڤانا مالک مە خراب کریە، پشتا مە کرنە بەر مە. کورۆ، تو قە گورا من ناکی، یەکە خەزال تو جارا تە ناستینە، وەلەه پەردا کۆرا هاتیە بەر چەعڤێ تە، تو ناڤینی ئەو قە نزانە

تو هەیی یانێ تونەیی. لێ، ئەز تەڕا ڕاست بێژم، ئەو قە سێڤا دەڤێ تە نینە. کورێ، ئەوێ تە تی بڤە سەر ئاڤێ، تی ژی بینە. ئەو خوە قیز نینە، ئاشیتە-ئاشیت! تو چ دبێژی، مەعروم، تو نکاری ب وێ مێرانیا خوە خەباتێدا وێڕا بگهینی، بنهێر، ئەم کرت-کال کەتنە، لێ ئەوانا ئێدا قووچکەک بلند کرنە قاسی بەژنا تە و قە نەوەستیانە ژی.

– باخچۆ، بەس نینە قال-بال خەبەردی، من جارەکێ تەڕا گۆتیە، ئەز گەرە وێ قیزێ بخوەزم، هەرکێ ئەو من نەخوەزە، ئەزێ وێ برەڤینم، ئەزێ ... ئەزێ ...

وێ دەمێ خەباتچیێد دنێ گازی وان کرن، وەکی هەرن نان بخون.

خەزال و کارێ ژی هاتن. خەباتچی گشک تۆپ بوون سەر هەڤ و ب ئیشتەکی خوەش دەست ب نانخوارنا خوە کرن.

بەر ئێڤار بوو، ژ دەشتێ کۆلخۆزڤان ڤەدگەریانە مالێ. دوور ڤا دەنگێ کۆلخۆزڤانیان شیرن، کلامێد قیز و خۆرتا دهاتە بهیستنێ.

کەڤانیێد کۆلخۆزێ ڤێدرۆ ملێ وانادا بەر ب فێرما چێلەکا دچوون، خەزال و کارێ ژی ژ خەباتێ هاتن. گاڤا خەزال هاتە مالێ، دێ ڕاموسا، ڕوونشت نانێ خوە خار. دێ قەی بێژی تشتەک دخوەست بگۆتا قیزا خوە، لێ دنهێری و جارەکە دنێ بەر خوە ددا. گاڤا خەزالێ نان خار خلاز کر، دێ گۆتێ:

– دیا قاچاخ-هەنێ، مالا مە بوو، گەلە خەبەر بەر منڕا ئاڤیت دەرهەڤا تەدا، ڤردا خەبەر دا، وێدا خەبەر دا، لێ من تشتەک ژێڕا نەگۆت. ئەوێ پاشێ ب کەن گۆت، وەکی ئەمێ زووترێ ببنە خنامیێ هەڤ. وێ ڤان ڕۆژا بێنە خازگینیێ تە.

خەزالێ، کو ئەڤ یەک سەکر، هێرس بوو و دێڕا گۆت:

– دایێ، تە گەرە ژێڕا بگۆتا، وەکی بادیهەوا نەیێن، خوە سڤک نەکن، و وی کورێ خوە، قاچاخە چ کورەدەرە شیرەت کە، ئەو هێ زارۆیە، گەدە، ئەو چیە، زەواج چی یە، چەعڤ بەژن-بالا کورێ خوە کەتنە، لێ نزانن دارا پووکە، بێ هش و فەرەسات. دایێ، ئەم جیکی دخەبتن و ئەز ویە ڕند ناس دکم، ئوسایی جانکەسرە، ئوسایی قورە و قوتانە، تویێ بێژی ئەوە کو هەیە. ئەز حەتا ئەوی ددمە خەباتێ ڕوحێ من دکشە، ئەو ژی ژ من زەعف ڤەدکشە. لێ خەباتچیێد دنێ کەسەک نکارە لێ خەبەردە، ئوسا جابا وان ددە، وانا بێحورمەت دکە. و هەما سەبا وی خەیسەتێ وی ئوسا بەر چەعڤێ من ڕەش بوویە، من ترێ نانێ بەر پارا من دخوە. زەعفی بێخەیسەتە.

– لێ خەزالا من، مالا وانا خوەشە، تو چرا دەرهەقا ویدا ئوسا دفکری، هەلە چاهلە، وێ ئاقل بە، ئەز چاوا دێ تەڕا دبێژم خۆرتەکی نە خرابە.

– ئاخ، دایێ جان، وەختێ من مێرکرنێ نینە، من تەڕا گۆتیە دخومزم هین بم. ئەز هەلا زارۆ مە، ئەزێ هین بم ببم دۆختر.

– دۆختر؟

– ئەرێ ئنێ جان، ئیدا ناهێلم، وەکی سەرێ تە بێشە، ئەزێ تەڕا جوورە-جوورە دوو و دەرمانا هازر کم، وەکی ڤەخوی و پاک بی.

– گلیکی ڕندە، ڕاستی ژی تشتەکی پاک بوویی، لاوۆ، هوون چقا بەختەوارن، وەکی دژین وەلاتەکی وایی ئازادا، کیدەرێ تو فرقی ئۆرتا ژن و مێرادا تونە. لێ بەرێ ... تشتەکی عەتب بوو، وەکی قیز دەرهەقا خوەندنێدا دوشورمیش بوویە، هەما هنەکی بەلەنگازا چەعڤێ خوە ڤەکرانا، ژ دنێ فەعم کرانا، دەست خوەدا وێ بدانا مێر. بێ قە پرس دکرن گەلۆ قیز دخوەزە، یانێ نا. هەگەر دێ و باڤێ وێ دخوەستن، ئیدی قیز چی یە، ئەو ددانە مێر و ئەو ژی خوە نە مێرکرن بوو، وەڵە هەما دفرۆتن. تە دیت ئێڤارێ ٥-٦ گرەگرێ گوند هاتن و دەست ب ئارشڤێرشا خوە کرن، بێیی ڕازیبوونا قیزێ. باڤێ قیزێ دگۆت بیست پەزە قەلەنێ قیزا من، یانێ دگۆت پانزدەهـ حەزار و ئاوا باڤێ کور و قیزێ حەتا نیڤێ شەڤێ بەر هەڤدو ددان. پاشێ وەختا ڕازی دبوون گازی قیزێ دکرن گوستیلەک، شەعرەک پێڤا دکرن و دچوون، ئیدی نەدپرسین گەلۆ ئاخریا وان وێ پاشێ چاوا بە. لاوۆ، ئەو بێبەخت بوون. هاقا چاهلێد ئوسا چوونە، یەکێ خوە کەربا دکوشت، یەکە دنێ ژی نکاربوو دەستی وان دەردا تەیەمیش کە جارکە دنێ ڤەدگەریا مالا باڤێ، یەکێ ژی ژ دۆر بەرێ خوە شەرم دکر، ئوسا ب دەرد و کول عەمرێ خوە دەرباز دکر. ئاها لاوۆ، ئەڤ بوو عەمرێ مە یی بەرێ. هوون بەختەوارن، بەختەوار، وەکی دژین ڤی وەلاتێ ئازا دا.

– ئەرێ دایێ، ئەز ڕازی مە، زەعف ڕازی مە ژ عەمرێ خوە، بۆنا وێ یەکێ ئەم بۆرجدارێ لێنینێ مەزن و پارتیا کۆموونیستیێ نە، گەرەکێ ئەم بۆنا خەباتێ تو قەواتا خوە نەهێڤشینن. گەرەکێ ئەم ڕند بخەبتن، وەکی سەربەست وەتەنێ خوەدا کۆموونیزمێ چێکن.

– لاوۆ، خوەدێ تەڕا بە، هەرکێ تو حەڤەکی من شا کی، من ڕۆژێ گران، دەرد و کول

زەعف دیتنە، زەعف هاتمە زێراندنێ، هەرکێ تو دەوسا وان دەردا دەرمان کی، دیا خوە شا کی ڤیزا من.

خەزال نێزیکی دێ بوو، حەمێز کر.

– ئەرێ، دایکا منە عەزیز، ئەزێ حەموو تشتی بکم، چقا دەستێ من ڤا بێ، وەکی دایکا خوە یە عەزیز شا کم. ئەز نها مەزن بوومە و حەموو تشتی فەعم دکم، ئەزێ ئوسا بکم، وەکی ڕۆژێد خوە پاک دەرباز کی، وەکی حەزار حەڤ خوەزلا خوە تە بینن...

زەینەڤێ گلیێ ڤیزا خوە سە دکر و دلێ خوەدا شا دبوو، گەلۆ ئەڤ خەزالا وێ یە و هێسرێ شابوونێ مینا تەڤیێ تەیرۆکێ ژ چەعڤا دبارین.

– دە ڕابە، ڕابە، کەڤۆتکا من، بەسە، ڕابە خوەدێ تەڕا بە، ئیدی نیڤێ شەڤێ یە ڕابە ڕازێ، وەکی تو سبێ زوو ڕابی، دەلالیا من.

تەعریبانا سبێ بوو، گاڤا زەینەڤ ڕابوو، هەرە تەولا دێوێر، ئەوێ گاڤا دینا خوەدا جیێ خەزالێ، ما تما، –خەزالە پشتگرێدای سەر جیا ڕوونشتبوو و کتێب دێستدا دخوەند، ئەو ئوسا نڤۆیی ناڤ خوەندنێ بووبوو، وەکی تەخمین نەکر، کو چاوا دێ نێزیکی وێ بوو، کێلەکێ ڕوونشت.

– خەزال، ڤیزا من، نە تو گونەیی، چرا ها سەرێ خوە دکی، چقا ڕۆژا حالێ تە ئەڤە، هێ چەعڤێ سبێ ڕۆن نەبوویە تو ئیدا ڕوونشتی دخوونی.

خەزال چەعڤێ خوە یە ڕەشە نۆلی حەبێ تریا ژ کتێبێ بری دێ نهێری، ئەو حەمێز کر.

– لێ، چاوا، دایێ جان، بێ چەرچەرمنک نکاری بگهیژی مرازێ خوە. ئەز دخوەزم ببم دۆختر، بۆنا وێ یەکێ ژی گەرە بچەرچرم، هین بم، وەکی بکاربم ئینتهامێ قەبوولکرنێ بدم.

زەینەڤێ کرە نچەنچ، سەرێ خوە هەژاند.

– دە ڕەبێ ئالەمێ مرازێ تە بینە سێری و ئەڤ جەڤێ تە دەیا نەچە، لاوۆ، ئەز چ بێژم؟ دێ گۆت و ڕابوو چوو. خەزالێ دیت، وەکی حەتا خەباتێ وەعدێ وێ هەلا هەیە، جارکە ماین نڤۆیی ناڤ خوەندنێ بوو. ئیمێ سەحەتەکێ ئەوێ ئوسا خوەند، گاڤا نهێری ئیدا وەعدێ خەباتێ یە ڕابوو، هاهانگا ئەو دەر دانە هەڤ، دەر سڤدەر گێزی کرن، ڤێدرۆ هلدا و چوو ئاڤێ. هەما وێ دەرێ ئەو ڕاستی کارێ هات، یا کو دلەزاندە مالا وان. ئەوێ کو دوور ڤا خەزال دیت، لێ کرە گازی:

– خەزال، زوو بکە، دەرمنگە! ئەو لەز نێزیکی وێ بوو، هەردو تەڤایی چوونە مال، خەزالێ ئاڤ ڤالایی کورن کر، دەرێ کورن گرت، دو–سێ نانێ تەندووریێ یە لۆش هلدا چوو کۆخ بال دێ، یا کو کۆخدا دەو دکلا.

– دایێ، ئەز دچم، چ خوەڕا ببم بۆنا تەشتێ؟ زمینەڤ هاهانگا چوو و ژ سیتلا قاتخ تێدا مەیاندبوو تۆئێ سەر نۆلی زۆلێ چەرم سەرا گرت، کرە ناڤا نانێ لۆش پێچا، پاشێ جیکی تەرکی ڕوونێ بەرکلێ ژی کرە ناڤێ پێچا و دا خەزالێ.

– هان، قیزا من، دە هەرە، حەتا نیڤرۆ دیا تەیێ نانێ تە بینە. خەزالێ نان دەستێ دێ گرت و ژ کیلەرێ دەرکەت. سڤدەرێدا ئەو ڕاستی مەجیتێ باڤێ خوە هات، ئێ کو پەز و دەوار ڕاست کربوو و هاتبوو مالێ. مەجیت، کو چەعڤ هەردو هەڤالا کەت، ب کەن گۆت:

– سبا وە خێر، قیزێد دەلال، هوون بلەزینن هەرن سەر خەباتێ، ئەرێ؟ دە هەرن، هەرن، وەعدێ وە و خەباتێ هندک ما، هوونێ دو–سێ مەهێ دنێ شووندا هەرن خوەندنێ و مە تەنێ بهێلن.

– حەڤ خوەزل وێ ڕۆژێ،– هەر دو قیزا هەڤڕا گۆتن و چوونە خەباتێ.

گاڤا ئەوانا گهیشتنە جیێ خەباتێ هێوەرزە کەتبوو ناڤ خەباتچیا، ئەوانا جیکی تۆپ ببوون نەدخەبتین. خەزالێ و کارێ چەعڤێ هەڤ نهێرین، دخوەستن پێ بحەسیانا گەلۆ چ بوویە، لێ هەردا ژی تاقەت نەدکرن ئەو پرس بدانا هەڤ. ئاوا هەردو ژی کەر و لال بوون بال هەڤالێد تۆپ بووی و حەتا کڤشێ چ قەومیە. خەباتچی گشک تۆپی سەر قاچاخ و باخچۆ ببوون. سەرێ باخچۆ گرێدای بوو و بەر لاچکێدا خوونا گەڤەز دابوو دەر. ئەوی خوە ڤردا–وێدا با دکار، لێ ئەو بەرنەددان. قاچاخ ژی خوە خورووشی وی دکر، لێ ئەو ژی بەرنەددان. قیزکا خەزالێ و کارێڕا گلی کرن، وەکی قاچاخ پیان هاتیە دەشتێ و چاوا تمێ ناڤ هێشناییێدا ڕازایە. باخچۆ هاتیە دینا خوە دایە ئەوی پیانە، گۆتیێ، وەکی هەرە مالێ، چمکی سەدر، یانێ ژی بریگادیر ببینن نە پاکە. وێ دەمێ ئەو ڕابوویە، چێری باخچۆ کریە و حیتەک هلدایە دایە ناڤ قافێ باخچۆ.

خەباتچی گاڤا ڤێ یەکێ دبینن، دچن ناهێلن ئەوانا هەڤ خن و گازی بریگادیر دکن. ئەڤ نە جارا پێشن بوو، کو قاچاخ ئەڤ نەنەرمت دکرن. لەما ژی خەزالێڕا ئەڤ نە تشتەکی تەزە بوو. وێ دەمێ، دوور ڤا سەدرێ کۆلخۆزێ، بریگادیر و چەند خەباتچی بەر ب وانا دهاتن.

ئەوانا چەعقێ هەڤ نهێرین، سەدر قاچاخ و باخچۆ نهێرین، پاشێ پرس-پرسیار ژ خەباتچیا کر. ئەوی گۆتە خەباتچیێ دنێ، وەکی ئەوانا بخەبتن. لێ باخچۆ و قاچاخ وێرا هەرن گوند و گۆت، وەکی پاشی خەباتێ خەباتچی گشک بێنە کانجیلەرێ، جڤاتێ. گاڤا ئێڤارێ خەباتچی گشک تۆپ بوون، سەدر دیسا ڕابوو چەند خەباتچیا پرس کر، پاشێ خوە خوە خەبەر دا، وەکی خەباتچیێ نۆلی قاچاخە ترال و سەرخوەش کۆلخۆزێرا نە لازمن. سەروێرتیێ قرار کریە کو نەهێلن قاچاخ کۆلخۆزێدا بخەبتە، حەتا حشێ وی نەیێ سەری، سەر ڕیا ڕاست نەسەکنە.

خەباتچیا گشکا ئەو قرار بەگەم کرن.

خەزالێ سۆز دابوو کارێ، وەکی بەرێڤارێ، پاشی خەباتێ، هەرە مالا وانا و دەرهەقا هینبوونا وێدا باڤێ وێرا خەبەر دە. گاڤا ئەو گهیشتە بەر دەری دەنگێ مەرێ نەناس ئەودا سەکناندنێ. ئەو خێلەکێ بەر دەری سەکنی، پاشێ چوو هوندور. سڤدەرێدا ئەو ڕاستی دیا کارێ هات، یا کو گاڤا خەزال دیت، زەعف شا بوو. ئەوێ خەزال برە مالێ بال کارێ. کارێ مەعدەکری بوو، سۆرۆ-مۆرۆ ببوو، مێش بەرا بچوویا وێ ئالەپەرچەیی ببوویا. ئەو بەر ب خەزالێ هات خوە ئاڤیتە پێسیرا وێ و بوو ئیسکە-ئیسکا وێ.

– خەزال، من تەڕا نەدگۆت، باڤێ من ناهێلە ئەز هین بم؟ تە دیت گلیێ من چاوا ڕاست دەرکەتن؟ هەلا سەردا ژی من دەە مێر، دەە یەکی ئوسا، کو من عەمرێ خوەدا ئەو نەدیتیە، نزانم کی یە، کی نینە؟ هەما سەر ڤان گلیادا بوو چرینا دەری و برۆیێ باڤێ کارێ دەردا هات. ئەوی کو دیت کارێ دگری تامارێ ئەنیێ تەڤهەڤ بوون، ئرنەکی ئوسا هاتێ تەیێ بگۆتا وێ ڤێ سەحەتێ پەرچە-پەرچەی بە. ئەوی چەعڤێ خوە کارێ جنوو کرن و کرە ئرین.

– قانجخ، بەس نینە تو من سەکەسز کی، تو حەتا کۆما دەها چووی، تە کوتاکر ئیدی بەسە. ئەز ناهێلم، تو هەری خوەندنێ، ئەو ژی پێرێڤانێ، تەنێ، ناڤا مێرادا... ها-هوو، قەی من سەرێ خوە دانیە ئاخ بەرێ سار، ئەرێ؟ کیژان قیز کو دخوەزە هەرە هین بە ئەوە نە ڕێڤانە، بێ خوەیە، لێ ئەز، برۆیێ شەمۆ، ساخی نەمربم و قیزا من تەنێ هەرە جیێ دوور. نا قوربا، ئەو یەکا نابە. خەزالێ کو ئەڤ یەک سەکر، ئرنێ وێ ڕابوون، ئەوێ ئیدا نکاربوو پاشی هاقا ڕەحەت خەبەر دا.

– ئاپێ برۆ، ئەز ئیسال دەهـ سالە تە ناز دکم، تێم-دچم چاوا قیزا مالێ و من تو جارا

باوار نەدكر كو تو گلیێ ئوسا بێژی.

خەزالێ ئەڤ گلی گۆتن، کەلۆگری نێزیکی کارێ بوو. ئەو ڕامووسا.

- کارێ، دەلالیا من، - خەزالێ دلشەوات گۆتێ، - گلیێ تە ڕاست بوون، من نەزانبوو باڤێ تە ... ئەوێ گلیێ خوە کوتا نەکر و دەری ڤا دەرکەت.

وێ شەڤێ حەتا بەربانگێ خەو نەکەتە چەعڤێ خەزالێ. ئەو دوشورمیش دبوو، گەلۆ چاوا بوو حالێ کارێ. کارێ ژی هلبەت وێ شەڤێ قە ڕانەزا، ب گری، ئاخ، کەسەر سبە سەر خوەڕا سافی کر. تەعریبانا سبێ ئەو ڕابوو هاهانگا کنجێ خوە خوەکر، گوستیلکا کو کربوونە تلیێ کەوکیی قوتیێ کر و ڤێدرۆ هلدا چوو ئاڤێ. ئەوێ ترێ وێ خەزالێ وێ دەرێ ببینە، لێ نا، خەزال هێ نەهاتبوو ئاڤێ، چمکی زەعف زوو بوو.

ئەوێ ڤێدرۆیێ خوە تژی کرن، پۆر-پۆشمان ڤەگەریا مالێ. گاڤا ئەو هات دیا وێ ئیدا ڕابووبوو، گاڤا ئەوێ کارێ دیت شا بوو، ب کەن گۆتێ:

- قیزا من، چ تە قەومیە ڤێ تەعریبانا سبێ چوویی ئاڤێ؟ تو شەڤێ دنێ دەرمنگ کەتی جی هنەکی، خوەڕا ڕازای. کارێ جابا وێ نەدا و چوو هوندور. ئەوێ ئەو دەر دانە هەڤ و چوو بال خەزالێ. خەزال ئەو حەفتێک بوو نەدچوو خەباتێ، چمکی هازر دبوو، وەکی چەندەکی دنێ هەرە یێرێڤانێ ئینتهامێ قەبوولکرنێ بدە.

بەر خەزالێ تژی کتێب و تێتراک بوون دنڤیسی، دخوەند، گاڤا ئەوێ کارێ دیت شابوونا لنگێ وێ عەرد نەگرت، بەر ب وێ چوو، حەمێز کر.

- وی، کارێ، تە چ ئاقلی کر، وەکی هاتی، من نکاربوو بخوەندا. ڕاستە من دەڤتەرێ دنهێری، لێ ڕوحێ من بال تە بوو، دە زوو بێژە چاوا بوو، ئێڤارێ چ ئانین سەرێ تە؟

- خەزال، چرا ئەز نەبێژم تو نزانی چ کر، ئەز دامە مێر، کوتا بوو چوو، چاوا خوەست ئوسا ژی کر، نها ئەز نزانم چ بکم، بێژە چ خوەلیێ سەرێ خوە کم؟

خەزالێ نزانبوو چ جاب بدە، چ بکرا. ئەوێ دلۆڤانی کارێ نهێری.

- کارێ، خووشکا من، ئەز چ دکارم بێژم، چ کو مە قرار کربوو نەهاتە سەری، نها ژی ئەز چ دکارم بێژم؟ گاڤا باڤێ تە مەریکی ئوسانە، کو تەنێ خەبەرا خوە دکە، گەرە تو ژی ئوسا بکی، چاوا کو ئەو دبێژە. ئەوانا ئێپێجە خەبەر دا، پاشێ کارێ ڕابوو چوو خەباتێ، لێ خەزال مالدا ما و بۆنا ئینتهاما هازر دبوو.

چەند ڕۆژێ دنێ شووندا خەزال ڤەرێکرن. تەڤی هەڤال-هۆگرێد خەزالێ ڤاچاخ ژی

هاتبوو خەزالێ ڤەرێ کە، لێ خەزالێ قە گوهنەدا وی. قاچاخ کەر و لال وێ دنهێری و قەلن سەر قەلنێ دکشاند.

***

مەها ئاڤگووستێ یە، مەها هاڤینێ یە هەرە گەرم، بن بایێ گەرمدا بەلگێد دارا یە هێشین هێدی دچوون و دهاتن. ڤێ مەهێ بەر دەرێ کیژان ئینستیتووتا پێرتڤانێ بنهێری تویێ ب سەدا شاگرتا ببینی، ئێد کو هاتنە ئینتهاما بدن، وان خوەندخانێد بلنددا هین بن.

بەر دەرێ ئینستیتووتا دۆختریێ جاهل بەرەڤ ببوون و پرس ددانە هەڤ، تە قەی ترێ یەکی دخوەست قەوەتا ئێ ماین زانبوویا، ئەو بجێرباندا. بەر دەرێ ئۆتاخەکێ وەکە سی-چل قیز و خۆرت بەرەڤ ببوون. وانا ژ کیمیایێ ئینتهام ددا. ئیدا پێنج-شەش خۆرتا ئینتهام دابوون و قیمەتێ ڕند ستەندبوون، لێ "زەعف ڕند" هەلا کەسەکی نەستەندبوو.

– ئەز زانم ئەو قیزکا بەژن بلند وێ "٥" بستینە، تێ کڤشێ، وەکی ئەو ڕند هازر بوویە،

– خۆرتەکی دێمقەمەر ئاوا گۆت، ئێ کو ژ قەلیشتەکا دەرێڕا هوندورێ ئۆتاخێ دنهێری.

– دستینە برا بستینە، قەی دبێژی وێ ژ حەسابێ مە دستینە، – یەکی ماین جابا وی دا. ئاوا وەختێ خەبەردانا وان ئەو قیزکا بەژنبلندە چاڤرەش ژ ئۆتاخا ئینتهاما دەرکەت. سوورەتێ وێ نۆتلانی حەبێ هنارا سۆر ببوون، ژ شابوونا نزانبوو چ بکرا. دەست خوەدا هەڤالێد وێ تۆپی دۆرا وێ بوون و ژێ پرس کرن:

– تە چ ستەند؟ – "پێنج" – کوبار ئەوێ گۆتە قیز و خۆرتا.

– دە ما خاترێ وە، وەرا ئاچخیا دخازم، وەعدێ ئینتهامێد ماین ئەمێ ڕاستی هەڤ بێن.

ئەو قیزک خەزال بوو.

ئاوا ڕۆژێد ئاڤگووستێ یە گەرم دەرباز بوون. خەزالێ بەرێ ڤا ئینتهامێد خوە زەعف ڕند دان و -ئێ ئاڤگووستێ تەڤ خلاز کرن. ڕۆژترا ماین ناڤنیشا وان مەرڤا دیوارێ ئینستیتووتێ خستبوون ئێد کو هاتبوون قەبوولکرنێ. دۆرا وێ ناڤنیشێ گەلەک خۆرت و قیز بەرەڤ بووبوون، ژ وانا نیڤی مەعدەکری بوون، نیڤی ئەشق بوون.

خەزال ژی ور بوو. ئەوێ ناڤنیشێ نهێری و ناڤێ خوە دیت، شابوونا بەنگزێ وێ بی شورەت تەیبسی. پاشێ تەڤ هەڤالا خوە یە سێدا یێ، کو وەختێ ئینتهامێد قەبوولکرنێ هەڤڕا ببوونە ناس، ب سۆقاقا ئابۆڤیانێڕا بەرژێر بوو. وان هەردا قرار کربوو، وەکی وێ

ڕۆژێ ڕند بگەڕن، هەرنە تێئاترێ.

ڕۆژترا ماین خەزال ب دلەکی شا چوو ئەلەگەزێ و پێرا-پێرا چوو جەم کارێ. وەختێ کارێ حەسیا ئەو هاتیە قەبوولکرنێ ب دل هەڤالا خوە پاچ کر و بمبارەک کر. ناڤا وان چەند ڕۆژادا، کو خەزال گونددا ما، ئەو دیسا ڕەحەت نەما، دچوو بریگادا خوە، کۆمەک ددا خەباتچیا.

٣١ێ ئاڤگوستێ یە، خەزال تەڤی هەڤالێد خوە بەر ئاڤتۆبووسێ سەکنی بوو، خەبەر ددا، پاشێ خاترێ خوە ژ وان خوەست ئاڤتۆیێ سیار بوو. ئاڤتۆ هێدیکا ڕێ کەت، پاشێ با گرت، ناڤا دەشت و چیایێد ئەلەگەزێرا بەر ب یێرێڤانێ قل بوو. چەند سەحەتێ دنێ شووندا خەزال ژ ئاڤتۆیێ پەیا بوو، ترامڤایێ سیار بوو و بەر ب ڕازانخانا ئینستیتووتێ چوو.

١ ئێ سێنتیابرێ یە، سەحەت نیڤێ هەیشتانە. ئیرۆ سفەتێ بازارێ یێرێڤانێ ب جارەکێ ڤا هاتیە گوهاستنێ، سۆڤاقێد وێ تژینە ب خۆرت و قیزا ڤا، ئێد کو ب کەن هەڤڕا خەبەر ددان و بەر ب ئینستیتووتا، تێخنیکوما و مەکتەبا دچوون. خەزال ژی ناڤا واندا بوو. ئەو تەڤی هەڤالێد خوە بەر ب ئینستیتووتا خوە یە حزکری دەمشیا و شیرن-شیرن وانڕا دەرهەقا ئەلەگەزێدا شرۆڤە دکر.

سەحەت هەیشتە، زەنگلێ سالا خوەندنێیی پێشن لێدخە، لێ ئەو نە زەنگلێ مەکتەبێ بوو، ئەو زەنگلێ عەمرێ تەزە بوو بۆنا وان خۆرت و قیزا، ئێد کو وێ سالێ خوەندخانێد بلنددا تەزە هاتیە قەبوولکرنێ، ب وی زەنگلی ڤا نوسا ژی عەمرەکی تەزە ڤەدبوو خەزالا کوردڕا.

دەرسخانەکە ئینستیتووتا دۆختریێدا سەر ڕوونشتووکا خوەندکار ڕوونشتبوون، ناڤا واندا نوورس، ئەرمەنی، گورج، ئادربێجان، کورد و وەکیلێد ملەتێد ماین هەبوون، گشکا مینا مەرڤەکی گوداریا لێکتۆر دکرن. پاشی دەرسا سێدایێ و خەزالێ ملێ خوە کرنە ملێ هەڤ و ب ئەشق بەر ب ڕازانخانێ چوون.

ئاوا ڕۆژێد خوەندکارا پەی هەڤ دەرباز دبوون. زووترەکێ بوو جڤاتا تەشکیلەتا کۆمسۆمۆلا و خەزال بژارتن چاوا کاتبا تەشکیلەتا کوورسا وان. خەزالێ تەڤی هینبوونێ خەباتا مەخوولقەتیێ ژی دکر، کۆمەک ددا وان هەڤالێد خوە، ئێد کو ژ دەرسا شووندا دمان.

ڕۆژەکێ جڤاتا تەشکیلەتا کۆمسۆمۆلا دا خوەندکارا پرس دانی، وەکی خەزال کۆمەکێ ددا ئاحمۆ و ئانیکێ. پاشی وێ جڤاتێ مەرڤ هەر گاف دکاربوو بدیتا چاوا خەزال و ئەوانا تەڤایی ڕوونشتی هین دبوون، هازری ئینتهاما دبوون.

ئینتهام دەستپێ بوون، ئەمەکێ وان هەر سێکا دمیا نەچوو، جماعەت ڕاست دبێژە: " چ باڤێژی تە وێ ژی بچینی". وانا ئینتهامێد خوە زەعف ڕند دان.

ڕۆژەکێ ئاحمۆ نزیکی خەزالێ بوو و گۆت:

– خەزال من بلێتێ ئۆپێرایێ کڕیە، وەرە ئەم تەڤایی هەڕن.

– تو زانی، وەکی سبێ ئینتهاما مە یە پاشنە، حەتانی ئەم ئەوێ ژی نەدن ئەز ناچمە جیکی، ئوسا ژی گەرەکێ تو نەچی، نها هەرە جارەکە ماین ژی ڕند بخوونە. ب گلیکی ئەم ئیرۆ ناچنە جیکی.

ڕۆژترا دنێ ئینتهاما پاشن ژی زەعف ڕند دان و هەما وێ شەڤێ ئەوانا ب کۆم تەڤایی چوونە ئۆپێرایێ.

پاشی ئۆپێرایێ ئەوانا ب ئەشق خەبەر ددان و بەر ب مالێ دچوون، لێ خەزال و ئاحمۆ هێدی–هێدی دوو وانا دهاتن. ئاحمۆ دگۆتە خەزالێ:

– خەزال، تو جار ئەز عەمرێ خوەدا بیر ناکم هەڤالتی و دلۆڤانتیا تە، وێ کۆمەکداریێ، کو تەدا من. خەزال، ئەز دخوەزم وەختێ کانیکولێ هاڤینێ تەرا نەما بنڤیسم، تەواقە دکم جابا من بدی.

– ئەو چ گلی یە، – خەزالێ گۆت، – لێ مەرڤ جابا نەما نادە؟ هلبەت ئەزێ جابا نەمێ تە بدم.

ئەوانا گهیشتنە ڕازانخانێ، خاترێ خوە ژ هەڤ خاستن و بەر ب ئۆتاخێد خوە چوون.

ئاحمۆ نشکێ ڤا کرە گازی:

– بباخشینە، خەزال، تویێ کەنگێ هەری؟

– سبێ نا دوسبا. دە شەڤا تە بمینە خوەش!

وێ شەڤێ ئاحمۆ قە ڕانەزا و بەر خوەدا دوەکلاند " سبێ نا دوسبا" و جارەکە دنێ دوشورمیش دبوو. نشکێ ڤا ئەو ڕابوو ناڤ جیادا ڕوونشت. ئەوی خوە–خوە خوەرا دگۆت: " نا، ئەزێ سبێ بێژمێ، ئیدی بەسە چقا من خوە کەر کر، نا، ئیدی نکارم تەیامیش کم،

ئەز گەرەکێ بێژمێ، یانێ نا دو رۆژێ دنێ شووندا وێ هەرە".

ئاحمۆ رابوو، لەمپووشکە ڤێخست، کاخەز دانی بەر خوە و دەست پێ کر نەمە خەزالێرا نڤیسی. وەختێ کوتا کر جارەکە دنێ ژی خوەند.

ئاحمۆ نەمە دیسا خوەند، خلاز کر، پاشێ قەت کر کرە بن بەعلگیێ خوە، وەکی سبێ بدە خەزالێ. ب وێ فکرێ ژی ئەو رازا. سبێ زوو رابوو، ژ بن بەعلگی نەما خەزالێ دەرخست، جارەکە دن ژی خوەند، لێ ڤێ جارێ لێ خوەش نەهات و قەلاشت.

"نا، ها نابە، گەرەکێ ئەز خوە-خوە بێژم دبە هنگێ ئەو فەعمکە، ئەڤ کاخەزا، دەوسا دلێ ئەڤینی شەوتی چ دکارە بێژە"؟ ئاحمۆ وا فکری و ژ مال دەرکەت. وەختێ ئەو دەرکەت خەزال و سێدا ژی پەیا دبوونە ژێرێ، زەمبیل دەستێ واندا دچوونە بازارێ. وەختێ ئاحمۆ ئەو دیتن ئیدی بیر کر، وەکی ب چ فکرێ ژ مال دەرکەتیە و بەشەرخوەش بەر ب وان چوو.

– سبا وە خێر، ڤێ شەبەقێ ئاوا لەز هوونێ کودا هەرن؟

– ئەمێ هەرنە بازارێ، دخوەزی تو ژی وەرە، – خەزالێ گۆتێ و سۆر بوو. ئاحمۆ ب ئەشق تەڤی وان چوو. ئەو رەخ خەزالێرا دچوو و تە قەی ترێ دنێ یا وی یە. کاڤا گهیشتنە بازارێ وانا ئێمیش کرین و ڤەگەریان هاتنە مالێ. رێ ڤا سێدایێ گۆت، وەکی سەحەتا یەکێ گەرەکێ هەرە مالێ و ئەو چوو.

وەختێ ئاحمۆ و خەزال تەنێ مان تەزە ئەوی بیر ئانی، وەکی گەرەکێ چ بێژە خەزالێ.

لێ هەما وێ دەمێ خەزالێ گۆتە ئاحمۆ:

– ترامڤای هات، دە ئەم هەرن. ئەوانا چوون و ئاحمۆ ئوسا ژی نکاربوو تشتەک بگۆتا خەزالێ. رۆژترا ماین سبێ زوو ئاحمۆ چوو ئۆتاخا خەزالێ بۆنا وێ ڤەرێ کە.

ئەو چوو ئۆتاخێ سبەخێریدا خەزالێ و گۆت:

– خەزال، ئیدی سەحەت ٨-ە، زوو بکە ئەم هەرن.

– ئەز ژی هیڤیا تە بووم، ئەز هازرم.

ئاحمۆ، سێدا و خەزال ناڤا ١٥ دەقادا ئیدی گهیشتنە ئاڤتۆزێ. ئەوی هوور-مووری خەزالێ جیوار کر و پەیا بوو، لێ خەزالێ دەستێ وی گرت و گۆت:

– ئاحمۆ بباخشینە، من ئەڤا دو رۆژە زەعمەت دا تە، لێ بسەکنە، تو چرا ئوسا مەلوولی، تە چما رەنگێ خوە ئاڤیتیە، دبە بێکێفی؟

– نا، ئەز زەعف پاکم، لێ ...

– چ لێ، دە بێژە، چرا ناڤێژی، تو ژ من شەرم دکی، چی یە؟

–نا ئەز ناها نکارم تشتەکی بێژم، وەختێ ڤەگەری ئەزێ گشکی بێژم، گشکی و تویێ هنگێ بزانبی. سێدایێ چەعڤێ خەزالێ نهێری و خەزالێ ژی وێ نهێری، سۆر بوو و لەز ئاڤتۆیێ سیار بوو. خێلەکێ شووندا ئاڤتۆ رێ کەت. سێدا و ئاحمۆ ئەپێجەیی سەکنین و پەی ئاڤتۆیێ نهێرین، یا خەزالا وانە حزکری دبر دوور، ناڤ دەشت و مێرگێ ئەلەگەزێ.

ئاحمۆ کێلەکا سێدایێ سەکنیبوو و بێدەنگ–حس پەی ئاڤتۆیێ دنهێری، ئەوی بیر کربوو، وەکی سێدا بال وی یە. ئەو کەتبوو ناڤ متالا.

ئەو هاڤا وەخت ئوسا سەکنی حەتا کو ئاڤتۆ ل بەر چەعڤێ وی ئوندا بوو، پاشێ سەرێ خوە کرە بەر خوە و کەسەرەکە کوور هاتێ.

– چوو، مرازا من چوو، خەزالا من...

سێدا کەنیا، وی چاخی ئەو ڤەجنقی، سێدا یێ نهێری و شەرم کر، لێ سێدا یێ ملێ خوە ملێ ویرا کر.

– تو ژ من شەرم نەکە، ئەز خووشکا تە مە، لێ، ناها ئەم هەرن، دەرەنگە، دوشورمیش نەبە، خەزالێ زووترەکێ دیسا بێ. سێدایێ دلۆڤانی گۆت. و ئاوا ئەوانا چوون. ئاحمۆ هاتە مالێ، هوور–مووریێ خوە گرێدا، کارێ خوە کر و ئەو ژی سبەترێ چوو ئارتاشاتێ– مالا خوە.

***

ئەو حەڤتێک بوو، کو خەزال گوند بوو. دیا وێ نەدهێشت، وەکی جیکیدا هەرە.

چقاس ئێڤار بوو ئەو کێلەکا دێ باڤێ خوە روودنشت و وانرا دەرهەڤا عەمرێ خوەندکارادا، دەرهەڤا یێرێڤانێ و بنەلیێ وێدا، دەرهەڤا سێدایێ، مالا وان، دێ و باڤێ وێدا، کو گەلەکی حەیفن، گەلەکی مەریفەت و زەعف ژێ حز دکن، شرۆڤە دکر. ئەوێ ئوسا ژی گۆت، وەکی سێدا دقەومە ٣–٢ رۆژا بێ بال وان. ئەوێ تمێ پرسا کارێ ژ دێ باڤێ خوە دکر. کارێ ئێدا سێ–چار مەهـ بوو جامووشڤانێ مێر کربوو.

خەزالێ زەعف دخوەست ئەو بدیتا، لێ نزانبوو چ تەهەری. ئەوێ رۆژەکێ دیا کارێ دیت و پرسا کارێ کر و پێ حەسیا، وەکی چەندەکی دنێ وێ بینن زەمیی. خەزالێ کو ئەڤ یەک سەکر زەعف شا بوو ب ئەشق هاتە مالێ گۆتە دیا خوە.

دیا وێ ژی گەلەکی شا بوو، چمکی ئەوێ ژی کارێ حز دکر. خەزال چەندەکی مالدا ما، لێ تاوەتی نەدکەتێ. هەڤالێد وێ دخەبتین، ئەو نکاربوو مالدا ڕوونشتا و قرار کر ئەو ژی هەرە خەباتێ، کۆمەکێ بدە هەڤالێد خوە. ئەوێ ئوسا ژی کر. ڕۆژا هەیشتا سبێ زوو ڕابوو و گۆتە دیا خوە، وەکی وێ هەرە دەشتێ و کۆمەکێ بدە هەڤالێد خوە.

وەختا ئەو چوو دەشتێ و نێتا هاتنا خوە هەڤالاڕا گۆت، ئەوانا پێشیێ قایل نەبوون، خەزالێڕا کرنە شەر وەکی ئەو هاتیە هێسابە، نە کو بخەبتە. لێ وەختا خەزالێ گۆتە وان کو ئەوێ دو مەها ڤرا بمینە و دخوەزە عەسە بخەبتە، تەنێ وی چاخی هەڤالێد وێ قایل بوون.

ژ وێ ڕۆژێدا دەستپێکری حەتانی ڕۆژا چوویینا خوە خەزال کۆلخۆزێدا خەبتی. وەختا ئەو ئێڤارا دهاتە مالێ نان دخار، ڕەحەت دبوو دیا خوەڕا شیرن-شیرن خەبەر ددا، لێ وەختێ دکەتە ناف جیا دکەتە ناڤا متالا، ئاحمۆ دهاتە بەر چەعڤا و گلیێ وی دهاتە بیرێ:
– "نا، ڤەگەرە، پاشێ".

تەڤا نیڤرۆ دقژلاند. ژ گوند دەنگێ کالە-کالا پێز، کو تەزە ژ چێرێ ڤەگەریابوو، دهات. پەزدۆشا دلەزاند کو زوو بگهیژنە بێریێ، لێ کەڤانیێ مالا دلەزاندن نانێ پالا زوو-زوو بشینن پاشێ هەرن گۆما پەز. وێ دەمێ ئاڤتۆبووسا یێرێڤانێ گهیشتە گوندێ ئەلەگەزێ. مەرڤێ ئاڤتۆبووسێدا تەڤ پەیا بوون.

حەموویا دەرەنگتر ژ ئاڤتۆبووسێ قیزەکە نەناس پەیا بوو. پێرا-پێرا دهاتە کڤشێ، وەکی ئەوە نە ژ ئەلەگەزێ یە، چمکی دۆر بەرێ خوە دنهێری و نزانبوو کی ئالی هەرە. ئاوا ئەوێ چەند دەڤا دۆر بەرێ خوە نهێری، وێ دەمێ چەند زارێد بچووک بەر وێڕا ب ڕەڤ دەرباز بوون.

ئەوێ گازی وان کر، کانڤێتدا وان، پاشێ ژ وانا پرسی، گەلۆ ئەوانا خەزالێ ناس دکن. زارا هەڤڕا کرە گازی، وەکی ئەوانا زەعف ڕند خەزالێ ناس دکن و زانن کیدەرێ ژی دژی.

ئەوانا پێشیا وێ کەتن و برن بەر دەرێ خەزالێ. هنگێ دیا خەزالێ بەر بێریێ بوو.

ئەوێ، کو دیت قیزکەک بەر ب مالا وان تێ و پێشیا وێ ژی برە زارۆ، پێرا-پێرا تێ دەرخست، وەکی قیزک نە ژ ڤان دەرانە. کاڤا ئەو نێزیک بوو قیزکێ سەلام دایێ و پرسا خەزالێ کر. هنگێ ئەوێ ژێ پرسی دبەک کو ئەو سێدا بە؟ قیزک کەنیا، زەینەڤ حەمێز کر.

- دایێ جان، ڕاستە، ئەز سێدا مە، تە چاوا تێ دەرخست، قەی خەزالێ گۆتیە، ئەرێ؟

زمینەڤێ ژی سێدا حەمێز کر، ئەنیا وێ ڕامووسا.

- لێ چاوا، دەلالیا من، خەزالێ هەر ڕۆ دەرهەقا تەدا گلی دکر. من ئیدا ب گلیکرنا وێ زانبوو تو ڤیزەکە هایی. لێ بسە تە چرا عەلامەتی نەدا مە، وەکی تویێ بێی، زانی ئیرۆ چەندەکە نەمێ تە نەدهاتن، ئەو بەر خوە دکەت.

سێدایێ جارکە مایین ئەو حەمێز کر و گۆت، وەکی عەلامی وان نەکریە، چمکی نەخوەستیە زەعمەتێ بدە وانا، وەکی بێنە بەر ئاڤتۆیێ، پاشێ ژی ئەوێ خوەستیە خەبەخەپ سەر خەزالێدا بگرە.

زمینەڤێ ئەو برە مالێ، گۆتێ، وەکی خەزالێ زووترەکێ بێ، ئەو سەر خەباتێ یە. زمینەڤێ نزانبوو شابوونا چ بکرا. ئەوێ سێدا دا ڕوونشتاندنێ، هاهانگا ئاڤ ئانی، مێڤانێ سەرچەعڤێ خوە شووشت، پاشێ نان دانی. سێدایێ خارن هندک خار، لێ تاسا ڤاتخ کشاندە بەر خوە و تێر خار. زمینەڤێ پەز بەرۆدەنۆ کر و بەردا، پاشێ دەست پێ کر شیر سێپێراتۆرێ خە، سێدایێ تەوەقە کر، کو ئیزنا وێ بدە وەکی ئالی وێ بکە.

زمینەڤ خاترێ وێ نەکەت و ئەوێ دەست پێ کر ملێ سێپێراتۆرێ بادا. کاڤا تۆخاڤک ژ شیر ڤەقەتیا ئالیکیدا هات و شیرێ بنی ژی ئالیێ دنێدا، سێدایێ نۆلی زارەکە چەعڤ خشمشکێ بەدەو کەڤە و فرناخ بە تماکار لێ دنهێری. ئەو حەتا بەرێڤارێ دەقەکێ ڕوونەنشت، بەر دەستێ زمینەڤێ دچوو-دهات.

گاڤا خەزال ئێڤارێ ڤەگەریا مالێ، سێدایێ خوە ڤەشارت و ژ زمینەڤێ هیڤی کر، وەکی تشتەکی نەبێژە. خەزال هات، سەرچەعڤێ خوە شووشت، ڕوونشت، دێ نان ئانی دانی.

- دایێ ژ سێدایێ نەمە نەهاتیە؟

زمینەڤێ وێ نهێری تەخمین کر کو ڤیزێ چقاسی شا بە، وەکی ئەو بێژە، بەلێ هاتنە، لێ ئەوێ خوە زەڤت کر.

- نا، خەزال، ڤیزا من، وەکی بهاتانا منێ پێرا-پێرا بدا تە. خەزالێ سەرێ خوە کرە بەر خوە.

- ئاخ، گەلۆ چما هاڤا وەخت ئەو نەما ناشینە، یانێ ژی نایێ؟ نا دایێ، هەبە-تونەبە، تشتەک سەرێ سێدایێ قەومی یە، یانێ نا ئەوێ تو جارا جابا نەما من ئەوقاس دەرەنگ نەدخست.

وی چاخی بوو پیرقینا سێدایێ و ژ پشت دەری دەرکەت. خەزالێ دەمەکێ وێ نهێری و ژ چەعفێ خوە باوار نەکر، چەعفێ خوە مز دان، گرت، ڤەکر، دیت دیسا سێدا بەر وێ سەکنیە و دکەنە.

هنگێ ئەو ژ جیێ خوە ڕابوو، هەڤالا خوە حەمێز کر، ڕامووسا، تەیێ بگۆتا ئەڤا دەهـ سالە نەدیتیە.

پاشێ هەردو هەڤال کێلەکا هەڤدو ڕوونشتن.

خەزالێ دەست ب پرس-پرسیارا کر، دەرهەقا هەڤال - هۆگرێد خوەدا، دەرهەقا مالا واندا. سێدایێ ژی پرس ددانە وێ و ئاوا حەتا نیڤە شەڤێ ئەوانا ئوسا ڕوونشتن خەبەر ددان. خەزالێ جیێ خوە و سێدایێ ئۆتاخا ژۆرێدا دانی و گاڤا گشک ڕازا بوون، سێدایێ نەرمێ خوە دەرهەقا ئاحمۆدا گۆتە خەزالێ، وەکی ئەو سەبا خەزالێ دین دبە. ئەوێ گۆت، وەکی پەی چوونا خەزالێڕا ڕۆژترا مایین ئەو ژی چوویە، لێ زەعفی مەلوول و دلشکەستی بوویە. خەزالێ دەنگێ خوە نەدکر، ئەوێ کەر-لال سەکر و دلێ خوەدا شا دبوو، کو سێدایێ خوە خوە دەرهەقا ئاحمۆ سەرێ گلیا ڤەکر. ئەوێ دخوەست، وەکی سێدایێ دیسا خەبەردا، لێ سێدایێ خەبەرا خوە کوهاست:

- خەزال، ڕاست بێژە، دلێ تە ئاحمۆدا هەیە؟ من زوودا تەخمین کربوو، لێ جولعەت نە دکر، وەکی ژ تە پرس کرا. خەزالێ باوار نەدکر کو سێدا پرسەکە ئوسا بدە وێ، لێ وەختا کو دابوو گەرە جابا وێ بدا.

- سێدا، ئەز هێ نزانم ئاحمۆ حز دکم یان نا، لێ تەخمینا من ئەز خێنجی وی ژ کەسەکی مایین حز ناکم، ئەو کورەکی باشە...

ئەوێ چەند گلی دەرهەقا قاچاخدا سێدایێڕا گلی کر، وەکی هنگێ ئەو ژ پێرێڤانێ هاتیە شەڤ ڕۆ تەرکا وێ ناکە، دچە-تێ دخوەزە خەبەر دە، لێ ئەو ناهێلە، گلیێ دنێ دکە ئۆرتێ. ئەوێ دەرهەقا کارێدا ژی، یا کو ئەو دو ڕۆژ بوو ئانی بوون زایی، گلی کر. و ئاوا حەتا بەر بانگێ وانا خەبەردا. بەربانگێ هەردو ژی خەورا چوون. خەزال شەبەقێ ڕابوو، چوو سەرچەعفێ خوە شووشت، گاڤا هات دینا خوە دایێ سێدا ژی ڕابوویە و جیا چێدکە. ئەوێ کر-نەکر وێ نکاربوو، سێدایێ جی چێکرن، خەزالێ ژی دەر سفدەر پاقش کر و هەردو هەڤال چوونە ئاڤێ.

وەختێ سێدا دەرکەتە دەرڤا بینا جنەتێ ژ مێرگ و دەشتا دهات. ئەوێ ئەو بینا خوەش

دکشاند، دۆر بەرێ خوە دنهێری و بەدەعوەتیا تەبیەتێرا، وان چیا بانیارا، وان گول سۆسنێ دەشتارا، ئێد کو رەنگ-رەنگی دوور ڤا دهاتنە کڤشێ فرناخ دبوو. سەر کانیا سار سێدایێ سەرچەعڤێ خوە شووشت و پاشێ ئەوانا ڤەگەریانە مالێ. حەتا ئەوانا هاتن زەمینەڤێ ئێدا تەشتێ هازر کربوو: هێکەروون چێکربوو، تۆیێ قاتخ، هنگڤ، شەلبکەک ژی تۆخاڤکا تەزە دانیبوو. هەردو هەڤالا تەشتیا خوە و تەڤایی ئەشق و شا چوونە دەشتێ.

خەزالێ سێدا خەباتچیارا کرە ناس، ئەو برە ناڤا زەڤیا، گەراند. سێدایێ کو دیت گشک دخەبتن، لێ ئەو سەکنیە، وانا دنهێرە، تەموول نەکر، لاڤا خەزالێ کر کو ئەوانا تەڤایی بخەبتن. پێشیێ ئەوێ نزانبوو ترمخ کرا، ترمخ ڤی ئالی-وی ئالی با دکر، لنگێ خوە دخست، گیها نەدکەتە بەر، لێ حەتا نیڤرۆ ئەو ئەپێجەیی هین بوو.

ب ڤی تەهەری سێدایێ ئێدا لنگێ خوە ژ دەشتێ نەبری، ئەو خەزالێرا دهاتە خەباتێ و وێرا ڤەدگەریایێ مالێ.

پاشی خەباتێ ئەوانا دچوونە بال کارێ، یانێ ژی کارێ دهاتە بال وان و حەتا دەرەنگ خەبەر ددان. کارێ خەزیا خوە خەزالێ و سێدایێ دانی. ئەوێ گلیێ مێرێ خوە، مالا خوە دکر.

– خەزال جان، تو نزانی باڤێ من چ ئانی سەرێ من. من زەعف ئەو خۆرتا ناس دکر، قە خەونا شەڤادا ژی من ئەو نەدیبوو، پاشی وێ یەکێ قە نا پاک بە، قەدرێ من بزانبە! کول ئەو کولە، قە نزانە ئەز هەمە یانێ تونەمە، نزانم کودا هەرم، چ خوەلیێ سەرێ خوە کم، بهێلم و بێم نابە، ئەز ژ ناڤێ خوە شەرم دکم، وێ سبێ تێکنە قار بدنە سەرێ من، نەهێلم نەیێم ژی ئەزێ وێ دەرێ ژ دەست هەرم، ئاوا کەتمە ئۆرتا دو کەڤرا نزام کی ئالیدا هەرم.
کارێ ئاوا گلی دکر و پێرا ژی دگریا، چەعڤێ خەزالێ و سێدایێ ژی تژی هێسر ببوون.

ئێڤارەکێ، گاڤا ئاوا دەرەنگ سێدا و خەزال ژ مالا باڤێ کارێ دچوونە مالێ، رێڤا ئەوانا راستی قاچاخ هاتن، وانا ئێڤارخێری دایێ و دخوەستن دەرباز بوونا، لێ ئەو پێشبەری وان سەکنی و گۆتێ خەزالێ:

– خەزال، تو چما ئوسا بێ ئیسافی، ئەز ئیشەڤ چەند شەڤە قەرەولێ تە مە، کو چاوا تە ببینم و دەردێ دلێ خوە تەرا شرۆڤە بکم، قە خودێ تە تونە، نابینی ئەز بۆی حوبا تە بوومە سەودەسەر دین و هار بوومە، لێ تو قە ناخوەزی دو خەبەرا منرا بێژی و دلێ من رەحەت کی. خەزال، روحێ من دەستێ تەدا نە، بخوەزی تویێ من بکوژی، بخوەزی بهێلی.

سەرێ من منڤا نینە، ئەز نزانم شەڤ و ڕۆ سەر ڃ، بەر ڃ مە، لێ وێ چاوا بە حالێ من، بێژە، هۆریا من، ئیشقا چەعڤێ من، بێژە، ئەز کودا هەرم؟

خەزالێ نزانبوو چاوا بکە، چاوا ڕێ ببینە و ژ دەستێ وی خلاز بە. گاڤا ئەوێ دیت چارە تونە، نکارە ژ دەستێ وی خلاز بە، گۆتێ:

– قاچاخ، شەرمە، ڤێ نیڤێ شەڤێ، چرا تە ڕیا مە گرتیە و ناهێلی ئەم هەرن، شەرمە، گوندیک ناها ڕاستی مە بێ یانێ ژی باڤێ من ببینە وێ ڃ بێژە؟ ڃ کو تە هێژا گۆت، من ئەڤا دەهـ جارە سەکریە و جابا تە ژی دایە، ئیدا چما هەرتم دوەکلینی، من تەڕا گۆتیە و جارکە مایین ژی دبێژم، ئەز ناها تو جارا مێر ناکم، حەتا خوەندنا خوە کوتا نەکم، پاشێ ژی ئەگەر مێر کم ژی، گەرە مێرێ من ب گۆتنا من بە، ب دلێ من، یەکی ئوسا، چاوا کو ئەز دخوەزم، خەیسەتێ وی نۆلی یێ من بە، لێ ئەز و تو، قاچاخ، توجارا نکارن هەڤڕا یۆلێ هەرن، چمکی ئەم زەعف ژ هەڤ دوورن... ناها بهێلە ئەم هەرن، دەرمنگە و تەوقێ خوە ژ من بقەتینە. ئەڤ گلیێد خەزالێ نۆلی تیرا ناڤ دلێ قاچاخ هنگاڤتن، لنگ لێ لەرزین، بەر چەعڤا بوو دوومان، نۆلی مەریێ سەرخوەش ئەو شەوشی و جی ب جی ڕوونشت. ئەوی سەرێ خوە کرە ئۆرتا هەردو دەستێ خوە و کەر بوو. خەزالێ و سێدایێ دەماخاتری دانێ و لەز چوون.

ڕۆژ دهاتن و دەرباز دبوون و کەسەکی تێ دەرنەدخست چاوا تێن و دەرباز دبن، چمکی هەرکەس شوخولێ خوەدا گیرۆ بوو. ئوسا ژی سێدایێ و خەزالێ تێ دەرنەدخستن کو چاوا ڕۆژ دەرباز بوون. سێدا هاتبوو کڤا پێنج–شەش ڕۆژا بمینە، لێ ئیدا پانزدێ وێ بوو ئەو هێ نەچوو بوو. وێ دیسا بما، وەکی دیا وێ پێ تێلێ گازی نەکرایێ. لێ دێ و باڤێ خەزالێ قە نەدخوەستن کو ئەو هەرە، ئەوانا قاسی خەزالێ سێدا حز دکرن. سبەترێ سێدا ڤەرێ کرن، سێ ڕۆژ ژ چوویینا سێدایێ دەرباز بووبوو خەزالێ ژ سێدایێ ژی، ژ ئاحمۆ ژی نامە ستەند. ئەو گەلەک–گەلە شا بوو.

ئێڤارێ، گاڤا خەزال هاتە مالێ، پێرا–پێرا ڕوونشت سێدایێ و ئاحمۆڕا نامە نڤیسی. ئەوێ ئیدا نڤیسارا نەما کوتا کربوو گاڤا کارێ هات. کارێ هەردو نامە دیتن پرس کر، کو خەزالێ کێڕا نڤیسی. پێشیێ خەزال سۆر بوو، پاشێ نیشان دایێ و گۆت، وەکی یەک یا سێدایێ یە، لێ یا دنێ یا هەڤالێ وێ یە، ژ کوورسا وان. کارێ خەزالێ نهێری و کەنیا.

– ئەرێ، دەلالا دلێ من، تو من تشتە نەگۆتیە، هەڤالێ تە یە، لێ وەکی ئوسانە تو چرا ئوسا سۆر بووی. خەزال دها سۆر بوو، کارێ حەمێز کر و پاچ کر.

– کاریێ، تو زانی ئەز تشتەکی ژ تە ڤەناشێرم. ئۆرتا من ئاحمۆدا تشتەک تونە، ئەز وی بەگەم دکم. خۆرتەکی زەعف باشە، لێ نزام پاشێ وێ چاوا بە، هاقا تشت، ئیدا چ هەیە، وەکی تو ئوسا من دنهێری، قەیی دبێژم من گونەکاری کریە. ئاوا ئەوانا زەعف خەبەر دان، پاشێ خەزال کاریێ ڤەریێ کر و هاتە مالێ.

ژ چووینا سێدایێ ئەپێجە وەعدە دەرباز ببوو، لێ خەزالێ تەنێ نەمەک ژ وێ ستەندبوو یەکی ژی ژ ئاحمۆ. ئەوێ سێ-چار نەمە شاندبوون، لێ جاب تونە بوو. و ئوسا ژی ئیرۆ، ئەو چاوا هاتە مالێ پێرا-پێرا ژ دێ پرسی، لێ ب ترس، نۆلی تشتەکی بێژە "دبەک ڤێ جاریێ ژی بێ-نا، تونەنە". تەیێ بگۆتا زمینەڤێ نێتا ڤیزێ فەعم کر و گۆت:

– نەما تە هەیە، ڤیزا من، چرا دترسی، ڕوونێ نانێ خوە بخوە، ئەزێ نها ژ ئۆتاخا دنێ بینم.

خەزال ب ڤان خەبەرێد دێرا فرناخ بوو. ئەو هیڤیا دێ نەسەکنی، بەر ب ئۆتاخا دنێ چوو، نەمە هلدا و لێ نهێری، ئەو دەستنڤیسارا سێدایێ بوو. ئەوێ هاهانگا ڤەکر و خوەند.

سێدایێ دنڤیسی:

"سەلام، خەزال جان، بباخشینە، وەکی خراب و کورت دنڤیسم. خووشکا منە شیرن، من گەلەکی بیرا تە کریە، زوو وەرە، ئیدا وەعدێ خوەندنا مە هندک مایە. ئاحمۆ نەخوەشخانێ دانێ و گەلە تەعلە. دیسا ببێژم هەرکە دکاری زوو وەرە. ئالیێ مندا دیا خوە، باڤێ خوە و هەڤال-هۆگرا گشکا سلاڤ کە".

سێدا.

خەزالێ خوەند و هێسر ژ چەعڤا بارین، وێ سەحەتێ تشتەک بەر چەعڤێ وێ نەدهات، ئەوێ دخوەست وێ سەحەتێ ژی هەرە، زوو هەرە با ئاحمۆیێ خوە، لێ نکاربوو، چمکی دیا خوەرا گۆتبوو، وەکی دو ڕۆژێ دنێ شووندا وێ هەرە.

ئەو هەردو ڕۆژ بوونە سال بۆنا خەزالێ، خەوێ شەڤا وێ ببوونە حەزرەت، تشتەک نەدخوار، نەدکر، خەبەر نەددا، لێ وەختێ دیا وێ ژێ دپرسی چ قەومیە ئەوێ دگۆت:

– تشتە تونە، ئنێ جان!

دو ڕۆژا شووندا خەزال ژ گوند دەرکەت. بەریڤاریێ، سەحەت شەش بوو، وەختێ خەزال گهیشتە یێریڤانێ. ئەو ژ ئافتۆیێ پەیا بوو و ڕاست چوو مالا سێدایێ. وەختێ ئەو گهیشتە

ورا تریه‌-تریه‌ دلێ وێ بوو. زەنگل خست، دیا سێدایێ شووشانێ، دەری ڤەکر. ئەوێ کو خەزال دیت زەعف شا بوو، ئەو حەمێز کر.

– تو سەر چەعڤێ مرا هاتی، خەزال جان! کەرەم کە مالێ، کەرەم کە قیزا منە دەلال! مە بیرا تە کربوو، سێدایێ هەر ڕۆ دەرهەقا تەدا خەبەر ددا، لێ ڤان ئاخریا ئیدی ڕۆژا هاتنا تە حەساب دکر. لێ تە سەکریە، وەکی ئاحمۆ ژ گوند ئانین ڤرا کرنە نەخوەشخانێ؟ دبێن زەعف تەعلە، سێدا ڕۆژێ دەهـ جارا دچە بالێ، خوەرنێ دڤە، لێ مەلوول ڤەدگەرە، جارنا ژی دگری و دبێژە، وەکی زەعف تەعلە.

خەزالێ ئیدی خوە ئوندا کر، ئەوێ پێ دەستێ خوە چەعڤێ خوە گرتن و ئیسکە-ئیسک پێکەت، تویێ بێژی هەر خەبەرەکە شووشانێ کولەک دلێ وێ. وەختێ ئەو هنەکی ڕەحەت بوو گۆت:

– خاتیا شووشان، نزانی کیژان نەخوەشخانێدا نە، نەخوەشیا وی چیە؟

– سێدایێ دگۆت ئەو ژ پێرێڤانێ چوویە گوند و ڕێڤا ئاڤتۆیا کو پێ چوونە وەلگەریایە، لێ ئاحمۆ پاک خلاز بوویە. دبێن زەعف ژ سەرێ خوە دگازنە.

– خاتیـا شـووشـان، بـرا هوور-موورێ من ڤـرا بمـینن، ئەز هەرم بنهـێرم دکارم ئاحـمۆ ببینم، یانێ نا، ب تەخمینا من سێدایێ ژی ور بە، ئەمێ تەڤایی بێنە مالێ.

خـەزال لەز چوو نەخـوەشـخانێ. سـێدا، ئانووشـاڤـان و چەند مـەرێد نەنـاس، کو کنجێد کوردی لێ بوون، ڕوونشتبوون. سێدا، کو ئەو دیت، بەر ب وێ ڕەڤی، خوە ئاڤیتا پێسیرا وێ.

– خەزال جان، چ پاکە تو هاتی، ئیرۆ چەند ڕۆژە چەعڤێ مە ڕیا تە قـەرمی، مە ترێ ئیرۆ ژی نایێ. ئانووشاڤان ژی هات سەلام دایێ لێ خەزال سار ببوو سەکنیبوو، نکاربوو خەبەر دە.

– هوون وێ بێژن ئاحمۆ چاوانە، ناهێلن ئەز هەرم بالێ؟

– ڕەعف تەعلە، لێ یا هشتنێ ناهێلن.

مـە ئەوقاس لاڤا کر نەهیشتن. تشتـە ناکە دو ڕۆژ مـانە، ئەمێ بێنە پراکتیکایێ و هنگێ ئەمێ وی ببینن، لێ ئەوانا ژی دیا ئاحمۆ، باڤێ وی و برێ وی نە. خەزال سۆر بوو، سەرێ خوە کرە بەر خوە، نێزیکی وان بوو، سەلام دا وانا. دیا ئاحمۆ خەزال حەمێز کر، کەلۆگری گۆتێ:

- ئەولەدا من، تو یی خەزال؟ ئاحمۆیێ من چقاسی دەرهەقا تەدا گلی دکر، چقا پەیی تە ددا، وەختێ نەمێ تە دەرەنگ دهاتن نزانبوو چ بکرا، لێ ڕۆژا ئەوی دستاند شابوونا لنگێ وی عەرد نەدگرت.

چەعڤێ خەزال ژی تژی هێسر بوون و ئەو ژی گریا، سێدایێ وانڕا شەر کر.

- وە خێرە، هوون چما دگرین؟ ئاحمۆیێ ڤان ڕۆژا پاک بە و بێ دەرسێ.

ئەوانا گەلەکی وێ دەرێ ڕوونشتن. لێ دینا خوە دانێ کەس وانا نەهێلە هەرنە هوندور، چوونە مالێ.

١-یێ سێنتیابرێ یە، خەزال و سێدا دچوونە دەرسێ. ئەوانا وێ ڕۆژێ قرار کربوون عەسە ئاحمۆ ببینن. ئوسا ژی کرن. پاشی دەرسێ چوونە بال لێکتۆرێ خوە، کاخەز ژێ هلدان، وەکی وان پراکتیکانتا بهێلی هەرنە نەخوەشخانێ. ئەوانا پرس کر ئاحمۆ کێژان ئۆتاخێ دانە و چوونە ورا. ئاحمۆ ناڤ جیادا بوو، چەعڤێ وی گرتی، سەرێ وی گرێدای بوو و ناڤ گەرمێدا دسنجری. خەزالێ وەختێ ئەو دیت چۆکێ وێ سست بوون، نێزیکی کەرەڤاتا ئاحمۆ بوو، دەستێ وی گرت:

- ئاحمۆ جان، سەلام، چاوانی؟ - ئەوێ دلۆڤانی پرسی.

ئاحمۆ چەعڤێ خوە ڤەکر، تویێ بێژی خەونێدا خەزال و سێدا دیتن و وانڕا کەنیا، دەستێ خەزالێ نەرم گوڤاشت و جارەکە دنێ چەعڤێ خوە گرتن. خەزالێ ئێدا نکاربوو خەبەر دا، هێسرێ وێ نۆلی تەڤیێ باران ژۆردا دهاتن.

- ئاحمۆ جان، بێژە، چاوانی، ئیرۆ هنەکی پاکی؟ - سێدایێ پرسی.

ئەوی سەرێ خوە هەژاند، دخوەست بگۆتا، وەکی ئیرۆ هنەکی پاکە. ئەوی نکاربوو خەبەر دا، لێ پێ دەستا ددا فەعمکرنێ. خەزال و سێدا چوون گەرمپیڤۆک ئانین گەرما وی پیڤان، ئیرۆ ٣٩ (س.گ) بوو، دەرەجەک ژ یا هەر ڕۆ کێمتر، ئەوانا شا بوون و گۆتنە ئاحمۆ:

- ئاحمۆ جان، ئیرۆ گەرما تە ژی هنەکی کێم بوویە، شکر چەند ڕۆژا دنێ شووندا تو یێ بێیی دەرسێ، تو دەرهەقا دەرسادا دوشورمیش نەبە، ئەمێ لێکسیایێ تە ژی بنڤیسن.

و ئاوا ڕۆ ب ڕۆژا ئاحمۆ بەر ب پاکبوونێ دچوو.

خەزال و سێدا تمێ دچوونە بالێ. ڕۆژەکێ خەزالێ گۆتە سێدایێ، وەکی پاشی دەرسا هەرن کولیلکا بکڕن و هەرنە بال ئاحمۆ، لێ سێدایێ گۆت، وەکی ئیرۆ نکارە، چمکی

گەرەکێ پاشی دەرسا تەڤ دیا خوە هەرە مالا خووشکا خوە. خەزالێ قرار کر تەنێ هەرە و پاشی دەرسا چوو کولیلک کرین چوو بال ئاحمۆ. ڤێ جارێ ئیدی ئاحمۆ پاک بوو. ئەوی خەلات خوەکربوو و ناڤ جیدا ڕوونشتبوو، قەلەم دەستدا دنڤیسی. ئەوی خەزال نەدیت. خەزال چوو هێدیکا کێلەکێ ڕوونشت و دیت وێ شێرەکێ دنڤیسە و ب کەن گۆت:

– ئاحمۆ، تو بووی شاییر، ئەرێ، ناخوەزی قە ڤی ئالی ژی بنهێری؟ ئاحمۆ کو خەزال دیت سار بوو، ئەوی ژ چەعڤێ خوە باوار نەکر، پاشێ گۆت:

– خەزال، بباخشینە من تو نەدیتی– و شێر زوو هلدا.

– تشت ناکە، لێ تە چما شێرا خوە زوو ڕەڤاند، تو چما ژ من ڤەدشێری ئەوێ شێرێ؟

ئاحمۆ سار بوو، ئیدا تشتە نکاربوو بکرا، شێر دەرخست و دایێ.

– هان، بخوونە تشتەک تێدا تونە، ئەز ڤالا بووم من گۆت خوەڕا بنڤیسم. خەزالێ خوەند. ئەوی نڤیسی بوو دەرهەڤا قیزەکێ دا، وەکی ژ وێ حز دکە، لێ قیز وی نا. خەزالێ خوەند کەنیا و دایێ.

– قەی تە بۆنا وێ یەکێ ژ من شەرم دکر، وەکی تو قیزەکێ حز دکی.

– خەزال ... ئەرێ، ڕاست دبێژی، ئەز قیزەکێ حز دکم، ئەو ژی ئوسا حز دکم، وەکی تو کەسی حەتانی نها ئوسا حز نەکریە.

– ئەرێ، زەعف پاکە، لێ کێ تو حز دکی، یانێ کی تە حز دکە و تو ئوسا مەلوولی، وەکی دەرهەڤا وێ یەکێدا شێرا دنڤیسی؟ بێژە، دبە ئەز تەڕا چارەکە ببینم.

– ئەرێ خەزال، هەما تو یی، وەکی دکاری دلێ منی بریندار دەرمان کی، تو چاوا بخوەزی، تویێ ئوسا ژی بکی، بخوەزی تو یێ من بکوژی، بخوەزی تو یێ من پاک کی.

ئاحمۆ ئەڤ خەبەرانا قەی بێژی بێ حەمدی خوە دگۆتن. خەزالێ وەختێ ئەڤ خەبەرا سەکرن، تو یێ بێژی تەزە ڕوح هاتە بەر. خەزالێ ئاحمۆ نهێری و شەرما سەرێ خوە کرە بەر خوە و گۆت:

– ئاحمۆ، تو چ دبێژی، ئەز چاوا دکارم تە بکوژم، نە وەکی ئەز تە بکوژم ئەزێ ژی بمرم، چمکی تو ژی حەکیمێ دلێ منی. ئاحمۆ شابوونا نزانبوو چ بکرا، دەستێ وێ گرت:

– خەزال، دنیاکە تەزە منڕا ڤەبوو.

خەزالێ دها شەرم کر، ڕابوو، لێ نهێری، خاترێ خوە ژێ خوەست و چوو.

چەندەکی شووندا ئاحمۆ ژ نەخوەشخانێ دەرکەت، لێ چمکی هێ پاک سەر خوەدا

نەهاتبوو، دۆخترا ئەو چەندەکی ژ دەرسا ئازا کر و ئەو چوو گوند. چەندەکی دنێ ئەو هاتە دەرسێ.

حوب و حزکرنا خەزالێ و ئاحمۆ رۆژ ب رۆژ دها زەعف دبوو، بێی هەڤدو نەدچوونە جیکی، بێی هەڤدو تشت نەدخارن، تەڤایی دچوونە کتێبخانێ هین دبوون و تەڤایی دهاتن.

ئینستیتووتێدا ب پەسن دەرهەقا هینبوونا وان، ئاقل و کەمالا واندا خەبەر ددان. ئاوا پێنج سال دەربازبوو، پێنج سالێ ئەڤینتیێ و خوەندکاریێ یە شیرن.

و ئاوا ئەڤ هەردو جاهل کوورسا شەشادا بوون. ئەوانا تەڤایی بۆنا ئینتهامێد دەولەتێ هازر دبوون.

رۆژێد گولانێ یە خوەشن، دەشت و زۆزان، بەر و بۆستان تەڤ خەملینە. هەر گاف، سبێ شەبەقێ، خەزال و ئاحمۆ کتێبێد خوە هلتینن و دچن ناڤا باخێ سەر ناڤێ رێڤۆلیووسیۆنێرێ عەیان خووکاس خووکازیان و بۆنا ئینتهاما هازر دبن. پاشێ جار-جارا وەختێ هێسا دبن، دەرهەقا عەمرێ خوە یی پاشوەختیێ خەبەر ددان، دفکرین چاوا مالێ داینن، خوەرا هوور-مووری ناڤ مالێ بکرن و ب دلێ خوە وانا ناڤ مالێدا جیکن. جارنا ژی پاشی خوەندنا کتێب و لێکسیائێد خوە دەست پێ دکرن پرس ددانە هەڤ. ڤی تەهەری رۆژێ بەری ئینتهاما دەرباز دبوون.

ئیدا رۆژا ئینتهاما دەولەتێ یە پێشن بوو. ئەوانا گەرەکێ ژ ئاناتۆمیایێ ئینتهام بدانا.

وێ رۆژێ چاوا خەزال و ئاحمۆ، ئوسا ژی خوەندکارێد ماین قەت رەحەت جیێ خوەدا نەدسەکنین، یانێ دچوون-دهاتن، یانێ ژی بێ دەنگ و حس سەرا ئینستیتووتێدا روونشتی دبهیستن چکا هەڤالێد وان چاوا ئینتهامێ ددن.

وێ رۆژێ ئاحمۆ و خەزالێ ژی ئینتهاما خوە ب قیمەتێ زەعف رند ڤا دان.

ژ شابوونا لنگێ وانا عەرد نەدگرت.

ئەوانا شا بوون، چمکی ب سەرفنیازی ئینستیتووت خلاز دکرن. خەزال کڤش کربوون دۆخترا نەخوەشخوەنا گوندێ ئەلەگەزێ، لێ ئاحمۆ ل ئارتاشاتێ.

دو رۆژ پاشی ئینتهاما ئاحمۆ خەزال ڤەرێ کرە ئەلەگەزێ و گۆت، وەکی زوو-زوو جابا نەمێد وی بدە، ئەوێ زووترەکێ تەڤی دێ باڤێ خوە بێ.

وانا خاترێ خوە ژ هەڤ خوەست، شکلێ خوە دانە هەڤ و ژ هەڤ قەتیان، چمکی ئاڤتۆ ئیدا رێ دکەت. ئاحمۆ دەستێ خەزالێ نەدخوەست بەردا، ئەوی چەعڤێ وێ دنهێری و مینا

زارەکە کو دخومزە بگری لێڤا خوە دالقاندبوو.

خەزال ژی حالەکێ پاکدا نەبوو، ئەوێ ژی چەعف برویێ خوە تەڤهەڤ کربوون، نکاربوو ئاحمۆ بنهێریا، ئەوێ ترێ کو وی بنهێرە وێ بگری. ئاحمۆ ب دلەکی بریندار ژ ئاڤتۆئێ پەیا بوو و ئاڤتۆ ڕێ کەت.

خەزال گهیشتە مالێ هەلا ڕۆ نیڤرۆ بوو، زەینەڤ تەنێ مالدا بوو. ئەوێ خەزال دیت، دنیا لێ ڕۆن بوو، نۆلی قیزەکە چاردەهـ سالی بەر قیزێ ڕەقسی ئەو حەمێز کر، ڕاموسا و گۆت:

– شکر، شکر ڕۆژا ئیرۆیینڕا، قیزا منە شیرن، تە سەرفنیاز خوەندنا خوە کوتا کر و چاوا دۆختر ڤەگەریایی مالێ. ئەو منڕا مالێ دنێ هێژا یە. ئەز ئیرۆ گهیشتمە مرازێ خوە، مەرامێ من هاتە سەری، شکر ڤێ گاڤێڕا. لێ خەزال، تە نەگۆت تو یێ کیدەرێ بخەبتی.

گاڤا دێ حەسیا ئەوێ گونددا بخەبتە دها شا بوو. قیزا وێ دۆخترا گوند، چ کەرەمەکە مەزنە! وێ دەمێ باڤێ خەزالێ، جیرانێ وان هاتن. باڤێ وێ ژ دێ زەعفتر شا ببوو. وێ شەڤێ حەتا بەربانگێ ئەوانا ڕانەزان، دێ و باڤ کێلەکا قیزێ ڕوونشتی پرس–پرسیار لێ دکرن. حەڤتێک ژی دەرباز نەبوو، گاڤا خەزال گوندێ ئەلەگەزێدا چاوا دۆختر خەبتی.

***

مالا حەمیددا شین و گری بوو. کورێ وانی بچووک–ئەرفووت بەتحال بوو، قرک–قەوریێ وی تژی ببوون و ئەوی نکاربوو خەبەر دا. جینارەک دچوو یەک دهات، گشکا دگۆت وێ بمرە.

ئێڤارێ، گاڤا خەزال هاتە مالێ، دیا وێ ژێڕا دەرهەڤا ئەرفووتدا گلی کر و گۆت، وەکی دیا وی ناخومزە گازی دۆخترا کە، ئەو دبێژە دۆخترا کورێ وێ ببنە "بالنیسێ" و وێ دەرێ باڤێژنە بن کێرێ.

خەزالێ ئیدا نان نەخار، خەبەرا دێ نیڤجیدا هیشت، دەرمان و دەرزی هلدان دەریڤا دەرکەت. دێدا پەی، لێ مالا حەمید دووری مالا وان نەبوو، زووترکێ ئەوانا گهیشتنە مالێ. گاڤا خەزالێ دەری ڤەکر دیت هەوا زەعف گرانە، کیدەرێ کو نەخوەش پالدا بوو تژی ببوون، لوویە–لووبێ وان بوو، دیا نەخوەش بەر سەری ڕوونشتی دیرۆک دگۆتن، ئێ دنێنا ژی دگریان. شێخا گوند، وەردێ، کێلەکا دیا نەخوەش ڕوونشتبوو. ئەوێ ژی قەول دگۆتن و دیا نەخوەشڕا دکرە شەر، کو نەکە قاژین، گەدە دو ڕوح نەکە. گاڤا خەزالێ ئەڤ یەک دیت

ئیدا تەموول نەکر. ئەو نێزیکی نەخوەش بوو ئێ کو بێ حەمد و حش ناڤ گەرمێدا بوو هلکە-هلکا وی بوو. خەزالێ دەستێ وی گرت، گەرما وی پیڤا، پاشێ دەرزی هازر کر، وەکی دەرزی کە. وەردا شێخ، یا کو قەولا خوە هێ تەمام نەکربوو، کرە قاژین: "وی خوەدێ، گونێ من زەعفن، ئەڤ قیزکا چ دکە، چ ژ ڤی تفالی دخوەزە، وێ گەدە بهەرمینە پێ وان دەرزیێ خوە یە حەرام، گەدێ جنەتی وێ گور ب-گور کە. سینەم، تە پۆرێ خوە کور کرێ، تو چ سەکنی و دنهێری، بەر چەعڤێ تە دەرگووشا تە دحەرمین، گەدە ڤا جان ددە، ڕوحستینێ خوەڕا شەر دکە ئەو هاتیە وی دحەرمینە، خودێ تو کەڤر-کوچکا سەر مەدا بباریني، زولما ها ژی دبە، من گونەکارێ؟!".

حەتا وەردە وا خەبەر ددا خەزالێ دەرزی هازر کر، دەرمان کرێ و نێزیکی گەدە بوو. وێ دەمێ سینەمێ کرە قارین، خوە ئاڤیتە سەر گەدە:

– نا، کو نەبوویە ئەز ناهێلم هوون کورێ من دەرزی کن. خەزالێ ب لاڤا، دیلەکا، قوربان، حەیران، ئانجاخ سینەم سەرومخت کر و ئەوێ ب دلەکی کول هیشت. وەردا شێخ گاڤا ئەڤ یەک دیت ئرنێ خوە ڕاکر و خاست هەرە، لێ سینەم بەر سەکنی، لاڤایی هاتێ:

– داییکێ، ئەز خولیا بنێ لنگێ تە مە، من گونەکارێ چ کریە، چرا دچی، بسەنە، من تەنێ نەهێلە.

لێ وەردا گورا وێ نەکر، ئەو وێدا دا دەری ڤەکر و گۆت:

– ئیدا لنگێ من ڤێ مالێ ناکەڤە. تو بێ ئاقوویەت بمینی، سینەم، دەڤێ کووچکا هەری! تو پێ وێ دنێ ناڤا قیر-قەترانێدا بقچقچی، تو بووی سەبەبا ئەولەدێ خوە. – ئەوێ دەری قاییم گرت، چوو.

گاڤا وەردا شێخ چوو چەند ژنێ سەرە ژی دانە پەی وێ و دەرکەتن چوون. مالدا، خەزال، زمینەڤ، کولفەتا مالا حەمید و چەند کولفەتێد مایین مابوون. خەزال حەتا سبێ بەر گەدە ڕوونشت، دەرزی سەر دەرزیێ لێخست، کۆمپرێس کر، زۆرێ دەڤێ وی ڤەکر دەرمان دایێ. سبێ شەبەڤێ جینارا ترێ ئەرفووت ئیدا مریە، لێ نا، ئەرفووت ساخ بوو. ڕۆژترا مایین خەزالێ ئەو گوهاستە نەخوەشخانا گوند.

ئەرفووت دەهـ ڕۆژا نەخوەشخانا ما و پاک بوو. وی چاخی ئیدا ناڤێ خەزالێ ناڤ گوند بەلا بوو، چاوا دۆختـرا باش. دێ باڤێ ئەرفووت نزانبوون چ بکرانا، وەکی بن قەنجیا خەزالێ دەرکەتانا...

دۆخترخانا کو خەزال تێدا دخەبتی گەلە نەخوەش هەبوون. ئەوانا سرێ دچوونە بال وێ و ب ئەشق و شا دەردکەتن، تەیێ بگۆتا ئەو، نەخوەش ناڤ چەند دەقیقا پاک دبن.

ئەوانا وەختێ دەردکەتن، هەر کەسی هنداڤا خوەدا پەیی خەزالێ ددا.

وێ دەمێ دەرێ نەخوەشخانێ ڤەبوو و خۆرتەکی بەژنبلندی چەعڤرەش دەردا هات. ئەوی سەلامدا گشکا و ڕوونشت. ئەوی کەسەک ناس نەدکر و کەسەکی ژی ئەو، لەما ژی ئەوی خەبەر نەددا، تەنێ سە دکر دەرهەڤا خەزالێدا کێ چ دبێژە. ئەوی قەلن سەر قەلنێ دکشاند و دەرێ دنهێری، پرتە-پرتا دلێ وی بوو.

ئەوی باوار نەدکر وێ خەزالا خوە یە ئەڤێن ببینە، پێرا خەبەر دە. کێ کو ژ بال خەزالێ دەردکەت ئەوی خازیا خوە چەعڤێ وانا دانی. ئەوی دکر ڕابە هەرە بال وێ، لێ شەرم دکر، نەدخوەست خەباتا خەزالێ پاش بێخە.

لێ ئەوی ئیدا سەبر نەکر، ڕابوو، هنەکی سەکنی، جارکە مایێن ڕوونشت. دلێ وی قایم لێدخست، ئەو سۆر ببوو. ژ هوندور ژنەک دەرکەت و خۆرت چوو هوندور. خەزال خەلاتا چیلقەرقاشی لێ، بەر ئیستۆلێ ڕوونشتی لەز دنڤیسی. ئەوێ سەرێ خوە ژ بەر خوە دەرنەخست گاڤا دەرێ نەرم ڤەبوو و خۆرت دەردا هات، ئەو سار بوو، بەر دەرێ سەکنی بوو. خۆرت نکاربوو تشتەک بگۆتا، ژ چەعڤێ خوە باوار نەدکر، گەلۆ یا ڕوونشتی خەزالە یانێ خەونە.

پاشێ ئەوی هدیکا ناڤێ خەزالێ دا. خەزالێ، کو ناڤێ خوە سەکر سەرێ خوە هلبری و وی نهێری. ئەوێ کو خۆرت دیت ڕساسەک سەری حەتا بنێ لنگا هاتێ، ئەو ژ جی قولوز بوو، لێ خوە زەڤت کر، ئەوێ ژ خوە باوار نەدکر، چەعڤێ خوە پێ هەردو دەستا گرتن، لێ خۆرت هنگێ نێزیکی وێ بوو، هەر دو دەستێ وێ ژ بەر چەعڤا هلدا، ڕامووسا:

– دەلالیا من، گولا بەر بینا من، خەزالا من تو باوار ناکی، ئەزم، بنهێر، نەترسە، خەون نینە، ڕاستە، شیرنا من!

خەزالێ کو ئەو گلی سەکرن، کرە ئیسکێن وی نهێری.

– ئاحمۆ، تو چاوا هاتی، تە قە منرا ڤان ڕۆژا نامە ژی نە دشاندن، ئەز زەعف دفکریم. من دگۆت دبە بێکێفی، لێ پاکە، شکر تو ساخ-سلامەتی و بال منی. ئاحمۆ ب کەن وێرا گۆت، کو قەستی نامە نەشاندیە، چمکی خوەستیە خەپە-خەپ بێ، وەکی ئەو نزانبە. پاشێ ئەوی گۆت، وەکی دێ باڤێ وی ژی هاتنە، ئەوانا مالا باڤێ خەزالێ نە. شابوونا خەزالێ

نزانبوو چ بكرا، ئاحمۆ وێ دنهێری ئەوێ ژی وی ... ئەوانا ئاوا ئەپێجە كەر و لال سەكنین، تەیێ بگۆتا دخوەزن حەیفا خوە یە چەند مەها هەڤدو هلدن. لێ نا، ئەوانا چقا ژی هەڤ دنهێرین ژ هەڤدو تێر نە دبوون.

ئاحمۆ نهێری كو نەخوەش دەری ڤەدكن و دگرن، گۆتە خەزالێ:

– دە، ئەڤینا من، ئەز هەرم مالێ، نەخوەش هیڤیا تە نە. تە چاوا كوتا كر زوو وەرە، ئەمێ بێسەبر چەعڤنهێرێ تە بن.

خەزال ئەو حەتا بەر دەری ڤەرێ كر و ژێ پرسی گەلۆ دێ و باڤێ وی وێ تشتەكی نەبێژن، وەكی ئەوە سەرڤەكریە. ئاحمۆ كەنیا و گۆتە خەزالێ، كو شەرمە، گلیێ ئوسا نەبێژە.

دێ باڤێ وی ئەوقا ژی پاشدامایی نینن.

ئاحمۆ، دێ و باڤێ وی دو رۆژا ئەلەگەزێ مان. ئەوانا هەما رۆژا پێشن خەزال نیشان كرن و رۆژترا دنێ دخوەستن ڤەگەریانا، لێ مالا باڤێ خەزالێ نەهیشت. وانا عەزمت قولخەكە مەزن وانرا كر. پاشێ، رۆژترا مایین ئەوانا ڤەرێ كرن.

دێ باڤێ ئاحمۆ دخوەستن خەزال چەند مەهێ دنێ شووندا ببرانا، لێ دێ باڤێ خەزالێ نەدان، ئەوانا پەڤ كەتن هاڤینێ، پاشی گیهادروونێ.

ئاحمۆ زەعف بێسەبر هیڤیا هاتنا هاڤینێ بوو، دێ ئوسا زوو وەعدە دەرباز بوو، كو ئەو ژی زەندەگرتی ما. مالا وان ئیدا كارێ دەعوەت دكر. ئەوانا ئیدا تۆپاییێ خوە دگەراندن، كار و تڤدانەكێ خوەندیا ددیتن. مالا باڤێ خەزالێ ژی ژ وانا شووندا نە دما. خەزال و باڤێ وێ چەند رۆژا هاتنە یێرێڤانێ، چ كو وان لازم بوو بۆنا جەهێز كرین و ڤەگەریانە مالێ. گاڤا خەزال و مەجیت هاتن چەند جینارێ وان مالدا بوون. و وانا دیت، كو چقا هوور-موور كنج-رەحەل خەزالێرا كرینە. جینارا زەندە گرت. سورمێ، كو جینارا وانە لاپە نێزیک بوو، گۆت:

–ئێ، مەجیت، برێ من، تو دبێژی، وەكی تە قەلەن نەستەندیە، لێ چرا هاڤا تشتە كرییە؟ بۆ، ئەز سەرێ كورێ خوە كم، برێ مەجیت، تو زولی، لێ مەری رابە قیزێ بێ قەلەن بدە خەلقێ، و سەردا ژی مالەكێ پێرا داینە؟ نا قوربا، ئوسا توجاری نابە، تو ئوسا حورمەتا قیزا خوەرا دلیزی، تو قیزا خوە سڤک دكی، قیزا بێ قەلەن، بێ روومەتە، برێ من.

تو چاوا خوەدێ ناترسی و قیزەكە نۆلی خەزالێ بێ قەلەن ددی؟ تو گوهـ بدە خووشكا

خوه، ئەز تەڕا گلیکی بێژم، ئەڤ گلی گلیێ کال باڤێ مه یه: "گۆ، جارەکە یەکی قیزەک بێ قەلەن-تەلەن خوەست. وەختێ قیزێ سیار دکن دبن، ڕێ ڤا دخوەزن ژ چەمەکی دەربازبن. بووکا کو سەر هەسپێ بوویە، ئاڤ لێ دخە و هندک دمینە ڕۆدا هەرە، وێ دەمێ مەری دگهیژنە، وەکی ئازا کن. لێ خەزووریێ وێ دکە گازی:

"هەسپێ من ئازا کن، هەسپێ من، جەنما بووکێ، ئەوە بێ پەرە یە"! گاڤا بووک ڤان گلیا سە دکە کەر و لال ڤەدگەرە مالا باڤێ خوە و دبێژە حەتا قەلەن نەینن ئەو ناچە. گاڤا قەلەن تینن و بووکێ دبن، خەزووریێ وێ ئیدا تەرکا وێ ناکە، تمێ مقاتییێ لێ دکە و وەختێ دگهیژە چێم ئەو دکە گازی: "وی گدینۆ، بەختێ وە مە، مقاتی بووکا من بن". ئاها، برێ من، بووکا بێ پەرە، بێ ڕوومەتە ژی.

مەجیت ئەو گلی کو سەکر زەعف هێرس کەت، لێ خوە زەفت کر و گۆت:

– خووشکێ، ئەو زەمان ئیدا چوون، زەمانێ قەلەنێ قلێر، لێ ناها ئەز تو جارا نکارم قیزا خوە ب قەلەن بدم. ب گلیێ تە گەرەکێ من خەزال ب پەرەتی بدا، پاشێ ژێڕا جهێز بکریا. منێ ب چ دلی هەبوونا مالا کو قیزا منێ هەرە تالان کرا و قیزا خوە بشاندا سەر مالەکێ ڕەقە-ڕووت؟ پاشێ ئەزێ چ ڕووکی ڕوویێ مالا وێ، مێرێ وێ، بنهێرم، ئەزێ چ ڕوویی قیزا خوە بنهێرم، ئەو قیزێ نەبێژە، گەلۆ ئەڤ باڤ بوو، یانێ توجارێ مەرڤا، مالا مێرێ من تالان کر پاشێ دام. نا، خووشکا سورمێ، ب تەخمینا من، من زەعف پاک کریە، برا بمبارەک-پیرۆز بە. هەر تەنێ برا هەردو هەڤڕا پاک بن، ئەو منڕا مالێ دنێ یە.

جینار چەند هەڤا گلیێ مەجیتڕا ڕازی بوون. خەزال ڕوونشتبوو و کەر-لال گوهداری دکر.

***

ڕۆژەکە هاڤینێ یە خوەش بوو، بەر دەرێ مالا باڤێ خەزالێ تژی ببوون، قیز و خۆرت کەتبوونە چرپیکێ ب دەنگ دلیستن. گوند-گوندیتی هیڤیا مالا زەعڤێ بوون، هیڤیا خوەندیا. دێ باڤێ خەزال کەتبوونە پۆچکێ و دلیستن. لێ خەزال و کارێ مالدا ڕەخ هەڤ ڕوونشتبوون، شیرن-شیرن هەڤڕا خەبەر ددان.

ئەوانا هەڤ حەمێز کربوون و ڕوونشتبوون. وێ دەمێ ژ دەرڤا دەنگ گهیشتە هوندور کو هاتن. خەزال و کارێ ڕابوون. ئەوانا چەعڤێ هەڤ نهێرین، خەزال سۆر بوو و سەر سوورتێ هناریدا هێسر بارین، لێ کارێ حەنەک کرن و بەزی دەرڤا کو ڕاستیێ بزان بە.

گاڤا ئەو دەرکەتە دەرڤا، حەوشا مالێ ب گوندیا ڤا کمکمی بوو، تە دەرزی باڤیتا نەدکەتە عەردێ. کارێ ئانجاخ ژ ناڤ وان دەرکەت و ئوسا سەکنی، وەکی ڕیا پێرێڤانێ بهاتا کفشێ. ئەوێ نهێری و دلێ وێ ئاڤیت، چەند ئاڤتۆیا نێزیکای گوند دکرن.

دوور ڤا دەنگێ دەف–زورنێ و کلاما دهات؛ کارێ دینا خوەدا ئاڤتۆیێ و تەخمین نەکر، کو یەک لەز بەر وێڕا دەرباز بوو.

پش خوە ڤا ئەوێ دەنگێ کەن و قالمەقالێ سەکر و بەر ب مالێ چوو. گاڤا ئەو گهیشتە مالێ ئەجێبماین ما. چەند خۆرت و قیز دۆرا خۆرتەکی دچوون دهاتن، دخوەستن ئاڤێ سەردا کن، لێ ئەوی خوە دانەدانی، وەکی "رووڤیا". ئەو کۆلیا بوو، هەڤالێ خەزالێ و ئاحمۆ.

وێ دەمێ خەزال دەرکەت و گاڤا کۆلیا دیت، بەر ب وی چوو، سەلامدا یێ و ئەو برە مالێ، لێ پشت–مشتێ وی ئیدا ئاڤێدا مابوون. کارێ پەی وانا چوو مالێ، خەزالێ ناسیا وێدا کۆلیا و بۆنا کۆلیا کنجێ خوە بگوهەزە خەزال و کارێ چوونە ئۆتاخا دنێ. وێ دەمێ بوو گرمە–گرما دەف–زورنێ، گرینا ئاڤتۆیێ.

سیار، بەربوو، ژ ئاڤتۆیا پەیا بوون و کەتنە گۆڤەندێ.

پاشێ ئەوانا چوون بال بووکێ. خەزال و کارێ ئۆتاخا ژۆرێ بوون. بەربوو چوونا بال وان. خەزالێ ناڤ بەربوویاندا سێدا ناس کر، حەتا ئەوێ کر بەر ب وێ هەرە، ئیدا سێدا حەمێزا وێدا بوو. ئەوێ خەزاڵ ڕادمووسا و سرێ نەددا وێ. پاشێ ئەوێ خەزال بەردا بەر ب کارێ چوو.

گوندیا هازریا خوە دیتبوو و ئەوانا هیڤیا خوەندیا بوون. نیڤرۆ گوندیێد کو کارێ خوە کربوون نێزیکی مێڤانا بوون برنە مالێد خوە، حەتا ئێڤارێ تە دەرێ کیژان مالێ ڤەدکر کێف بوو، شایی بوو.

ئێڤارێ، بەر دەرێ مەجیت گۆڤەند گران ببوو. ب دەف و زورنە دچوونە پەی خوەندیا.

گاڤا گۆڤەند ڕند گران ببوو، قاچاخ ڕابوو سەدماناتەک دا دەفچی و خەزال، کارێ، سێدا کرنە سەرگۆڤەندێ. سێدا نوسا ڕند "سێ پێ" دلیست حەواسا مەرڤا دانی، لێ قاچاخ خەزالێ دنهێری و قەلن سەر قەلنێ دکشاند.

حەتا نیڤێ شەڤێ ئوسا گوند–گوندیتی ڤا لیستن، کێف کرن. لێ چمکی خەزال وێ سبێ زوو سیار کرانا دەعوەت بەلا بوو، وەکی خوەندی هنەکی هێسابن، بۆنا سبێ بکاربن ڕیا

دوور بقەدینن.

تەعریبانگا سبێ بوو، خوەندی گشک ئیدا هازر بەر دەرێ مەجیت بوون. گرمە-گرما دەف و زورنێ بوو. بەر دەری تەختە ڕاست کربوون کێف دکرن، شا دبوون. ئەوانا حەتا دو-سێ سەحەتا ئوسا کێف کرن، پاشێ باڤێ ئاحمۆ ئەشقا مالا باڤێ خەزالێ، دێ باڤێ وێ ڤەخوەر و گۆتە مەجیت:

– مەجیت، برێ من، پزمامێ من، ئەز زەعف برێ خوە ڕازی مە. تو تمێ وا سەرفنیازی ڕووسپیبی، ئەم ئوسا ژی ژ جیناریێ تە، مەرڤێ تە، ژ گوندیا زەعف ڕازی نە، ئێد کو ئیرۆ دو ڕۆژە ئەوقاس زەحمەت کشاندن و ئەوقاس ب قەدر و قیمەت بوون. دە گەلی برا و پزماما، هاتیە چووینە، دەستوورا مە بدن ئەم بووکا خوە ببن. ئەوی گۆت و کاسا خوە ڤەخار. مەجیت و گوندیا ڤا ڕازیبوونا خوە دانە وان و دەستوورا بووکێ دان. جهێزێ خەزالێ کرنە ئاڤتۆیێ، تێدا جی کرن، پاشێ ب دەف و زورنە ئەو ژ مال دەرخستن. سێدا کەتبوو ملێ وێ، ئاحمۆ ژی پەی وان دچوو. خەزال و دێ دگریان؛ ئەوێ دێ و باڤێ خوە ڕامووسا، خاترێ خوە ژ هەڤال و هۆگرێد خوە خوەست و ئاڤتۆیێ سیار بوو. ئاڤتۆ ڕێ کەت...

بوو ئیسکە-ئیسکە خەزالێ. ئاحمۆ، کو ئەڤ یەک دیت، دەستێ وێ گرت و نەرم گوڤاشت و گۆت:

– عەزیزا من، لێ ڕۆژا ها مەری دگری؟

ئاحمۆ خەزال دەزمال دەرخست هێسرێد وێ پاقش کر.

خەزالێ وی نهێری، پاشێ سێدایێ، یا کو کێلەکا وێ ڕوونشتبوو و کەر بوو، سەرێ خوە کرە بەر خوە.

ناڤا چەند سەحەتادا ب ئەشق و کێف ئەوانا گهیشتنە نەحیا ئارتاشاتێ، کیدەرێ کۆمە کور و قیز هاتنە پێشیا وانا. تەڤا زووتر بەلگا دیا ئاحمۆ گهیشتە بووکا خوە و ئەنیا وێ پاچ کر، بەر ڕەقسی و برە مالێ.

سێ ڕۆژا تەمامیا گوندیا دەعوەت کر و ب کێف و ئەشق شایا ئاحمۆ و خەزالێ دەرباز کرن.

پاشی دەعوەتێ ئاحمۆ و خەزال چوونە ناڤا باخ، بن دارەکە زەردەلا یە هێشیندا سەکنین، دەڤەکێ چەعڤێ هەڤ نهێرین و کەنیان...

# ڕەڤا ڕحانێ

## ١

زڤستان بوو، زڤستانەکە سار. بەرف قاسی بەژنا مەریا کەتبوو دەری کولەک ختماندبوو، ڤزنیا بایێ بوو، ئێ کو دکرە باگەر، فزلدوومانەکە ئوسا، وەکی چەعڤێ مەریا نەدگرت دۆر بەرێ خوە بنهێرە. ئەو باگەرا ئۆرتا خاچ و خدرنەبیدا بوو. بنەلیێ گوندێ سەنگەرێ شەبەقدا ڕابووبوون بەرفا بەر دەرێ خوە، سەر خانیێ خوە، پاقش دکرن. ئیرۆ گشکە ڕۆژی بوون. ئیدا ڕۆژیا پاشن بوو. سفەترێ گەرە عەید بوویا، لەما ژی گشکا بەر دەرێ خوە تەمز دکرن، نە گەرەکێ مەری بهاتانا، مالێد وانا، عەیدا وانا بمبارەک کرنا. پاشی شوخول قیزێ گهیشتی تۆپ دبوون تۆتکێ شۆر دپەعتن. مالا حەسەنێ پیرێدا ژی تۆتکا شۆر دپەتن. ئەو چار قیزێد بەرمراز بوون، چار هەڤال؛ بەسۆ، زۆزان، ئالماست و ڕحان، قیزا وێ مالێ.

دلێ هەر یەکێدا نێتەک هەبوو، گەلۆ کێ خەونێدا وێ ئاڤێ بدە وانا. وانا گازی خودێ دکر وەکی زوو ببە ئێڤار، وەکی تۆتکا بخون و ڕازێن، خەونێ حزکریێ دلێ خوە ببینن.

– ڕحان، تو ڕاست بێژە، دخوەزی کێ خەونێدا ئاڤێ بدە تە؟— ئالماستێ گۆت:

– ئالماست، تو چقا بێفەعمی، چرا کێ نزانی ڕحان دخوەزە وەکی مراد، مرادێ شڤان، ئاڤێ بدە، ئەوی و ڕحانێ زوودا چەعڤ بەردانە هەڤ. گاڤا ئەو چەعڤ وی دکەڤە تو یێ بێژی ڕوحێ وێ تەزە دبە، دنیا وێ ڕۆن دبە، ئاوا ب حەنەک بەسۆ گۆت.

ڕحان سۆر بوو، دها ڕند بوو. هەرگە سوورەتێ وێ مینا گولا بوون، نها سۆر بوون، بوونە مینا خاشخاشکا.

– دە، ڕحان، شەرم نەکە، چرا سۆر بوویی، ئەم گشک ژی بەنگی نە. ئەز مەسەلە ب دل دخوەزم، وەکی سووتۆ بێ خەونا من، ئاڤێ بدە من، زۆزانێ گۆت.

– دە قیزنۆ، بەسە، وەرن ڕوونین-دیا ڕحانێ، خەزێ، گۆت،- ڕابن، دەرەنگە. ئارێ "خدرنەبی"، ئەلەککن. قیز ڕابوون، هەر یەک چوو مالا خوە. ئەوانا سۆز دانە هەر شەبەقێ

مالا حەساندا تۆپ بن و هەڤرا گلی کن کێ چ خەون دیتیە.

ڕحانێ پاشی فتارێ خوە خەملاند و دەست پێ کر مالێ پێ ئار بنەقشینە. ئەوێ سەر دیوار قلافەتێ کولفەتێ مالێ گشک لێکر، پاشێ قلافەتێ پێز و دێوێر پێ ئار لێکر. پاشی وێ یەکێ ئەوێ خێلی ئاڤیتە سەر سەرێ خوە و ئارێ "خدرنەبی" ئەلەک کر، دانی سەر ستێر، شەر ئاڤیتە سەر و گۆت:

– دایێ، ئەز زەعف تی مە، فرە ئاڤ ڤەنەخوم، چ دبێژی؟

– نا قیزا من، حەتا نها تە بەر خوە دایە، هنەکی ژی بەر خوە بدە. ڕابە، تۆتکا خوە بخوە و ڕازێ.

ڕحان ڕابوو چوو تۆتک ئانی ئانجاخ هنەک خار، کەریێ دنێدا بن بەعلگیێ خوە و ڕازا.

شەبەقێ شەڤدا ئەو و دێ ڕابوون، تەندوور دادان، ساڤار ئاڤیتنێ، ئەو دەر دانە هەڤ و ڕوونشتن. ڕحانە مەعدەمکری بوو، دیا وێ پرسی چ بوویە، ئەوێ دێرا نەگۆت. وێ سەحەتێ هەڤالێد وێ هاتن. ئەوانا چوونە دەرێ مالێ و هەر یەکێ خەونا خوە گلی کر.

زۆزانێ ب ئەشق گلی کر چاوا سووتۆ پێ شەلبکەکی مەزن ئاڤ دایێ، بەسۆ و ئالماستێ ژی ب دلەکی شا خەونا خوە گلی کرن.

ڕحانە مەلوول بوو. پێشیێ هەڤالا شابوونا ئەو یەکا تەخمین نەکربوون. گاڤا سریا ڕحانێ هات، ئەوانا تەزە تەخمین کرن، وەکی هەڤالا وانە بێکێفە.

– ڕحان، چ بوویە، دڤە تە یەکی دنێ خەونا خوەدا دیتیە؟ ئالماستێ پرسی.

ڕحان سەرێ خوە هەژاند، دخوەست بگۆتا نا.

– ئاخ نزام ئەو چ خەون بوو، من دیت، لێ حەتا ناها ژی بەر چەعڤێ منە ئەو مەرا، کو ستوێ مراد ئالیا و نەهیشت ئەو ئاڤێ بدە من، – ڕحانێ گۆت و کەسەرەکە کوور هاتێ.

قیزکا چەعڤێ هەڤ نهێرین، مەلوول بوون و ژ ڕحانێ هیڤی کرن، وەکی خەونا خوە یەکۆ-یەکۆ شرۆڤە کە.

– من دیت، وەکی ئەز زەعف تی بووم، ئاڤ تو جیا تونە بوو، من دکرە قازین، قیرین، کەسە تونە بوو، ئەز ناڤا دەشتەکە مەزندا تەنێ بووم.

ئەز بەر زنارەکی ڕوونشتم و گریام، من نهێری نشکێ ڤا مراد من ڤا دەرکەت، جێرەک تژی ئاڤ دەستێدا. پێشیێ من شەرم کر، پاژدا چووم، پاشێ من وی نهێری، ئەو دکەنیا،

بەر ب من دهات و جێرێ ئاڤێ درێژی من دکر. هنگێ ئەز بەر ب وی چووم، گاڤا من دەست ئاڤیتە جێر نشکێ ڤا ژ پش زنێر مەعرەکی تەرکی دەرکەت و لنگێ مراد ئالیا.

من کرە قووژین، جێر ژ دەستێ من کەت، بوو دو جیا. مەر ژ لنگا گرتی حەتانی قەفەسێ مراد ئالیا بوو. من کرە ڤیرین ئەز بەر ب مراد چووم، لێ ژ ڤیرینا خوە ئەز هشیار بووم، من نهێری خەونە...

ڤیزکا گشکا لێڤا خوە گەست.

– خودێ بدە خاترێ ناڤێ خوە، مراد گونە یە، تایێ تەنێ یە، وانا گۆت و ئوسا مەلوول چوونە هوندورێ مالێ، کیدەرێ ئیدا جینار تژی ببوونا بۆنا هەڤرا بچوونا مالا سەیدۆ ئاغا.

گشک ژێ دترسیان.

ئیدا سبە رۆن ببوو، گاڤا گشک بەر ب مالا سەیدۆ ئاغا چوون. دوورڤا ژ مالا وی دەنگێ دەف و زورنێ، دەنگێ کەن، خەبەردانێ دهات. گوندیێ فەقیر بەر دەری سەکنی بوون و جولعەت نەدکرن هەرنە هوندور، چمکی پێشکێشا وانا ڤێ جارێ هندک بوو، تەنێ پەزەک بوو.

ئەوانا دترسیان، وەکی سەیدۆ ئاغا پارا بدە و ژ وانا بخەیدە. ناڤ واندا قاسم هنەکی جولعەت بوو پێشییێ چوو و گۆت: – مالا وە ئاڤا بە، پەی من وەرن، چما گەرە بخەیدە، ئەم چقاس عەیدە پێشکێشا ژێرا تینن، ژ دەڤێ کولفەتێ خوە دبرن، ڤێ جارێ ژی قەوەمتا مە ئانجاخ گهیشتە میکێ، جارکە ماین ئەمێ تشتەکی دها رند بینن.

ئەوانا هنەکی پێشدا چوون. عەیدا سەیدۆ ئاغا و کورێ وی بمبارەک کرن و کەرە-کەر پاشدا ڤەگەریان. گاڤا دەرکەتنە دەرڤا ئەوانا ئازا بینا خوە کشاندن، گوندیکی گۆت:

– شکر ڤێ جارێ دەنگێ خوە نەکر، هنەکی سەرخوەش بوو...

٢

ژ رۆژێد "خدرنەبی" دو-سێ مەهـ دەرباز ببوو، لێ رحانێ نکاربوو خەونا خوە بیر کرا، ئەوێ ژ ڤێ رۆژێ ب دلێ کول، چەعڤێ هێسر، بەرخ و کارا دنهێری. ئەوێ گەلەکی ژ پێز حز دکر، لێ بەختێ وێرا پەزێ مالا باڤێ وێ هندک بوو -چار می و بەرانەک. چقاس رۆژ بوو ئەوێ دچوو گیها وانرا دانی و بال وانا رووندشت ئالف ددا وان. ئەوێ دەردێ خوە

پێزرا گلی دکر، پەزێد کو بەر دەستێ مراد بوون. ئەوێ سەرێ وانا مز ددا، چەعفێ وانا پاچ دکر، کەلا وێ تژی دبوو ب دلەکی کول دگریا.

–ئاخ، هوون حەیوانەتێ بێ زار و زمان، هوون حوبا دلا قە فەعم ناکن. هوون پرس ناکن چما گەلۆ ئەز وە پاچ دکم، نە ئاخر هوون هەر ڕۆ وی دبینن. ئاخ حەیف هوون نکارن کولا دلێ منە گران بێژن.

ڕۆژەکێ ڕحان تەڤی ئالماستێ و بەسۆ، کیها پشتێ دچوو مالێ. ئەوانا خەبەر ددان، دکەنیان، لێ ڕحان مەلوول بوو.

– ڕحان، چما مەلوولی، چ بوویە؟– هەڤالا ژێ پرسی.

– هوون نزانن چ بوویە؟ ئەڤا چەند ڕۆژە دیا من نەخوەشە، لێ ئیرۆ زەعف تەعلە. دنیا سەرێ من بوویە دۆژە.

– تشت ناکە ڕحان، سەبر کە، خودێ ڕحمە، چ دترسی، کێ نەخوەش ناکەڤە، دیا تە تمێ ژی نەخوەش دکەڤە، پاشێ شکر پاک دبە– بەسۆ گۆتێ.

– نا، ڤێ جارێ مینا هەر جار نینە، تشتەکی ناخوە، ئانجاخ خەبەر ددە.

ئاوا ب خەبەردان ئەوانا گهیشتنە بەر دەرێ سەیدۆ ئاغا، کیژان نێزیکی مالا حەسان بوو. جاسمێ کورێ ئاخێ بەر دەری سەکنیبوو. ئەوی ژ سەری حەتانی لنگا قیزکا نهێری و ب دەنگەکی بلند گۆت:

– ڕۆژخێرا وە، قیزنۆ، هوون چقاسی لەزن، وەکی سەلەمێ ژی نادنە مەرڤ. هوون ژ کو تێن ها؟

– ئەم کو تێن، ناڤینی کو، کیها پەزرا تینن، – ئالماستێ گۆت و لەز چوو.

– دە پاک، قیزکا دەلال، چاوا تێ کڤشێ تو زەعف لنگێ خوە گوهێ خوە دخی، ئەزێ هەقێ تە بێمە دەر. لێ حەیف ڕحان تەڕا نە... یانێ نا من تو ئوسا بەرنەددای، – جاسم گۆت و چوو مالێ. وی وەختی ژی ڕحان گهیشتە مالێ، لێ وێ جارێ بال پێز کەلەکی نەسەکنی، لەز کیها، ئاڤدا وانا چوو هوندور، تەلبێ دیا خوە یە نەخوەش.

خەزێ ناڤ جیدا بوو، سەر پشتێ پال دابوو، چەعفێ وێ گرتی بوون، خوودانێ زیک–زیک سەرا ئاڤیتبوو. ڕحانێ قاسەکێ لێ نهێری و کر هەرە، وێ ترێ دێ ڕازایە. خەزێ چەعفێ خوە ڤەکر قیزێ نهێری:

– ڕحان، عەمرێ من، وەرە کێلەکا من ڕوونێ، ئەز تێر تە ببینم، دڤە ئیدا تە نەبینم، ئاخ

من چقاس دخوست دەعوەتا تە بدیتا، چاوا یا خووشکا تە، برێ تە دیت و پاشێ بمراما. دها ئەز نزانم تو یێ کێ بستینی، بەختێ تەیێ چاوا بە. یا سەیرانا خووشکا تە و کنۆیێ برێ تە ئەز ئیدا زانم، پری-هندکی خوەڕا دژیم. ئاخ، قیزا منە هەرە حزکری، لێ بەختێ تەیێ چاوا بە، تو یێ بێ من چ بکی؟ تشتەکی تەنێ، لاوێ، خەبەرا دیا خوە بیر بینە، تمێ گورا باڤێ خوەدا بە، خەبەرا وی دەرنەیێ...

ئەڤ گلیێ دێ مینا تیرەکە تووژ دلێ ڕحانێدا دچوون و دلێ وێ یی برین هێ دشەوتاندن. ئەوێ نزانبوو چ بێژە، دلێ وێ دشەوتی، ئاگر-ئالاڤ پێ کەتبوو، هێسرێ وێ مینا تەڤی-تەیرۆکێ ژ چەعڤێ ڕەش دبارین. ئەوێ خوە ئاڤیتە سەر جیێ دێ.

– دایێ، تو چما تشتێ ئوسا دبێژی، تو تمێ ژی ها نەخوەش کەتی، تو یێ پاک بی، خوەڕا تشتێ ئوسا نەبێژە.

خەزێ کرە نەعلین و گۆت:

– نا، قیزا من، ڕاستە ئەز تمێ ژی نەخوەش کەتمە، لێ ڤێ جارێ ئەز نکارم... بینا من دچکە. ئەز ئیدا زانم، وەکی ئەزێ ...

وەختێ خەبەردانا دێ و قیزێ کنۆ و سەیران ژی هاتن جەم دیا خوە. ئەوانا ژی سەنگەرێدا دمان.

گاڤا خەزێ ئەوانا ژی دیتن بەشەرا وێ خوەش بوو.

– شکر ڤێ گاڤێڕا هوون هاتن، کۆما من سەر هەڤە، دە ناها ئەز دکارم ڕحەت بمرم.

کنۆ و سەیرانێ خوە ئاڤیتنە سەر جیێ دێ پاچ کرن.

– دایێ، تو ئوسا نەبێژە، ئەم بێی تە چرانن؟

– نا، ئەزێ بمرم، لێ حەیف من نەدیت بەختێ ڕحانا منێ چاوا بە. کنۆ، تو و سەیران ئیدی مەزنن، گوهێ وە سەر ڕحانێ بە.

ئاوا وانا حەتا دەرەنگ خەبەر دا، پاشێ چوونە مالێ بال حەسەن. دیسا ڕحان تەنێ بال دیا خوە ما. ئەو کەلەکی روونشت. ژ شەڤێ گەلە دەرباز ببوو، خەزێ ئیدا تەمژی بوو، ڕحان شا بوو، لحێف بەردا کرە خارێ و چوو وەکی ئەو ژی هنەکی ڕەحەت بە.

ڕاستە ئەو چوو ڕەحەت بە، لێ فکرا وێ بال دێ بوو، ئەوێ هەما کنجا ڤا پال دا، گەلە وەعدە نکاربوو ڕازا، سەر خەبەرا دیا خوە دوشرمیش دبوو، بەر چەعڤا دبوو مژ، دوشرمیش دبوو، چرا دێ ئەو خەبەر گۆتن، گەلۆ دبە دێ ڕاست دگۆت، وەکی وێ، ... ئاخ،

نا، نا، دیا منێ پاک بە، ئەوێ دل ددا بەر خوە، ئەو نکارە من تەنێ ستوخار بهێلە، نا، ئەو خورا دبێژە چمکی ڤێ جارێ هنەکی خرابە.

ب ڤێ فکرێ ئەو خەورا چوو. وێ چاخێ حەسەن هاتبوو بال خەزێ.

– خەزێ، چاوانی بەختێ تە مە، مە زراڤ قەتی نەکە، تە زارۆ ترساندنە، سەیران، کنۆ هاتنە بال من گەلەکی مەلوول بوون، نەدخوەستن رازێن، من زۆرێ شاندن، وەکی هنەکی رەحەت بن. لێ رحان ژ رۆژا تو نەخوەشی حەتا ناها دچە تێ، تویێ بێژی سەرژێ کریە، نە خەبەر ددە، نە کەن بەر دێڤ دکەڤە.

– ئاخ، حەسەن، من زەعف دخوەست، نەمراما، من بدیتا رحانا من بەختەوارە، لێ چ بکم ڤێ جارێ ئەز زەعف خرابم...

– خەزێ، دە بەسە، هنەکی بەر خوە بدە. ئەز تەرا گلیکی بێژم، لێ تو هەلا نەبێژە رحانێ، تویێ گەلەکی شا بی کاڤا سە کی. رحانا مەیێ بەختەوارە. ئیرۆ من گلیکی وا سەکر: کورێ سەیدۆ ئاغا، جاسم، رحانا مە دخوەزە، لێ دێ باڤێ وی ناخوەزن، دبێن کورێ ئاخێ نکارە قیزا کەسیبا بستینە. لێ جاسم دبێ خێنجی رحان ئەو تو قیزەکە مایێن ناحەبینە. دیا وی، باڤێ وی ئەوا مەهەکە زمانێ خوەش دکن–ناکن پێ نکارن، باڤێ وی ترس لێ فراندنە. جاسم لاڤا دیا خوە کریە و دێ زۆرێ باڤ دایە رازیکرنێ. ناها وێ ڤان رۆژا بێنە مالا مە رحانێ بخوەزن.

– ئاخ، حەسەن، ئەز نە کو شا بووم، دها کولێ من هەڤ رابوون. ئالیکی ڤا پاکە، وەکی مالە خوەشە، دەولەتی نە، لێ ئالیێ دنێ ڤا خرابە، وەکی ئەم کەسیبن، ئەوانا دەولەتی. وێ هەر رۆ تێکنە قار بدنە سەرێ قیزا من. ئالیکی ڤا ژی رحان ب تەخمینا من ئەوی ناخوەزە، ئەوێ منرا نەگۆتیە، لێ ئەز تێ دەردخم حوبا وێ سەر مرادە.

– مراد... قیزێ تو چ دبێژی؟ مراد شڤانێ وانە. ئەو ئاغا قیزا تە دخوەزە و تو نەقایلی. رحان تشتەکی نزانە، وەکی پێ بحەسە وێ گەلەکی شا بە، ژنک تو چ دبێژی؟

– دە حەسەن، ئەز دبێژم، برا قیزا مە ئەوی نەستینە، کیژان بەلانگازی خێر وانا دیتیە، وەکی ئەم ببینن؟ کورا ئەوی قیزا منە بەلەنگاز دیت، لێ دبە دەرەو بە، کێ تەرا گۆت؟

– دەرەو نینە، منرا ئیبۆ گۆت، بەردەستیێ جاسم، ئێ کو شەڤ و رۆ مالا وانە.

– ئاخ، حەسەن، من دخوەست گەلە خەبەر دا، لێ ئیدا نکارم، تاقەت ناکم ... ئە.. ئە.. چ ... چاپ.. ئە.. ئە..

حەسەن دەستێ وێ گرت مزدا، ئاڤ دایێ. و ئاوا حەتا بەربانگا سبێ حەسەن بەر نڤینێ کولفەتا خوە ڕوونشت.

بەربانگێ حەسەن سەرێ خوە دانی هنەکی ڕازێ، خەزێ ژی تەمژی بوو. حەسەن هشیار بوو و دیت خەزێ ڕوونشتبوو و گازی ڕحانێ، زارا دکر. گونێ وانا ستویێ تە... زوو... گا... زی... کە...

حەسەن چوو دمین گشکا کر، ڕحان، سەیران، کنۆ هەڤرا هاتن، لێ دەرمنگ بوو، خەزێ سەر پشتێ کەتبوو، سەرێ وێ بەردا هاتبوو، چەعڤێ وێ تەنێ ڤەکری بوون، تەیێ بگۆتا هشیارە ڕیا وان دنهێرە، کرە قیژین.

– دایێ، عەزیزا من، چرا ئوسا دنهێری، ئەم هاتنە، دە بێژە، تە گازی مە کربوو، دە بێژە... لێ دێ ئیدا تونە بوو... سەیران، کنۆ، حەسەن فەعم کرن، وەکی خەزێ ئیدا تونە، مینا دینا خوە ئاڤێتنە سەر مەیتێ وێ، لێ ڕحانێ تەزە فەعم کر، وەکی چ قەومیە.

– ئاخ، دایێ، تە چ کر، تە چما ئەز تەنێ هیشتم...

ئەز ئیدی کێڕا بێژم دایێ...

جینار هاتن تژی مال بوون، بەر دلێ واندا هاتن.

٣

سبە بوو، سبا بهارێ یە هێنک. بهار چقا خوەشە، مەها بهارێ یە عەولن، تو یێ بێژی حەموو قیز، خۆرتێ جاهل ڤێ مەهێدا گول ددن، حزکری و شا دبن. لێ ڕحانێڕا ئەو مەها خوەش، ئەو مەها کو ئەوێ گشکا زەعفتر حز دکر، ئیسال تونە، بێژی وێڕا نەهاتبوو. ئەوێ گەلە دخوەست مینا هەر جار چیا و بانیا بنهێرە، ئێد کو هاقا حز دکر، ئێد کو ژێڕا تو یێ بێژی دکەنیان، لێ بهارا ئیسالن هەر تەنێ ژێرا کول و دەرد ئانی بوو.

پەی مرنا دێرا ٣-٢ مەهـ دەرباز ببوو، لێ ڕحانێ ژ دلێ کول چقاس هێسر ڕێتبوو سەر سوورتێ مینا گولێ سۆر.

ئەوێ باوەر نە دکر، وەکی ئەوە بێ دێ یە و چقا جار بوو دچوو سەر مەزالێ وێ، ڕوودنشت، چ دەردێ وێ هەبوو ژێڕا گلی دکر.

ئەوێ کولیلک دچنین عەزیز-عەزیز گرێددان، باق-باق دادانی سەر مەزالێ دێ دکەوگری دگۆت:

"دیا منه عەزیز، ته کولیلک گەلەکی حز دکر، ئەزێ تەڕا هەر ڕۆ بینم، مینا هەر جار، لێ وەکی نەچلمسن ئەزێ پێ هێسرێ خوە وانا ئاڤدم" و ئاوا ئەو هەر ڕۆ دهات، کولیلکێ تەزە دانی، گەلەکی ڕوودنشت، دگریا، دلێ وێ دادانی و دچوو. هەر جار مەریک پەی وێ دهات، لێ ئەوێ نەددیت، ئەوی خوە ڤەدشارت و وەختا ئەو دچوو دیسا پەی دچوو حەتا گوند. ئەو ژی تەڤی ڕحانێ دگریا، ڕادبوو دزیکا ڤا دچوو خوە نیشانی وێ نەددا. دلێ ڕحانێ هەلا شکەستی بوو و ئەوی عەیب حەساب دکر هەرە بالێ و دەرهەقا کولا دلێ خوەدا خەبەر دە. ئەو خۆرت مراد بوو، حزکرییێ ڕحانێ.

ئیرۆ مینا هەر ڕۆ ڕحان کولیلک دەستدا مەلوول و سەری بەردا ڕیا خوە یە هەر ڕۆدا دچوو. دەنگ-حس جیکی نەدهات، تەنێ جارنا ل بەر لنگێ وێ دبوو خشە-خشا هێشنایێ، یان ژی سەر سەرێ وێڕا دبوو چیڤە-چیڤا چڤیکا دفریان. ڕحانێ سەرێ خوە هلدبری، وان چڤیکا دنهێری و دلێ خوەدا دگۆت: "ئەڤانا چقا بەختەوارن، نە دەردێ وان هەیە، نە کولا وان، ئازا نە، کودا دخوەزن دچن، چ دخوەزن دکن".

ئەو ئاوا دوشورمیش دبوو گاڤا دەنگەک سەکر. ئەوێ ترێ وێ کرە گازی، لێ نا، - ڤێ جارێ ئیدا نێزیک ڤا ئەوێ دەنگ سەکر و سەرێ خوە هلبری، مراد بەر ب وێ دهات.

ڕحان جیدا سەکنی، چۆکێ وێ سست بوون. چەعڤێ وێ ڕەشەڤە دان، سوورەتێ سۆر بوونە مینا گول و لێڤێ سۆرە کاخەتی نەرم چوون-هاتن.

مراد... و ئیدا نکاربوو تشتە بگۆتا. وی چاخی مراد نێزیکی وێ بوو.

- ڕۆژا تە خێر ڕحان، عەمرێ من! تو ژ من نەخەیدە ئیدا من نکاربوو، دەردێ من هاقا زەعفن، وەکی من نکاربوو تو نەدیتای و تەڕا شرۆڤە نەکرا.

- مراد، تو چ دبێژی، برا دەردێ تە تونە بن، تو چما ئوسا دبێژی، شکر دیا تە پاکە، نەخوەش نینە، حالێ تە پاکە، ئیدی چ دەرد و کول، کولفەتێ مالا وێ نە گرانە، تو یی و دیا تە.

- ئێهـ، ڕحان، تو هەلا زارۆیی، هەلا نزانی چ دلێ مندا نە، زارەکە ئوسانی، چاوا چەند سال پێشدا، وەختێ مە چەعڤگرتۆک دلیست و تە گشکا زەعفتر تەڤ من دخوەست بلیستا.

لێ ناها ڕحان، ئەز ئەو زارۆ نینم، ڕاستە من بەرێ ژی ژ تە حز دکر، تمێ مە تەڤ هەڤ دلیست، لێ نها جوورەکی ماین ئەز تە حز دکم، تو ناها منڕا حەموو تشتی، دنیا منە

ڕۆنی، ڕحان، ئیشقا چەعفێ من، بێی تە ئەز نکارم بژیم. تمێ دخوەزم بال تە بم، تەڕا خەبەردم و تە بنهێرم. ژ وێ ڕۆژێ ٤ مەهـ دەرباز بوویە، چ دیا تە یە ڕەحمەتی وافات بوویە، تو هەر ڕۆ تێی ڤرا و ئەز ژی تەڕا نم تمێ، ئەز نکارم تە تەنێ بهێلم. ئاوا تە فەعم کر دەردێ من، کولا من چی یە، ڕحان؟

دە چرا کەر بوویی، خەبەر دە!

– ئاخ، مراد، ناها نە وەختێ تشتێ ئوسانە، دلێ منی بریندارە، ئەز نزانم چ دکم، هاژ سەرێ خوە تونە مە. دیا من گەلە ستوێ من خار کر، ناها دەرهەقا تشتێ ئوسادا خەبەر نەدە.

ڕحان ئاوا گۆت و بەر ب مەزەلێ دیا خوە چوو. مراد پەی وێ چوو و هێدی گۆتە ڕحانێ:

– ڕحان، بباخشینە، دەلالیا من، من شاشی کر، گەرە من تەڕا نەگۆتا، لێ چاوا بکم ئەز نە گونەکارم دلێ منی بریندار گونەکارە، ئیدا من نکاربوو بەر خوە بدا. نا ڕحان، ئەز نکارم بێی تە تەیاخ کم، گەرە تو تشتەکی بێژی.

ڕحان دەقەکێ سەکنی حەتا مراد نێزیکی وێ بوو، پاشێ گۆت:

– مراد، تو دخوەزی ئەز بێژم، تشت دەستێ من نایێ، ئەز چ دکارم بێژم، گەرە تو بێی بال باڤێ من، پێڕا خەبەر دی، ئەو زانە.

– ڕحان، ئەڤ بوو گۆتنا تە، ئاخر چاوا ئوسا دبێژی، بەلکی باڤێ تە تو نەدای من، هنگێ ئەز چ بکم؟ تو خوە بێژە، من دخوەزی یانێ نا، لێ ئەزێ باڤێ تە سەروەخت کم.

– مراد، وێ یەکێ ژ من پرس نەکە، ئەز چ بێژمە تە؟ ڕحان، گۆت و سۆر بوو. هنگێ مراد فەعم کر، وەکی ڕحان شەرم دکە، ناخوەزە گلیێ ڕاستیێ بێژە، لێ چەعڤێ وێ ڕاست دبێژن، وەکی ئەو مراد حز دکە، ئەو ژی بێی وی نکارە بمینە، ئەو ژی مینا وی گەلە جارا گریا یە و خوەدا کەلیا یە.

مراد ئەڤ گشک فەعم کر.

– دە، ڕحان، وەکی ئوسانە ئەزێ دیا خوە و دو مەریێ دنێ بشینمە بال باڤێ تە، برا نێتا وی بزان بە.

ڕحان شا بوو، وەکی مراد نێتا وێ فەعم کر.

– ئەرێ مراد، ئوسا دها پاک دبە. ناها هەرە، ئەز دخوەزم تەنێ هەرم بال دیا خوە، پێڕا خەبەر دم. هەرە، نە پاکە یەک مە ببینە.

مـراد چوو، ئەو زەعف دوور نەكـەت، بەر تلمـەكى سـەكنى حەتا ڕحـان هات و پێـرا چوو حەتا گوند، لێ ئوسـا، وەكى ئەو نەبینە، شەرم نەكە.

٤

ئیرۆ مـالا حـەسـەندا گـەلە مـەری هەبوون، ئەوانا هاتبـوون خـازگینیێ ڕحـانێ. گـشک شـا دبوون، دكـەنیـان. ڕحـان، هەڤـالێد وێ، زۆزان و ئالامـست، كۆخـدا، ڕوونشـتبـوون و خـەبەر ددان.

– ڕحـان، لێ سـەیدۆ ئاغـا هاتیـە، باڤێ تە ژی قـایلیـا خـوە دا، تو ژی ناخـوەزی وێ چاوا بە؟ مرادێ بەلەنگاز، وەكی پێ بحـەسە وێ چ بكە... – ئالماستێ گۆت.

زۆزان ڕحانێ نهێری و گۆت:

–ڕحان، ئەز هەرم بێژمێ، دبە ئەو تشتەكی بكە.

–ئێ، زۆزان، تو چ دبێژی، فەقیری وێ چ بكە؟ – ئالماستێ دلۆڤانی گۆت. ڕحانێ هەڤالێد خوە نهێری، ئێمەكێ فكری پاشێ خەبەردا:

– نا، دهـا پاكـە، بـرا ئەو نزانبـە، زۆزانێ ڕاست گـۆت، فـەقـیـری وێ چ بكە؟ نە دكـارە خـەبەردە، نە شـەركـە. سـەری بـاڤێ من بوو، وەكی ئەوی ئەز نـەداما وانا تشـتـەک نكاربوو بكرا، من هـاقـا لاڤـا كـر، گریام، لێ تشـتـەكی ژی ئالی من نەكر، ئاخ، دیا من، نـاهـا سـاخ بوویا، ئەوێ گورا من بكرا، وێ باڤێ من سەرومخت كرا... باڤێ من دبێژە "تو فـەعم ناكی، تویێ بەختـەوار بی، ئەوانا دەولەتینە، مالا وانا خوەشە، ئەز خێنجی وی تە نادم تو كەسی، دیا تە یە ڕەحـمەتی ژی دگۆت، وەكـی ئەز ئوسا بكم تو بەختـەوار بی، سـتوخار نیبی. ژ ڤی بەخـتـی پاكـتـر تو چ دخـوەزی، تو زارۆیی، ئەو ئێـشێ تە نینە، ئەزم باڤێ تـە و ئەز ژی تە ددمە وی".

دە بێژە، پاشی ڤان خەبەرێ باڤێ خوە، ئەز ناها چ بكم، چ خوەلیێ سەرێ خوە كم؟

ڕحان دگریا و دگۆت.

هنگێ زۆزان ڕابوو و گۆت:

– ئاخ یارەبی، ئەم چما ئەوقـاس بێبەختن، ئەوقاس هێسیر و ستوخـار، كەنگێ ئەمێ ژی ببنە مەری، مە ژی دەوسا مەریا حەساب كن و مە ب دلێ مە بدنە مێر؟

–ئێ، زۆزان، – ئالماسـتێ گـۆت – خـووشكێ، تە چ ئوندا كـریە، چ دكـەری. باڤێ من ژی

زۆرێ سەبا چەند کاپێکا گرت ئەز دامە وی مەرڤی، کیژان من حز نەدکر، ئاها هوون خوە خوە زانن ئەڤا چقاسە ئەز چ حالیدامە، شەڤ-رۆ دگریم، لێ باڤێ من خوەڕا دگەرە، تالاشا وی یە، ئەز چ حالیدانم. وێ دو مەهێ دنێ شووندا من سیار کر. دیا منە فەقیر گۆتێ:

"کورۆ، تو چ دکی، ئاخر ئەو کالە، لایقی ئالماستێ نینە، ئەو وی کەڤتاری ناخوەزە". لێ باڤێ من قەی بێژی ژێرا نینن، ژ جیێ خوە ڕابوو و ب هێرس دیا منڕا گۆت:

"قیزێ، تو هەرە شوخولێ خوەیی ژنا بکە، چ گلیێ حشە تە یە، تو چ فەعم دکی کێ پاکە، کێ خراب؟ ئەز زانم قیزا خوە بدمە کێ، ڕاستە دەهـ-پانزدەهـ سالا ژ ئالماستێ مەزنە، تشتە ناکە، مالا مێرکی خوەشە، دەولەتی، چرا تە سەنەکریە جماعەت دڤێ— "بکە کالا، بوخە مالا، چ بکم خۆرتێد کوندرڤالا". لێ ژنک، دە ناها هەرە سەر شوخولێ خوە، ئیدا دەرهەڤا ڤێ یەکێدا منڕا نەبێژی، من قیزا خوە دایە، چوویە". ئاوا، خووشکنۆ، ئەڤ ژی باڤێ من، ئیدا ئەم چ دکارن بکن. هەر سێ هەڤال ڕوونشتی حالێ هەڤدا گریان حەتا مێڤانێ مالا حەسەن بەلا بوون. پاشێ ئالماست و زۆزان بەر دلێ ڕحانێدا هاتن، هنەکی ژی ڕوونشتن و چوون.

گاڤا هەڤالێد ڕحانێ چوون حەسەن نێزیکی قیزێ بوو و گۆت:

– ئەڤسەنە، ئاخر تە چاوا دخوەست لنگێ خوە بەختەکی وا خستا؟ دو-سێ مەهێ دنێ شووندا وێ تە بن، هنگێ تو یێ ببینی باڤێ تە چقا پاک کر، وەکی گورا تە نەکر. ناها ئاقلێ خوە تۆپ کە، دوشورمیش نەبە، خەلقێ تە بکەنە، گاڤا سەکە تو کورێ سەیدۆ ئاغا ناخوەزی.

ڕحانێ خوە زەعفت نەکر کەلۆ-گری بوو.

– باڤۆ، ئەز نکارم مالا واندا بمینم، ئەز هین بوومە ئازا، بێ خەم خوەڕا بگەرم، لێ مالا وان مینا کەلا یە، کێ دکەڤێ ئیدا نکارە دەرێ.

– تشتە ناکە، قیزا من، تو یێ بەرە-بەرە هین بی، قە خەما نەکە.

پاشی ڤێ یەکێ ڕحانێ دیت بۆشە، نکارە باڤێ خوە سەرومخت کە، هیشت و چوو.

سبێ شەبەڤێ، پاشی شوخولێ مالێ ڕحان ڕابوو دیسا کولیلک چنین، باق-باق کر و چوو سەر مەزەلێ دیا خوە، وەکی دەرد-کولێ خوە ژێرا گلی کە و هنەکی هێسا بە. ئەو ڤێ جارێ بەر مەزەل گەلەکی ڕوونشت، گریا، کەوگری.

ڕحانێ دگۆت و دگریا. ئەوا گاڤا پش خوە ڤا دەنگێ لنگا سەکر، پارا نهێری و ڕابوو پیا سەکنی. ئەو مینا هەرجار سۆر بوو، لێڤێ نارین چوون-هاتن، لێ خەبەر ژ دێڤ دەرنەکەت، چەعڤێ ڕەش، کو هەرجار ژ شابوونا دبرقین، ڤێ جارێ تژی هێسر بوون و مەلوول بەرژێر دهێرین.

مرادێ کو تما ببوو و ڕحانێ دنهێری تەخمین کر، وەکی ڤێ جارێ کێڤا ڕحانێ قەت تونە، ئەو گەلە مەلوول و دلشکەستی یە.

ئەوی ب ترس گۆت:

– ڕحان، عەمرێ من، تو چما ئیرۆ بێکێفی، چ قەومیە، دبە خالێ من حەسەن نەخوەشە، یانێ ژی تو، ڕحان، دە بێژە، چما خەبەر نادی؟

ڕحان کەر بوو، تەیێ بگۆتا ئەوێ خەونێدا دەنگێ مرادی شیرنی نازک سەدکر. نکاربوو خەبەر دا، دەردێ خوە بگۆتایێ. نزانبوو چاوا بێژە، وەکی دلێ مراد نەئێشینە، لێ وەعدە کن بوو، وەختێ دوشورمیشبوونێ تونە بوو، ئەوێ چاوا ژی بگۆتا وێ دلێ مراد بێشاندا و گاڤا جارکە دنێ ژی دەنگێ مراد سەکر، ئێ کو چەعڤێ وێ دنهێری، ڕحانێ ئیدا نکاربوو خوە زەڤت کە، کرە ئاخین و ب گری گۆت:

– مراد، هەرە، ئیدا من بیرکە، خوەڕا قیزەکە دنێ ببینە، ئەوقاس قیزێ باش، لایقی تە هەنە، ئەز چمە تو من دخوەزی، باڤێ من ئەز دامە یەکی دنێ.

مراد جیدا سار بوو، عەرد بندا چوو-هات، سەری لێ گێژ بوو، ئەوی ئانجاخ خوە زەڤت کر، وەکی نەکەڤە.

– ڕحان، ئەو تو یی ئوسا منڕا دبێژی، تو ناڤا دو ڕۆژادا چاوا هاتی گوهاستنێ، تە چاوا ئەز بیر کرم، منڕا حەنەکێ ئوسا نەکە. ڕحان، تو چرا من دوکوژی، بێژە، چ بوویە، ئاخر مە سۆزدا هەڤ، گەرە ئەز بهاتما خازگینیێ تە، ئەو چاوا قەومی؟

– ئەو کورێ سەیدۆ ئاغا یە، مراد. ئەوانا هاتنە بال باڤێ من و ئەوی ژی ئەز دامێ، ڕاستە من گەلە لاڤا لێ کر، لێ تشتەکی ژی ئالی من نەکر، ئەوی گورا من نەکر. ئەوانا گوستیلک کرنە تلیا من. مراد، ئەز چاوا بکم نزام، لێ ئەز ئەوی حز ناکم، هەرگە تو دکاری تشتەکی بکە، من ژی، خوە ژی ژ ڤێ زولمێ خلاز کە. مراد، من ئازا کە! ڕحان گۆت و ژ چەعڤێ ڕەش سەر سوورەتێ سۆردا مینا تەڤی تەیرۆکا هێسر بارین.

گاڤا مراد ئەڤ یەک دیت دلێ وی هێ ڕابوو، ئەو وێ سەحەتێ لێلێبوو حەموو ئاغا و

دەولەتیـیـا، ئێد کـو ئەوقـاس کول و دەرد دکـرنە دلێ کـەسـیـب فـقـارێ مـینـا وان، پەرچە-پەرچەیی بکرانا ژ ڕووبارێ دنیـایێ بدا هلدانێ. لێ ئەوی چ دکـاربـوو بکرا، وەکی ڕحـانا خوە خلاز کرا؟ ئەوی جابا ڕحانێ مەلوول و دلشکەستی دا.

– ڕحان، تـو نەگری، نە ژی دوشـورمیش بە، ئەزێ تشـتەکی بکم، ئەزێ، لێ چ، نها نکارم بێژم. ئەزێ نـها هەرم مالێ دیا خـوەڕا بێژم، پاشـێ هەڤالێد خوەڕا، بنهێرم چکا چ دبێژن، پاشـێ کـەنگێ تو هاتی ڤـرا ئەزێ جـابێ بدمـە تە. لێ ناها هـەرە مـالـێ و من تەڕا چ گـۆت کەسەکیڕا نەبێژە، دوشورمیش ژی نەبە، حەتا مرادێ تە ساخـە توجار ناهێلە تو ببی ژنا جاسم ئاغا. دە هەرە، نازکا من، حەتا ئەز دوشورمیش ببم چکا چ بکم.

– مراد، دەلالیێ من، چڤا دکاری زوو بکی، ب گۆتنا باڤێ من وێ دەعواتا من زوو بکن.

و ئاوا مراد مینا هـەر جار پەی ڕحانێ حەتا پەرێ گوند چوو و وردا چوو مالێ، بال پیرە دیا خوە، چکا ئەو چ دبێژە.

گاڤا دێ مـراد دیت، ئەوێ پێرا-پێرا تێ دەرخست، وەکی ئەولەدێ وێ بێکێفە، یانێ ژی تشتەک قەومیە، بەر ب وی چوو، ترسە-ترسە ژێ پرسی:

– مـراد، سەحـەت-قـەوەتا من، تو چمـا مـەعـدەکری یی، چ بوویە، دبە تـو بێکێـفی، یان کەسە کێفا تە کەتیـە، دە خەبەر دە ئەولەدێ من، چ بوویە، دیا خوەڕا بێژە، دبە ئەز کۆمەکێ بدمە تە، دە بێژە پەرێ من!

مراد ب دلەکی کول چ کو هاتیە سەرێ وی گلی کر.

– ئەڤە مەعنە، دیا من، ئاها سەبا چ ئەزی مەلوولم. دە نها بێژە ئەز چ بکم، ئەز تو جارا ناهێلم، وەکی کورێ ئاغا ڕحـانێ ببە خـوەڕا بکە دیل. ئەز کو مرم پاشـێ ئەو تشتێ ببە. دایێ تو چاوا دێ، چـاوا دنێدیتـی و مـەزن، شـیـرەتەکـە بدە کـورێ خوە یی دلکول، چ بکم، چاوا بکم، وەکی ڕحان نەبە خورێ وی کەلبی؟

پیرەدیا مراد، یا کو پاشی ڤان گلیا سار ببوو، دەستێ وێ بەردا هاتبوون، گۆت:

– مـراد، ئەولەدێ من، ئـەز زانم تو زەعف ژ ڕحـانێ حز دکی، لێ تو یـێ چاوا بکی، وەکی هم وێ خـلاز کی، هم ژی خـوە، پیـرەدیـا خـوە. تو زانـی ڕوحێ من، بینا من تو یی، وەکی تشتـەک تە بێ، ئەزێ دین بم، بکەڤمە چۆلێ. وەرە گورا من بکە، لاوێ، پەی وێ یەکێ نەچە، تو کێ یی، کێ تە دپرسە؟ تو شـڤـانێ مـالا وانی. چڤـا ژی قـەوەت بی، یەکە، کەسـەک نایێ ئالی تە، قیزەکە، برا ببن...

مراد ئیدی نەهیشت، وەکی ئەو خەبەردە، ڕابوو. ئەو دلەرزی هێرسا.

–دایێ، بەسە وان گلیان منڕا بێژی، ئەم گشک نۆلا تە دوشورمیش دبن، لەما ژی ئەم کەتنە ڤێ ڕۆژێ. چاوا ئەز تەنێ مە، کێ تەڕا گۆت ئەز تەنێ مە، گوندی نیڤێ پرێ ژ ڕوحستینێ خوە ڕازینە، لێ ژ سەیدۆ ئاغا نە ڕازینە. لێ ئەوانا نزانن چاوا هەقێ وی بێنە دەر، وەکی یەک قەواتا خوە نیشاندە گشکێ ژی بێنە پشتا وی. ئەوی سەیدۆ ئاغایی مالا خەلقێ خراب کریە.

– دە، دەلالیێ من، وەکی ئوسانە، وەکی ڕحان ژی تە حز دکە، سۆزێ خوە بکنە یەک، مالا خوە بهێلن و هەرنە ئالیێ تلبیسێ.

کەسە هنگێ نکارە ڕحانا تە ژ تە بستینە. ئەز و تو یێ وڕا بخەبتن ئەمێ ئەبوورا خوە بکن. چەند ناسێ من ژی وڕا هەنە. گاڤا مراد ئەڤ خەبەر سەکرن ئۆرتا وی و ئەزمیندا بهوستە عەرد ما.

– دایێ، تە تشتەکی چڤاس پاک گۆت. ئەزێ ناها هەرم بال هەڤالێد خوە، وانا سەروەخت کم، وەکی کەنگێ، چ چاخ ئەم هەرن. لێ تو ژی کارێ خوە بکە، بنهێر ئەم چ خوەڕا ببن، چ نا، حەموو تشتی نەبینە، چ کو زەعف مە لازمە، ئەوی ژی بینە. دە ئەز چووم بێژمە هەڤالێد خوە، – ئەوی گۆت و ژ مال دەرکەت.

٥

هاڤین بوو. قژە-قژا تەڤێ بوو، کەتبوو گەرما نیڤرۆ. دەمێ پێزی نیڤرۆ بوو، لێ ئەو ئەگلە دبوو، چمکی شڤان تشتەکی ماین ڤا مژوول دبوو. مراد وێ ڕۆژێ هیڤیا ڕحانێ بوو، ئەو نەدهات، وەکی گلیێ خوە بگۆتا یێ، چکا ئەوێ چ دگۆت، ڕازی دبوو، یانێ نا. ئەڤ سێ ڕۆژە مراد تێ بال مەزەلێ دیا وێ، سبێ حەتا ئێڤارێ دمینە، لێ ئەو تونە. مراد کەتە متالا گەلۆ دبە ڕازییە جاسم بستینە، لەما نایێ. وێ ڕۆژێ ژی ڕحان نەهات. ڕۆژا چارا، گاڤا مراد باوار نەدکر، وەکی ڕحان بێ، ئەوی ژ چەعڤێ خوە باوارنەکر وەختا دوور ڤا تەخمین کر کو ئەو نۆلا هەر جار باقە کولیک دەستدا مەلوول بەر ب مەزەلا تێ. ئەوێ مراد نهێری و گاڤا دیت ئەو دکەنە ڕوح بەردا هات، نێزیکی وی بوو.

– مراد، تو چڤا شایی، خازیا من تە، دبە تە تشتە کریە منڕا ژی بێژە. ئیرۆ چەند ڕۆژە ئەز مرم، کنۆ و سەیران هاتبوون کارێ من دکن بۆنا دەعوەتێ، نەدهیشتن ئەز بێم سەر

مەزەلا دیا خوە ژی، دگۆتن، "ئەمێ تەڤایی هەرن". لێ ئیرۆ من ئانجاخ خوە ژ وان ڤەدزی و هاتم ڤرا. دوهـ سەیدۆ ئاغا هاتە مالا مە و گۆت گەرەکێ من هێ زوو ببن، چقاس زوو ئەوقاس باش و باڤێ من، برێ من سۆز دان سەرێ ڤێ مەهێ دەعوەتێ بکن. ما دەهـ رۆژ. زوو تشتەکی بکە مراد، ئەز نکارم، ئەزێ خوە بکوژم، لێ ناچم.

– تشتە ناکە، ڕحانا من، تو فکارا نەکە، ئەزێ ئوسا بکم، وەکی تو جەم من بی.

مراد ڕحانێرا، چ کو قرار کربو یەکۆ-یەکۆ گۆت. ڕحان شابوونا گریا، خوە ئاڤێتە ملێ مراد: "دە زوو من ئازاکە". گۆت و شابوونا گریا. گاڤا دلێ وێ ڕەحەت بوو مراد گۆت، وەکی پێنج ڕۆژا شووندا وێ هەرن، وەکی ئەو کار-تڤدارەکێ خوە بکە و شەڤ ئەوێ بال مالا وان هیڤیا وێ بە و ژ ورا تەڤایی وێ هەرن تلبیسێ.

– ئەرێ، مراد، ئەزێ هازر بم و هیڤیا تە بم. تەنێ زوو، ئەز زەعف دترسم، من ترێ، ئەم نکارن هەرن، وێ مە ببینن. ئاخ، مراد ئەز چقا وی جاسمی حز ناکم، من ترێ دژمنێ منی هەری خرابە. تو زوو من ژ وی خلازکە، ببە کودا دخوەزی، ئەز یا تە مە، کودا ژی ببی. جماعەت ڕاست گۆتیە: "برا دلی دل بە، برا تۆڕبێ پارسێ مل بە، برا ئەو ژی قول بە". برا ئەم بال هەڤ بن، برا تی بن، برچی بن.

– کولیلکا من، دنیا منە ڕۆن، تو ڕاست دبێژی.

ئەز وەکی بمرم ژی، ئەزی ڕەحەت بمرم چمکی زانم تو ژی من حز دکی، – مراد ب ئەشق گۆت، لێ ڕحان سۆر بوو، چەعڤێ ڕەش بەرژێر کر، عەردێ نهێری، پاشێ هلبری ب بەشەرا خوەش مراد نهێری.

– دە، مراد، ئەز هەرم، هەلا کەسەکی ئەم نەدیتنە، پێنج ڕۆژێ دنێ شووندا ئەزێ هیڤیا تە بم، – گۆت و بەر ب مەزەلێ دیا خوە چوو.

گاڤا ڕحان دهاتە مالێ، ڕێڤا ڕاستی ئالماستێ هات، و تەڤایی ب خەبەردان ئەوانا چوونە مالێ.

مالێدا ئالماستێ ژێ پرسی کو مراد پێ حەسیایە، یانێ نا. ڕحان گۆت:

– ئالماست، مە قرار کریە، یانێ بمرن یانێ ژی بگهیژنە مرازێ خوە، پێنج ڕۆژێ دنێ شووندا ئەزێ پێرا هەرم. هنگێ سەیدۆ ئاغا چ دخوەزە برا بکە، ئەز ئێدا ژ مرنێ ناترسم، برا من بکوژە، نە ئەزێ بال مراد بم، کێلەکا وی. گاڤا ئالماست ئەڤ یەک سەکر هێسرا چەعڤاڕا ئاڤێت.

– ئاخ، ڕحان، چڤا پاکە، مراد شێرە، وەکی چەند مەرڤا ژی مینا وی بکرا، ئیدا وان ئاغا ئەوقاس ڕوو نەدستەندن.

– ئالماست، لێ ئەز زەعف دترسم، من ترێ ئەو مەعرێ خەونا مندا جاسمە، ئەو چاوا ژی مابە ناهێلە ئەم بگهیژنە مرازێ خوە.

–ئێ، دین-دین خەبەر نەدە، تو چ دبێژی، هوون ئێ ئوسا هەرن وەکی ئەو قە وە نەبینە ژی.

– نزانم، ئەز ژی ناخوەزم دوشورمیش بم، لێ...

ئاوا هەردو هەڤالا حەتا دەرەنگ خەبەر دان. گاڤا ئالماست چوو ڕحانێ گۆت، وەکی بێژە زۆزان، بەسۆ ژی بێن وانا ببینە.

٦

گوندێ سەنگەرێدا گەلەکا هازریا خوە ددیت. دەعوەتا کورێ سەیدۆ ئاغا نێزیک دبوو مالا باڤێ بووکێ ژی هازریا خوە ددیت، سەیران، کنۆ هاتبوون مالێ. ئەوانا کنجێ ڕحانێ کڕیبوون، جهێزێ وێ یی دنێ هازر دکرن. حەسەن ژی تەڤی چەند جینارا پەز سەرژێ دکر. ئەوی کولفەتێ جینارا ئانیبوون سەر سێلێ نان دپەعتن. وێ مالێدا گشکا هازری ددیت، گشکا شوخول دکر، گشکە شا بوون بەشەرخوەش. وێ مالێدا تەنێ یەکێ شوخول نەدکر، تەڤ تشتەکی نەدبوو، مەلوول سەکنیبوو و دوشورمیش دبوو.

–ڕحان، تو چما مەلوولی، ئۆمدا من، شکر بەختەکی پاک هاتیە سەر تە، تو قە دوشورمیش نەبە، – ژنێد جینارا دگۆتن.

هنەکا ترێ ئەو شەرما، شابوونا ئوسا سەوس بوویە. کولا ڕحانێ تەنێ وێ ڤا عەیان بوو. ئەو وێ سەحەتێ دوشورمیش دبوو، گەلۆ وێ ئێڤارێ چاوا بە، وەختێ مراد گازیکە وێ کاربە دەرێ. وێ چاوا دەرێ، وەکی کەسەک نەبینە، وەکی تو زرار نەگهیژە مراد. یا وێ هێچ، ئەو دەرهەڤا خوەدا دوشورمیش نە دبوو، تەنێ سەبا مراد کەتبوو متالا. ئەوێ زانبوو، وەکی ڕیا وان گرتیە زەعف چەتنە. کورێ سەیدۆ ئاغا وانا ئوسا بەرنادە. زووترەکێ هەڤالێد وێ هاتنە بال. ئەوانا هنەکی خەبەر دا، لێ تەخمین کرن، وەکی ل وی جیێ خەبەر ددان، جاریا مالا سەیدۆ ئاغا سەکنیە، یا کو وانا شاندبوو بۆنا ئالی سەیرانێ بکە. ئەو بال وان سەکنیبوو و گوهێ خوە بەل کربوو خەبەردانا وان سەدکر. زۆزانێ ئەڤ یەک تێ

دەرخست و گۆت:

- ڕحان، ڤرا ئەم سەرێ ڕێ نە، ئەم ناهێلن، وەکی شوخول بکن، ئەم هەرنە کۆخ، خوەڕا لەزەکێ خەبەر دن. وانا ئوسا ژی کر.

پێرۆ، جاریا سەیدۆ ئاغا، ب نەرمێ خوە پەی وانا چوو و گوهێ خوەدا بەر دەری. هنگێ قیزکا دەرهەقا مرادێدا خەبەر ددان. ئالماست چووبوو مالا وان و پێ حەسیابوو، مراد چ کریە، وێ کەنگێ بێ پەی ڕحانێ. ئالماستێ دگۆت:

- ئەز چووم، مراد ب ئەشق بەر ب من هات، پرسا تە کر و ئەز برمە تەولێ، هەسپێ کری نیشان من کر. ئەوی گۆت نیڤێ شەڤێ وێ بێ، وی چاخی، وەکی گشک ڕازای بن. تو هازر هیڤیا وی بە. چاوا دەنگێ وی سەکی ب نەرمێ خوە دەرێ دەرڤا، کەسەک پێ ناحەسە، چمکی ئەوانا مال دانن، هەر کەس تشتەکی ڤا مژوولە. دە ناها ئەمێ هەرن، ئیدا ئێڤارێ، تو ژی کارێ خوە بکە. مراد دگۆت برا خێنجی کنجێ خوە تشتەکی هلنەدە، حەموو تشت ئەوی هلدایە. هەڤالێد ڕحانێ نێزیکی وێ بوون، ئەو پاچ کرن و هەر چار سەر هەڤدا گریان.

- ئاخ، خوەدێ، ئەڤ چ زولە تە ئانیە سەرێ مە. ئاخر چما گەرە ڕحان ژ مە بقەتیا، چما ب دلەکی کول مالا باڤێ خوە بهێشتا بچوویا جیکی خەریب، - بەسۆ دگۆت و دلوویاند، دلشەوات دهاتە ڕوویێ هەڤالا خوە.

- ڕحان مقاتی خوە بە، دوشورمیش نەبە، خورتەکی مینا مراد پشتا تە یە، دە ب خاترێ تە، هەڤالا مە یە عەزیز، ئەم حەتا خوەشن ڕووبارێ دنێ، تو جار تە بیر ناکن، زۆزانێ گۆت و جارکە دن ژی ئەو هاتنە ڕوویێ هەڤ و چوون. پێرۆ خەبەردان تەمام سەنەکر، چمکی مەری دهاتن-دچوون، گازی پێرۆ دکرن، لێ ئەوێ فەعم کر، وەکی ڕحان ئیشەڤ دخوەزە تشتەکی بکە و لەز چوو مالا سەیدۆ ئاغا، بال جاسم، ئێ کو ئەو شاندبوو بۆنا بزانبە ڕحان و مالا وان چ خەبەر ددن. چاخێ ئەو چوو مالا سەیدۆ، بەر دەری ڕاستی جاسم هات، ئێ کو تەڤی چەند هەڤالێد خوە خەبەر ددان و دەردکەتنە دەرڤا. پێرۆ خوە لەزاند وەکی بێژە جاسم، لێ هنگێ خانما وێ گازی کر: قیزێ پێرۆ، تو چما هاتی، نە من تو شاندبووی، وەکی ئالی وان بکی، چمکی حەتا سبێ ئەوانا پێرا ناگهین، ژنا مەزن مالدا تونە. زوو هەرە، بگهیژە وان!

پێرۆ چقا قودووم چۆکێ وێدا هەبوو لەزاند، هلبەت نە بۆنا وێ یەکێ، وەکی بگهیژە مالا

حەسەن، لێ وەکی خوە جاسمرا بگهینە، ژێرا گلیکە چ کو سەکریە. لێ جاسم چوو بوو، ئەوێ نەدیت. پێرۆ هنگێ دوشورمیش بوو هەرە بێژە خانمێ، لێ دودل بوو، وەکی نابە، چمکی ئەو جاسمرا پەڤ کەتیە ئەوێ بۆنا وێ یەکێ پەرا بدە، لێ خانمێ ئەو یەک نەدکر. ئەوا پێرۆ دوشورمیش دبوو دچوو، گاڤا پش خوە ڤا دەنگەک سەکر. ئەو جاسم بوو.

– پێرۆ، من تو دیتی هاتم، دبە تە تشتەک سەکربە؟ زوو بێژە، چ کو لازم بە ئەزێ بدم تە.

– ئەرێ، ئاغائێ من، راستیێ هەرگێ دخوەزی بزانی تشتەک هەیە. ڕحان ئیشەڤ دخوەزە تشتەکی بکە، لێ چ، ئەز نزانم، چمکی ئەوێ هەڤالێ خوەرا خەبەردا، دگریا، لێ مەری دهاتن-دچوون من نکاربوو پاک سەکرا چما ئەوانا دگریان و زەعف هێدی خەبەر ددان.

جاسم چەعڤێ خوە جنوو کرن، پێرۆ نهێری ب هێرس خەبەر دا:

– من ئەو زانبوو، وەکی ئیشەڤ ڕحان دخوەزە تشتەکی بکە، لێ چی یە نزانبوو، بۆنا وێ یەکێ ژی من تو شاندی، وەکی بزانبی ڕحان چ دخوەزە بکە؟ دە، نەسەنە، هان تەڕا ڤان پەرا و زوو هەرە، گوهداری کە ڕحان چ دکە، هەما شکا تە چوو تشتەکی، زوو وەرە منڕا بێژە. گاڤا پێرۆ پەرە دیت، چەعف لێ چرووسی، کەن بەر لێڤ کەت و لەز چوو.

وەختا ئەو هات، ڕحان کەتبوو کۆخ، کنجێ خوە هازر دکر. گاڤا پێرۆ مەنیا شەلبک هاتە کۆخ ڕحان لەز پارا ڤەگەریا، دیت پێرۆ یە و وێ دەمێ هەردا ب تەهەرەکی، هەڤ نهێری. پێرۆ ئوسا ل ڕحانێ دنهێری تە قەی بگۆت دخوەزە ژێ بپرسە "تو چ دخوەزی بکی، ئاخ خوەزل من بزانبوویا و سەبا وێ یەکێ گەلە پەرە بستاندا"، لێ چەعڤێ ڕحانێ دگۆتن: "گەلۆ ئەڤێ تشتەک تێ دەرنەخست، ئەو چما هاتە بال من، گەلۆ نەدیت من کنجێ خوە جی کر؟".

لێ وانا هەڤڕا تشتەک نەگۆت، پێرۆ قەست وان دەرا نهێری کو شەلبک تونە چوو.

وی چاخی ڕحان دیسا کەتە ناڤ کنجێ خوە چەند هەڤ بژارت و ئێ دنێ جارکە مایین کرە قوتیێ. ئیدا ئەوێ کارێ خوە کربوو، لێ هەلا زوو بوو، بۆنا تو شکا نەبنێ،، ئەو چوو مالێ بال سەیران و جینارا، ئێد کو بۆنا دەعوەتێ خوەرن چێ کربوون، پاشێ دیسا چوو کۆخ، ڕوونشت. دلێ وێ لێدخست، چڤا ژ شەڤێ دەرباز دبوو، هاڤا ئەو نکاربوو جیێ خوەدا هێسا ڕوونێ. ئەو دچوو-دهات، پاشێ دسەکنی، گوهێ خوە ددا سەر مالێ، لێ کەسەک هەلا ڕانەزابوو، ئەوانا دچوون-دهاتن.

ڕحانێ پارا نهێری دیت پێرۆ پڕ وێ ڤا سەکنیە.

گاڤا پێرۆ دیت، وەکی ڕحان وێ دنهێرە گۆت:

- ڕحان، سەیران دبێ برا بێ نان بوخوە، و پاشێ چوو.

ڕحان کەتە ناڤا متالا- "چما ئەڤ قیزکا ها وێ دنهێرە، دبە سەر حسە-حسا کەتیە، لێ وەکی زانبوو، گەلۆ وێ بێژە؟ و دلێ وێ دگۆت-نا. ئاوا ڕحان دوشورمیش دبوو، گاڤا دەنگێ سەیرانێ سەکر و دەرکەت.

- ڕحان، خووشکا منە شیرن، تو چما نایێی نان ناخوی، تە تشتەک نەخوەریە، وەرە منە نان بخوە و ڕازێ، تو یێ سبێ زوو ڕابی، لێ ئەمێ هەلا ڤێ گاڤێ ڕوونن. ڕحان شا بوو، وەکی خووشکێ ئوسا گۆت و بەر ب مالێ چوو. ئەوێ نان خوار، ڕابوو.

- سەیران، ئەز وەستیامە، ئەزێ سبێ زوو ڕابم، لێ هوون هەلا حەتا دەرەنگ گەرە ڕوونن، ئەزێ جیێ خوە کۆخدا چێ کم، ورا خوەشە و هێنک.

- دە، وەکی دخوەزی، ناترسی، هەرە شیرنا من، تو ئیشەڤ مێڤانا منی، چاوا دخوەزی ئوسا ژی بکە.

ڕحان چوو، پێرۆ ژی پێ-پێ پەی چوو، لێ ڕحانێ ئەو نەدیت و خوە-خوە خوەڕا گۆت:

- ئاخ، خودێ، وێ کەنگێ بێ، ئەز ئیدا نکارم، - گاڤا ئەوێ پڕ خوە ڤا پێرۆ دیت، زوو خەبەرا خوە گوهاست، - ئاخ پێرۆ سبەیێ کەنگێ بێ، ئەم هەرن؟

پێرۆ ب کەن گۆت:

- زەعف لەز دکەڤە، خانما منە دەلال، هندک ما.

تو تەنێ ناترسی، ئەز بێمە بال تە؟

گاڤا ڕحان ئەڤ خەبەر سەکرن چۆکێد وێ سست بوون و گۆت:

- نا، نا، پێرۆ تو هەرە ئالی سەیرانێ بکە، ئەو گونە یە، تەنێ یە، جیناریێ نها هەرن، ئەزێ ژی نها ڕازێم.

پێرۆ لێڤا خوە گەست چوو مالێ، تەواتی نەدکەتە، ئەوێ شوخولەک دکر پاشێ دچوو گوهێ خوە ددا سەر دەرێ کۆخ. ئیدا نیڤێ شەڤێ بوو. باران هوور-هوور دباری. شەڤەرەش بوو، شەڤەرەشەکە ئوسا، وەکی مێرڤ تلی چەعڤێ هەڤڕا کرنا هەڤ نەددیتن. مالا حەسەن گشک ڕازابوون. تەنێ ڕحان ڕانەزابوو، گاڤا ئەوێ چخکینەک سەدکر دلێ وێ

داڤیت، ئەو بەر ب دەری درەڤیا. ل ڤێ شەڤەرەشیێ و بارانێ ئوسا ژی پیرۆ ڕانەزابوو، ئەو مالا حەسەندا مابوو، چمکی دەرەنگ بوو و نەهیشتبوون ئەو هەرە.

گاڤا چخکینەک دهات ئەو ژی، ڕادبوو سەر خوە، ڕوودنشت و چار ئالی دنهێری ڕادبوو بەر ب کۆخ درەڤیا، دنهێری تشتەک تونە جارکە ماین پالددا. ئاوا حەتا چار-پێنج جارا ئەو ڕابوو.

لێ ئێ دنێ گشک ڕازابوون. خرە-خرا حەسەن دنێ هلدا بوو، ئوسا قایم دکرە خرین، وەکی نەدهیشت پیرۆ دەنگا سەکە.

وی چاخی ڕحان سێ جارا دەنگەکی مینا دەنگێ چڤیکا سەکر. ئەوێ زانبوو ئەو مرادە، ئازاداریێ وێ یە، لێ چاوا هەرە، وەکی کەسەک پێ نەحەسە، دلێ وێ داڤیت، دەستێ وێ دلەرزین.

ئەوێ خوە-خوە ژی نزانبوو چما دگریا، دەستێ وێ درجفین. ئەوێ هدیکا دەری ڤەکر، نهێری کەسەک تونە هنەکی ژی پێشدا هات. ئوسا ب ترس هات گهیشتە دەرێ سڤدەریێ دەرڤا. ئەو بەر دەری سەکنی، ئالیێ مالێ نهێری، کو برێ وێ، باڤێ وێ، خووشکا وێ ل ور ڕازابوون، کەسەرەک هاتێ و دەری ڤەکر. ئیدا ئەو دەرڤا بوو، دو دەقە ژی و ئەو بال مراد بە، ئیدا تو کەس نکارە دەستێ وان ژ هەڤ بکە. گاڤا ئەو دەرکەت بارانێ ئیدا بڕی بوو، هیڤا کو دەرکەتبوو، تەیێ بگۆتا ئەو ژی وانڕا شا دبوو، هەوا خوەش بوو و هێنک. ئەو بەر ب مراد و هەڤالێد وی، کو سەکنیبوون، هیڤیا وێ بوون، چوو. ئەوانا لەز ڕحان هلدان و ناڤا تەریێدا ئوندا بوون. ئەوان تەزە ژ مال دوورکەتبوون گاڤا پیرۆ چوو کۆخ دیت ڕحان تونە دەری ڤەکر و بەر ب مالا سەیدۆ ئاغا ڕەڤی.

هنگێ مراد ڕحان دابوو بەر دلێ خوە و لەز بەر ب ئالیێ مەزەلە دچوون، کیدەرێ گەرە دیا مراد و هەسپ هیڤیا وان بوونا. ئەوانا گهیشتنە جی. دیا مراد خوە ئاڤیتە پێسیرا ڕحانێ، ئەو پاچ کر:

– دەلالیا من، سەحەت و قەوەتا من، ئەوێ گۆت،– ئەز ئیدا نامرم، من ئەڤ ڕۆژ ژی دیت، خودێ وە هەڤرا کال و پیر کە.

مراد و هەڤالێد وی زوو-زوو چ کو لازم بوو ئاڤیتنە سەر هەسپا و گۆتن، وەکی ڕحان هەسپێ سیار بە، لێ ڕحان لاڤا کر وەکی بهێلن ئەو هەرە سەر مەزەلێ دیا خوە، خاترێ خوە ژێ بخوەزە.

ڕحان و دیا مراد چوون، لێ مراد بال هەسپا و هەڤالێد خوە ما.

ڕحان گهیشتە مەزەلێ دێ، ئەو پاچ کر.

– دایێ، شیرنا من، دە ما خاترێ تە.

تو قیزا خوە گونەکار نەکە، ژ من نەخەیدە، ئەز کودا ژی هەرم، تویێ تمێ منرا بی، عەزیزا من! ڕحانێ گۆت، جارەکێ ژی مەزەلێ دێ پاچ کر و تەڤی خوەسیا خوە ژ مەزەل دوور کەتن.

ئەوانا گهیشتنە جی، مراد زوو-زوو ڕحان هەسپێ سیار کر و دخوەست ئەو ژی هەسپێ سیار بە، گاڤا دەنگێ گولەکێ ژ نێزیکایێ هات. ڕحانێ کرە نەعلین و ژ سەر هەسپێ کەتە سەر دەستێ مراد، ئێ کو دەستێد خوە درێژ کربوو، وەکی ڕحانێ پەیا کە. ئەوێ ب ترس مراد نهێری و گۆت:

– مراد، زوو برەڤ، ئەوانا پێ حەسیانە، وێ تە بگرن، هەرە...

مراد ڕحان نهێری، دنێ سەرێ وی بوو دۆژە. ئەوی گاڤا دیت دەستێ وی بن پشتا وێدا ناڤا خوونێدا شل بوونە، دیا خوەڕا، یا کو دگریا، گۆت:

– دایێ، زوو پینەکی بدە من. دێ پینە دایێ، ئەوی لەزی-لەز برینا ڕحانێ پێچا و ئەو حەمێز کر، ئوسا سینگێ خوەڤا گوڤاشت، تە دگۆت ڤەی دخوەزە بێژە، وەکی کەس نکارە دەستێ وی و ڕحانێ ژ هەڤ بکە.

ئەوانا تەعلە-تەعل، فەسال کەتنە بەر مەزالا، بەر کومەیتا و پاشێ دەرکەتنە سەرێ ڕێ. وی ئالیێ ڕێ چیاک هەبوو، هەڤالێد مراد- شمۆ و مستۆ گۆتن، وەکی بال وی چیایی کەلە شکەڤت هەنە، لازمە حەتا سبێ ورا بمینن، لێ شەڤا تێ ڕێ کەڤن. ئوسا ژی کرن.

مراد ڕحان سەر ملا، هلکشیا وی چیایی. پاشێ هەڤالێد وی چوون جیکی خوەش دیتن و ئەوانا برنە ور.

وانا گیها چنی ئانی، ڕحان دانین سەر. ئەو هاژ خوە تونە بوو، گاڤا مراد ژ وێ پرسی: "ڕحان، دەلالیا من، بێژە کیدەرێ تە دێشە، دە منرا خەبەر دە، تو دخوەزی ئەز دین بم ڕحان!.." هنگێ ئەوێ چەعڤێ خوە نەرم ڤەکرن مراد نهێری و جارکە دنێ چەعڤێ خوە گرتن.

زەلخۆیا دیا مراد پێسیرا وێ پێرا-پێرا ڤەکر، جیێ برینێ تژی پیسۆ کر و گرێدا. ئەوێ دلنی ددا بەر دلێ مراد.

– شکر تشتەک تونە، ڕحان منێ چەند ڕۆژا شووندا پاک بە. هەڤالێد مراد ژی دلنی ددانە بەر دلا، وەکی تشتەک تونە، برینا وێ ئەوقاس کوور نینە. پاشێ وانا گاڤا دیت سبە ئیدا زەلال دبە گۆتنە مراد:

– مراد، ئەمێ نها هەرن گوند، بنێرن چ هەیە چ تونە، ئەو کی بوون ئێڤارێ پەی مە کەتبوون، و ئێڤارێ دیسا بێن و هەر تەنێ ڕحان هنەکی پاک بە، ئەمێ شەبەقێ ڕێ کەڤن.

هەردو هەڤالێد مراد چوون. مراد ژ کێلەکا ڕحانێ ڕانەدبوو، دەستێ وێ یی مینا بەرفێ قەرقاش گرتبوو مز ددا. لێ ڕحان هاژ خوە تونە بوو، ئەوێ جار-جارا دکرە ئاخێن و جارکە دنێ کەر دبوو.

سبە ڕند سافی بووبوو، تەعڤێ پاشی بارانێ دابوو و بینا جنەتێ کەتبوو وان بەرا.

زەلخۆ ژ شکەڤتێ دەرکەت بنێرە ئەوانا کیدەرێ نە، گەلۆ گوندەکی نێزیک تونە، وەکی هەرە ڕحانێرا دەرمانەکی، تشتەکی بینە. ئەوێ تو تشت نەدیت.

گاڤا مراد دیت ئەو تەنێ بال ڕحانێ مایە دەستێ وێدا سەر چەعڤێ خوە، ڕاموسا و دەین لێ کر:

– ڕحان، عەمرێ من، شیرنا من، چەعڤێد خوە یە ڕەش ڤەکە، برا دنیا من دیسا ڕۆن بە، ڕحان!..

ڕحان چەعڤێ خوە ڤەکرن مراد نەهێری و ئانجاخ لێڤێ وێ چوون-هاتن.

– مراد، تو ڤرا یی، ئاخ، چڤا پاکە، وەکی تو کێلەکا منی، ئەزێ بمرم، لێ تشتە نابە. مراد دها پاکە، نە کو مالا سەیدۆ ئاغا. دەلالێ من، مراد، ئازادارێ من، تو بەر خوە نەکەڤە، ئەز دها بال تە مە، یا تە، وەکی بمرم ژی زانم، وەکی یا تە مە. ئاخ، لێ چڤاسی دخوەزم بژیم، بال تە بم، تمێ بال تە، دنێدا ژ وێ پاکتر تشتە تونە، گاڤا مەرڤ بال حزکریێ خوە یە، من ئوسا دخوەست، لێ مرازێ من نیڤجیدا هیشتن.

– ڕحان، ئوسا نەبێژە، تو یێ قەنج بی، ئەمێ تمێ بال هەڤ بن، بینا من، ئەزێ بێی تە دین بم. و هێسر سەر سوورەتێ ویدا هاتن.

هنگێ زەلخۆ پنجار دەستدا دەردا هات. ئەوێ ئەشق گۆت:

– مراد، تو ئیدا تو فکرا نەکە، ئەزێ ڕحانا خوە قەنج کم. ڕابە ئاگر منڕا دادە.

ئەوی ئاگر دادا، ب دلەکی مەلوول و شکەستی. زەلخۆ پنجار شەلبکێ خوەدا کەلاند، چێ کر ودا سەر برینا ڕحانێ، یا کو سڤک بوو کوور نیبوو، گولە سەر چەرمڕا دەرباز ببوو.

بەرێ ئێڤارێ هەڤالێد مراد هاتن. گاڤا مراد ئەو دیتن ڕابوو بەر ب وانا چوو.

– دە، لاوکنۆ، بێژن چ هەیە، چ تونە؟

هنگێ هەڤالا گلی کر، وەکی سەیدۆ ئاغا گەلە هێرس بوویە، مەرێد خوە شاندنە سەر حەموو ڕیا، لێ وانا نکاربوونە تو تشتی ژی بحەسن.

– لێ ئەوانا پێشیێ چاوا پێ حەسیانە؟ – مراد پرسی.

– پێرۆ یا جاریا وان جاب دایە وانا.

ئەوە مالا حەسەندا بوویە، گاڤا نهێریە ڕحان تونە چوویە و گۆتیە جاسم.

ئەوی ژی مەرێد خوە گشک ڕاکرنە پیا و پەی مە کەتنە. وەختا پیا بال مەزەلاڕا تێن یەک مە دبینە، لێ ئێد دنێ دبێژن ئەوانا چما گەرەکێ بەر ب مەزەلا بێن و بسەکنن، نها ئەوان ئوسا درەڤن، وەکی برووسک بەر وانا دچە. لێ ئێ دنێ دیسا باوار ناکە، و هنگێ دبێژن: ئەم ئاگر کن، وەکی ئەوانا بن، وێ جابا ئاگرێ مە بدن. جاسم پێشیێ سەکنی بوویە و ئەو ئاگر دکە. دنهێرە ئەم جابێ نادن، ئەوانا دبێن کەسەک ڤرا تونە و ڕێکە مایینڕا دچن.

– لێ نها ئەوانا تەخمین ناکن ئەم کیدەرێنە؟ – مراد پرسی.

– نا، ئەوانا نزانن، لەما ژی ڕند ناگەرن. بنهێرن هەرگێ ڕحان هنەکی پاک بە، سبێ شەبەڤێ ڕابن و ڕێ کەڤن، هەلا ئەوانا نەهاتنە ڤان دەرا، ئیسانە، تە هەو دی هاتن، کی زانە؟ – هەڤالا جابا وی دان.

ئیدا گەلەک ژ شەڤێ دەرباز بووبوو، ڕحانێ چەعڤێ خوە گرتبوون، لێ هشیار بوو، خەبەردانا مراد و هەڤالێد وی دبهیست. گاڤا خەبەردانا خوە کوتا کرن، ئەوێ چەعڤێ خوە ڤەکرن، دەستێ مراد گرت و نەرم گۆت:

– مراد، هەرکێ سەبا من هوون ڤرا سەکنینە و ناچن، هەما ئیشەڤ ژی کارێ خوە بکن ئەم هەرن، ئەز پاکم، ڕاستە ڤێ سبێ ئەز زەعف خراب بووم، لێ نها پاشی وی دەرمانی هنەکی پاکم، ئەزێ بێم، نەترسە. حەتا سبێ ئەزێ پاک بم، ئوسا بکن ئەم زوو ژ ڤر هەرن.

گاڤا مراد ئەڤ گلیانا سەکر، ڕوحێ وی تەزە بوو، قودووم پێدا هات و ب ئەشق گۆت:

– دە وەکی ئوسانە، ئەمێ سبێ ئێڤارێ ڕێ کەڤن، برا هنەکی ژی برینا تە بکەوە.

و ئوسا ژی قرار کرن ڕۆژترا مایین ڕێ کەڤن.

وێ شەڤێ ڕحان دها ڕەحەت ڕازا، نە کو شەڤا پێشن. سبێ ئەوانا کارێ خوە کر، وەکی شەڤ ڕێ کەڤن. هەڤالێد مراد دیسا چوو بوونە گوند، ئەوانا دەرەنگ هاتن:

گاڤا مراد چەعڤ وانا کەت گەلە شا بوو، ئەوی چەعڤێ وان نهێری، دخوەست تێ دەرخە، گەلۆ تو قەزیا نەقەومیە. وانا نێتا مراد فەعم کر و ب کەن گۆتنێ:

– قە دوشورمیش نەبە، حەموو تشت ڕندە، تەنێ دمینە ڕحان زوو پاک بە و هوون زووترێ ڕێکەڤن. سەیدۆ ئاغا و کورێد وی خوە دوکوژن، لێ نزانن کودا هەرن، کی ئالی هەرن، کی ئالی نەچن. گوندی گشک دەرهەقا تەدا خەبەر ددان و شادبن، وەکی ڤێ جارێ گلیێ سەیدۆ ئاغا نەهاتە سەری، برا بزانبە، وەکی گوندی ژی مەری نە... لێ مراد هوون چقاس زوو ژ ڤرا هەرن ئەوقاس پاک.

– هوون ڕاست دبێژن، چقاس زوو ئەوقاس ڕند، سەیدۆ ئاغا ئوسا ناهێلە، ئەو نها شەڤ ژی مە دگەرە، ئەمێ ئیشەڤ ڕێ کەڤن، – مراد و ڕحانێ گۆتن.

و ئوسا ژی کرن. ئەوانا کارێ خوە کر. ڕحانێ نیشانددا، وەکی ئەو زەعف پاکە، لێ ڕاستی برینا وێ هەلا گەلەک دێشیا، ئەوێ بۆنا مراد دەنگێ خوە نەدکر و خوە ئەشق دگرت. گاڤا ژ شەڤێ گەلە بهوری بوو، مراد نێزیکی ڕحانێ بوو، و گۆت:

– ڕحان، ڕاست بێژە، تو ئیرۆ دکاری ڕێ کەڤی یانێ نا، بێژە، هەرگێ نکاری ئەمێ ئیرۆ ژی بمینن.

ڕحانێ مراد نهێری و کەن گۆت:

– ئەز پاکم، زەعف پاک، تو نەترسە، ئەز نامرم، تشتە من نایێ، چمکی تو بال منی. نها تو کەس، تو جارا نکارە مە ژ هەڤ بقەتینە. دخوەزی ئەم هەما نها ژی ڕێ کەڤن.

مراد ب ئەشق ڕابوو چوو بال هەڤالێد خوە، کو دەرڤا بوون.

– دەهـ، هەڤالێد منە عەزیز، ئیدا وەعدە نێزیک دبە، ئەم ڕێ کەڤن. ئەوانا هەسپ ئانین، ڕحان لێ کرن، پاشێ مراد سیار بوو و بەرێ خوە دانە ڕیا تلبیسێ.

هەڤالێد وی ئەو دو-سێ ڕۆژ بوو پێرا دچوون. گاڤا نێزیکی تلبیسێ کرن مراد گۆت:

– لاوکنۆ، هوون ئیدا ڤەگەرن، ژ وە زەعف ڕازی مە، من بیر نەکن.

– مراد، تو زانی مە چقاسی ژ تە حز دکر و ئەم تمێ هەڤڕا بوونە، ئەم تو جارا تە بیر ناکن. ئەو مێرانیا تە کر و ڕێ مەڕا ڤەکر زەعف تشتەکی مەزنە. هەڤالێد مراد نێزیکی وی بوون چوونە دەست-ڕوویێ هەڤ، خاترێ خوە ژ هەڤ خوەستن، هنگێ یەکی ژ مراد

پرسی:

– تو یێ کەنگێ ئالیێ مەدا بێی؟

– هنگێ ئەزێ بێم، وەختێ کو سەیدۆ ئاغا تونە بە، دە، دەما خاترێ وە، – ئەوی گۆت و هەسپێ خوە ئاژۆت.

ڕحان و مراد سەر هەسپێ هەڤ ڕامووسان. دایکا زەلخۆ شابوونا نزانبوو چ بکرا، وان نهێری و ڕوحێ وێ تەزە بوو...

# مزگین

رۆژمکه بهارێیه خوهش بوو، رۆ دو بهژنه بلند ببوو. تهعڤێ دابوو چیا، بانیا، دهشت-زۆزانا، کیژان کو دوور ڤا دخوویان نۆلی خالیچێد رهنگ-رهنگی. ئاڤیا کو ئێڤاردا کهتبوو سهر گول-سۆسنا، ئوسا دبرقی، تهیێ بگۆتا پهنجێ تهعڤێرا کهتیه لهجێ. ژ گوند دهات کاله-کالا کار و بهرخا، دهنگێ هوکه-هوکا شڤان و گاڤانا. هنهکی ژ دووری گوند، ناڤ دهشتێدا دهنگێ تراکتۆرا دهات. ڤێ دهمێ بهدیل و ڤیزا وێ یه زینێ تهزه ژ ڤێرمێ ڤهدگهریانه مالێ، ههردو ژی ڤێرسهدا چێلهکدۆشێ پێش بوون. دێ و ڤیزێ ب کهن و ئهشق خهبهر ددان و هێدی بهر ب مالێ دچوون. نشکێ ڤا وانا تهخمین کر، وهکی کورێ جیناریێ وان- مهجیت، وێ بهر ب وان درهڤی، دکر گازی: -خاتیا بهدیل، زینێ، مزگینیا من وهرا، سهلیم هاتیه!

گاڤا دێ و ڤیزێ ناڤێ سهلیم سهکرن، دنیا وان رۆن بوو. ئهوانا بهر ب مالێ بهزین. زینێ پێشیا دێ گهیشته مالێ، ئهوێ برا حهمێز کر، راموسا.

– برێ منی شیرن، پهرا من، من چڤا بیرا ته کربوو...

وێ دگۆت و برێ خوه رادمووسا. سهلیم ژی ئهو راموسا. گاڤا بهدیل گهیشته مالێ، ئهوێ کور حهمێز کرىدا بهر دلێ خوه، ژ شابوونا هێسر ژ چهعڤا دبارین. پاشێ دێ و کور کێلهکا ههڤ روونشتن. خووشک و برێد سهلیم دۆرا وی تۆپ ببوون، ئهو وانا شا دبوو.

پاشێ ئهوی گۆته دێ: – دایێ، لێ تاهار چاوانه، وێ کهنگێ بێ؟

– برێ من، ئهوی منرا نڤیسی بوو، وهکی وێ زووترهکێ ئینیهاما خلاز که و بێ.

وێ دهوێ چهند جینار دهردا هاتن، وانا چهعڤرۆنایی دا بهدیلێ، چوونه ئهنیا سهلیم. هێ ئهوانا روونشتبوون گاڤا سهر شێمیکێ مهریکی ڤهمهری بهژنبلندی، بهشهرخوهش هاته خانێکرنێ، ژ دێمێ وی دهاته کڤشێ، وهکی ئهوی زهعفی کهسری بوو. ئهو سهدرێ کۆلخۆزێ، ئووسبێ خهتۆ بوو.

– سبا وه خێر، چهعڤێ وه رۆن!

پاشێ ئەو نێزیکی سەلیم بوو، چوو ئەنیا وی، قاسەکی سەلیم نهێری، سمێلێ خوە بادا و گۆت:

– ماشەلا، سەلیم، ماشەلا! تو ناڤا دو سالادا چقاس هاتی گوهاستن، چقاس تژی بوویی، وەلە کاوێ تە ببینە، قەت تە ناس ناکە. سەلیم سۆر بوو، سەرێ خوە کرە بەر خوە. ئووسب نهێری سەلیم شەرمدکە، گلیێ خوە گوهێری و ژێ پرسی: – لێ بسە، تو چاوا ئاوا زوو هاتی؟ سەلیم ئووسب نهێری، پاشێ ژی دێ، یا کو هیڤیا جابا وی بوو.

– هەڤالێ ئووسب، ب قرارا حوکومەتێ ئەپێجە ئەسکەر ژ وەعدێ قولخکرنا خوە زووتر ڤەگەریانە مالێ. ژ وانا یەک ژی ئاها ئەزم– ئەوی گۆت و ب کەن چەعڤێ ئووسب نهێری.

– ئەرێ، ئەرێ ڕاستە، وەڵە بباخشینە ئەو یەکا من بیر کربوو. بەدیلێ، کو ناڤێ کاوێ بهیست ب ئەشق کور نهێری و گۆت:

– ئەز قوربانا تە و دەرگستیا تە بم، تو چرا شەرم دکی؟ کاوێ قیزمکە دەلالە، ئێگنە، ناموس و دستەمەلە، ئەوقاس وەخت گونددا نە یەکی هێ نەگۆتیە ئەڤە فێلا وێ.

هنگێ ئووسب گۆت:

– ئەرێ وەڵە، بەختێ من کورێ مندا بە. کاوێ قیزمکە هێژا یە، ژیرە، نۆلی پریسکێ یە، کاڤا تێ فێرمێ و دەست ب شوخولێ خوە دکە حەوەس – هژمەکاریا مەرڤا پێرا تێ. ئەو چاوا چێلەکدۆشا پێش وێ ڤان ڕۆژا زینێرا هەرە مۆسکڤا یێ.

سەلیم کو ناڤێ زینێ سەکر، پێرا–پێرا ڤەگەریا سەر خووشکا خوە و گۆتێ:

– خووشکا منە دەلال، ئەز زەعف ب دەستانینێد تەڕا شا دبم.

حەتانی ئەوانا وا خەبەر دان، بەدیلێ هاهانگا تەختە ڕاست کر، کاس تژی کرن. ئووسب کاس هلدا، خێلەکێ لێ نهێری و گۆت:

– ئەز ڤێ کاسێ ڤەدوخوم ئەشقی مالا وە، کولفەتێ وە و بەرێ عەولن ئەشقی خووشکا بەدیلێ، یا کو دەهـ زارۆ تەربیەت کریە. دەهـ زارۆ نە تشتەکی مەسقەرە یە، مەری خومیی کە، مەزن کە، فراخە و حوکومەتا سۆڤێتییێ زەعف ڕاست کریە، کو ناڤێ "دیا مێرخاس" دایە تە. ئەوی کاسا خوە ڤەخومر، خاترێ خوە وان خومست و دەرکەت، لێ هەما بەر دەری جارەکە ماین ڤەگەریا و گۆتە سەلیم:

– سەلیم، سبێ وەرە جەم من، وەکی ئەز دیسا تراکتۆرا تە تەسلیمی تە کم. سەلیم شا بوو و ڕازیبوونا خوەدا سەدرێ کۆلخۆزێ.

وێ ڕۆژێ حەتا ئێڤارێ سەلیم دەقەکێ ژ مال دەرنەکەت، چمکی مەری، پزمام، دهاتنە چەعفرۆنایێ، دەستەک دهات یەک دچوو. ئێڤارێ دەرەنگ سەلیم ڕازا. لێ گەلۆ ئەو ڕازا؟ نا، هشیار بوو، ناڤ جیادا دوشورمیش دبوو دەرهەڤا وێ یەکێدا، وەکی وێ سبێ دیسا سەر تراکتۆرا خوە بخەبتە، دەرهەڤا کاوێدا دوشورمیش دبوو. ئەو شا دبوو و بێسەبر هیڤیا سبێ سافی بوونێ بوو. ئاوا حەتا بەربانگا سبێ ئەو هشیار ما. لێ خەوا بەربانگێ لێ زۆر کر، چەعفێ وی یە ڕەش گران بوون و هاتنە گرتنێ. لێ سەحەتەک دەرباز نەبوو کاڤا ئەو جارەکە ماین هشیار بوو. ئەوی دەڤرا نهێری و دلێ وی ژ شابوونێ لێخست. کاڤا تەخمین کر ئێدا سبێ یە، ئەو ڕابوو کنجێ خوە خوە کر، پێژگیر و سابوون هلدا، چوو سەر کانیێ. کاڤا ئەو دەرکەت دەرڤا کەسەک تونە بوو. جی-جینا بووک و قیزێد جاهل ڕاستی وی دهاتن، کو ئاڤ ژ کانیێ دبرن. ئەوی چەعفێ خوە دگەراند، گەلۆ کاوێ ناڤ واندا نینە.

پاشێ ئەو بەر کانیێ روونشت، دەستێ خوە پێ ئاڤا سارە نۆلی بووز شووشتن، پاشێ ئاڤا سار ڤەخار. وێ دەمێ دەنگێ لنگا پش وی هات و بوو خشە-خشا چایرێ. ئەوی پش خوە نهێری و جیدا بوو ڕساس، بەر چەعڤا ڕەشەڤە هات، لنگ لێ سست بوون، دەست لەرزین. قیزەکە کاوە-کوبار، بەژنزراڤە چەعفرەش، بەر ب وی دهات.

گولیێ درێژ کربوو دو کت و نۆلی دو تیرەمەعرێ ڕەش سەر ناملا نازکدا بەردا بوو. ئەوێ هەڤالا خوەڕا ب کەن خەبەر ددا، دکەنیا، درانێ قەرقاش نۆلی سەدەف دهاتنە کفشێ، تەیێ بگۆتا گول نوور لێ دبارن. کاڤا ئەوانا نێزیکی کانیێ بوون، ئەوێ سەلیم تەخمین کر و کرە ئیسکین، جیدا ما. سەلیم کو ئەڤ یەک تەخمین کر بەر ب وێ چوو و دەستێ وێ گرت.

– سبا تە خێر کاوا من، تو ئەڤینا دلێ من! ئەز چقاس شا مە، وەکی دیسا ئەزی بال تە مە، دەلالیا من، چرا خەبەر نادی؟

کاوێ سەلیم نهێری و نکاربوو خەبەردا، ئەو سۆر ببوو چەعفێ ڕەش دبرقین. کاڤا ئەوێ تەخمین کر هەڤالا وێ چوو ئەوێ گۆتە سەلیم:

– تو سەر چەعفێ منڕا هاتی، سەلیمێ من، شکر ئەم دیسا بال هەڤن. ئەز هەر ڕۆ چەعفنهێریا تە بووم. سەلیم ئەو حەمێز کر، ئەنیا کەڤەر ڕاموسا و گۆت:

– کاوێ، ئەم ئێدی جەم هەڤن، ئەمێ ب دل هەڤڕا بخەبتن، هەڤالێ ئووسب منڕا گۆتیە،

وەکی ئەز ئیرۆ هەرم دیسا سەر تراکتۆرا خوە بخەبتم.

– چقا باشە سەلیمێ من، تو گولا بەر بینا من!

لێ تو زانی ئەزێ ڤان رۆژا زینێرا هەرمە مۆسکڤایێ، وردا ژی ئەز و زینێ ئەمێ تهاررا بێن.

پەی ڤان گلیا ئەوێ خاترێ خوە ژ سەلیم خوەست و بەر ب مالێ چوو.

چەندەکی دنێ شووندا کاوێ زینێرا، چاوا پێشڤان چوو مۆسکڤایێ، ل تەماشەگەها مالهەبوونا گوندیتیێ، لێ سەلیم دیسا سەر تراکتۆرا خوە ب حوب دخەبتی...

رێداکتۆر میرۆئێ ئەسەد

شکلکێش ئان. گاسپاریان

رێداکتۆرێ بەدەوی. پ. بێدرۆسیان

کۆرێکتۆرا کۆنترۆل ئێ. بەکۆیێڤا

# نوور

سمۆیێ شەمۆ

---

نەشیرەتا هوکومەتا

ئەرمەنیستانێ

ئێرێڤان ١٩٦١

س (کورد)

ش ١٩

СЬМОЕ ШӘМО



Нәшьрәта һөкөмәта
Әрмәнистанә
Ереван 1961

سمۆیێ شەمۆ شاییرێ کوردایی جاهلە. شێرێد وی گەلێ جارا نەشربوونە گازێتا "ریا تەزە دا" و ئوسا ژی هاتنە خاندنێ رادیۆیێ دا. ئاڤتۆرێ بەرهەڤۆکێ پێشەک ڤا دۆخترە، لێ ئەو ئوسا ژی شێرا دنڤیسە. ئەڤ بەرهەڤۆکا عەفراندنێد وییە پێشنە. سمۆیێ شەمۆ دەنگبێژێ حوب و حزکرنێ یە، ئەو دەرهەقا وەتەنێ سۆسیالیستیێ، عەمرێ بەختەوار، تەبییەتێ دا دسترێ.

ئێرێڤان ١٩٦١

## سینۆر

### جەماعەتا من ڕا

ئەز بشەوتم،
ببم ئاگرێ گەش،
ئەز بشەوتم،
ئاڤا شەڤا ڕەش،
ڕۆنایی بدم
لسەرێ ڕیا تە،
تەنێ بۆنا تە،
تەنێ بۆنا تە،

ببم کانیکە
ئەلەگەزا خومش،
و بخولخولم
ب ئەشق و گولەش،
ئاڤا من زەلال
ب تاسێ ڤەخوی،
کو تی نەمینی
کو تی نەمینی.

ببم کەڤرێ
ل نەردەوانا،
ئێ کو دبنە
مەکتەب، ئەیوانا،

جماعەتا ئازا،

بێی، من پەپەسکی،

تەنێ بلند بی،

تەنێ بلد بی.

١٩٥٨

## زەرا دۆنزدا

"پێکێشی وان دۆنزدەهـ کۆموونیستا دکم، ئێد کو سالا ١٩٢٠ داشناکا زەرا گەلیێ جێرمووکێ دا ئاڤیتن."

چەم ژۆر دا دکشە، دکە فوورە-فوور،

کەفێ داڤێژە سەر کەڤرێ زەرێ،

نۆلا زیباکی ژ وی گەلیێ کوور

فتل و فتل دچە، کو دەرێ.

کانیکە زەلال شەڤ و رۆژ تمێ

ل رەخ وێ زەرێ گولەش دبەزە،

و دۆرانا وێ، وەختێ بهار تێ،

گەش دخەملە، وەک بووکا تەزە.

دۆنزدەهـ مەری بوون، وەک دۆنزدەهـ گولان،

تەمام ژی جاهل و چاخێ هەڤ را،

هەساپ ساز-مراز ل ناڤا دلا،

دۆنزدەهـ ژی تەمام کورێ سەخیرا.

سەکنین هەڤال هەڤ را مێرخاسی،

ئاڤرِ دان دژمن ل حافا زەرێ،

تووی کەلبا کرن و کرن قیرین،

نۆلانی عەورێ ل دەر بهارێ.

ئیرۆ هوون دکن، لێ ئەو رۆژ وێ بێ،

ڕۆژا بەختەوار و ڕۆژا ئازا،
وێ عەمر بینە بۆنا ڤێ دنێ،
مرنێ بینە بۆی وە، بەرازا.

ژۆر دا ئاڤیتن ئەو دۆنزدەهـ جاهل،
ئەو دۆنزدەه عەگیت ب عەمرێ کەزی،
چێم هێسر ئانی، زەرێ کوور ئاخ کر،
کانی گرییا، ئەرد ژی لەرزی،
لێ سورا نازک لسەرێ وان چیا
لووباند و نڤات سەر وان ئەولەدا.

چەندک چەند دۆنزدەهـ و چەند بیستووشەش
بۆی ئەڤێ ڕۆژێ عەمرێ خوە دانین،
کو دنیا ببە بەختەوار، گولەش،
کو ژ کێفر ژی دەرێن گولێد بین.

١٩٥٨

## دو تاهار

لسەر چیا و بەر سەرمێ
درجفین دو تاهار،
ناڤ دەشتێ دا ل بەر گەرمێ
درجفین دو تاهار.

نۆلا هەڤ بوون ئەو هەرد تاهار،
چاوا دو سێڤ نۆلا هەڤ،
هەردو بەرخڤان، لێ ئەو توجار
نەدچوونە دوور ژ هەڤ.

و سال هاتن، سال دەرباز بوون،

ڕۆمێ ئوورس ڤا هەڤ خست،
پێل دا ئاڤا ئەرمز، ڕابوو،
ئەو هەرد تاهار هەڤ دوورخست.

ڤی ئالی ئەرمز چوو خومندنێ
نۆلا گشکا تاهارەک،

وی ئالی ئەرمز چوو شڤانتیێ
تەڤی گشکا تاهارەک،

ڤی ئالی ئەرمز دەرسخانێ دا
دەرسێ ددە تاهارەک،
وی ئالی ئەرمز ئاڤا پێز دا
هێ "ئاخ" دکە تاهارەک.

## حوبا دیا من، وەتەنێ من

هەڤالا ڕا ئەز هین دبووم
و دلیستم ب ساز و کەن،
دلێ من دا شاخ ڤەدابوون:
حوبا دیا من و یا وەتەن.

دەست ب شێر بوو، کەن ئوندا بوو،
دژمن دهات دلی ب دەن،
ئەز چوومە شێر، تەڤی من بوون:
حوبا دیا من و یا وەتەن.

تۆپ دتەقن، جنیاز چیا بوون،
بەر چەڤێ من خوون و مرن،
لێ من ڕا تم دل-قنیات بوون:

حوبا دیا من و یا وەتەن.

خوون دکشییا چاوا سێلاڤ،
دچوو بەرب بەرا بێ بن،

من شەر دکر بێ ترس و ساو،
دلێ من دا، دیا من، وەتەن.

بن تەیرۆکا تۆپ و گولا
کاڤ و سەحەت تم من ڕا بوون،
چا مەرتالا چێ ژ پۆلا:
حوبا دیا من و یا وەتەن.

دژمن ئالت بوو، ئەز هاتمە مال
دها قەوەت، دها سەرخوە،
هاتم ب ئەشق و بەختەوار
بەرب دیا خوە، وەتەنێ خوە.

١٩٦٠

## کەن، گرییێ ئەرەز

ئاخ، وی ئالی ئەرمز، جان، ڤی ئالی ئەرمز،
ئۆرتێ دا دکشە ئەرمز گوڕ، ب لەز،
تەڤی هەڤ دبە ب فکرا خێرێ،
وەکی ئاخینا ئاخێ ژێ دەرێ.

کەن ڤی ئالی ئەرمز، شین وی ئالی ئەرمز،
ئۆرتێ دا دکشە ئەرمز گوڕ، ب لەز،
شەدێ کەن-گری، نیڤی شا دبە،
نیڤی دگری و دەرباز دبە.

ژ وی ئالی ئەرمز، ژ ڤی ئالی ئەرمز،
چەم دکشن بەرب ئەرمز گوڕ، ب لەز،
یەک تێ پێل ددە، چا هێسرێ شینێ،
ئێ دنێ، چاوا هێسرێ شابوونێ.

تەڤی هەڤ دبن ها کەن و گری،
چاوا شەرەکە ڕەش-سوّر نتری،

شەڤێ و ڕۆژێ ئەو دوخولخوله،
پیکی وی گوله، یێ دنێ کوله.

لێ ڕۆژەک وێ بێ، گولا ڤی ئالی
وێ قەنجکە عەسە کولا وی ئالی،
ئەلەگزێ ژی گولا باق بکە
و دلشا بەرب سیپان ڤەرێکە.

١٩٥٨

## جماعەتا من

جماعەتا من، دلێ شا،
کلاما عەمر دبێ،
ئەو چ دکە تەڤ گشکا،
ڕۆژا ئیرۆ، یا سبێ.

تەڤ میلیۆنا دهوونە،
تەڤا عەمرێ، کو وێ بێ،
چاوا ڕاستی دبینە
ڕۆژا ئیرۆ، یا سبێ.

ئەو چێدکە ڕێنگا ڕاست

ئەولەد ڕا شا، نۆلی دێ،
چ کو کالکێ مە دخاست،
ڕۆژا ئیرۆ، یا سبێ.

لسەر قەسرا، کو مەرڤ،
شا ڤال دکن عەدلایێ،
جماعەتا من چێدکە
ڕۆژا ئیرۆ، یا سبێ.

١٩٨٠

## ئەرمەنیستان

دەور هاتنە ل پەی دەورا،
دەور پەی دەورا دەرباز بوونە،
و ژ تەریا ناڤا دەورا
گولێ تە سۆر ڤەنەبوونە.

تو بێکۆمەک، بێ پشت و مل،
تەڤە سار بوو بەختێ تە ڕا،
تە دنڤات، دلێ تە کول،
تو مسکانێ مرن، شەڕا.

هێسر ژی تە ببوون حسرەت،
چا سێلاڤا زها بوویی.
ئەولەدێ تە دچوون بێ حەد،
سەر کیژانی بگریایی؟

سەر کیژانی تە ڤەکرا،
چاوا داییک بسک و گولی،

ڕۆژا ڕەش بوو بەختێ تە ڕا،
دلێ تە جیێ حەزار کولی.

تەک ئۆکتیابرێ تە ڕا ئانی
عەمرێ تەزە، ئەشق و شابوون،
و تە بیر کر هێسر-گری،
و کەسەرێ دلێ تە چوون.

هەر سالەکێ ل تە کریە
خەلاتەکە ئەتلەز و لال،
بەختەواری ڕێ ڤەکریە،
ئەولەدێ تە بوونە خومیال.

شاییرێ کورد ئیرۆ دژی
ب عەمرێ تە، کو تەرا-جان
چاوا میلیۆن، دسترێ ئەو ژی:
ئەرمەنیستان، ئەرمەنیستان.

١٩٦٠

## ڕۆژا ئازادار

ئۆ، سەلام، سەلام، ڕۆژا ئازادار،
تە عەمر دا مە، تە دا مە بهار،
تە دانە هلدان زنجیر و چیدار،
ئۆ، سەلام تە ڕا، ڕۆژا ئازادار.

ئەز یێ چ بیاما، وەکی نەهاتای،
عەسە پەریشان، شڤان سەرێ چیا،
دەرد و کولێ خوە تم پێ بلوورێ

نۆلا کالکێ خوە منێ بسترا.

یانێ چا خولام بەر دەرێ ئاغا،
کو مفتەخور بوو، خوونا مە دمێت،
شەڤێ و ڕۆژێ بن بارێ دەردا،
کۆچەر و بێ مال خوودان برێتا.

تە عەمر دا مە و جماعەتا من
دژی بەختەوار و ب عەمرێ شا،

و حەزار-حەزار جاهل نۆلا من
تە ڕا دشینن موحوبەتا دلا.

ئۆ، سەلام تە ڕا، ڕۆژا ئازادار،
تە عەمر دا مە، تە دا مە بهار،
تە دایە هلدان زنجیر و چیدار،
ئۆ، حەزار سەلام، ڕۆژا ئازادار.

١٩٥٧

## ئەو ڕۆ هەرن، ڤەنەگەرن

١

ئەو بەڕ و ئەو لۆپ،
ئەو کۆنێ دلۆپ،
لێڤێ قەلشی،
دلێ کول تژی،
برێتا،
ب گۆرێ ڕووپێ،
پەعنی تم سۆتی،

چا قالک کۆتی،

کولاڤێ شڤێن،

ئەو هەبانا نێن،

چەند کرتۆل تێ دا،

تم ستوێ وی دا.

شڤدار و بەرشڤک،

سالێ دا بێ شک،

بلوور جەم زمان،

٢

چیا، بانی نەمان،

وان ڕا دل تژە،

کولا ناڤێژە،

ئەڤ بوو یا کۆچەر،

بێ مال و بێ دەر.

وێ دەورا تەعری،

مالا بێ دەری

ئەو ڕۆژا هەرن،

قە ڤەنەگەرن.

٣

کۆچەر کۆچ بەردا

دووری کول-دەردا،

شوخولێ کال-باڤا

ئاڤیتە ئاڤا.

کۆن، دلۆپ بیر کر،

خوە ڕا مال چێ کر.

دەوسا چارخێ قول

پێکر سۆلێد گول.
ئەو بلوور دیسا
ب گوزژین ئوسا
دڤێ: نه کولا،
ڕەوشا سۆرگولا.
کانییا زەلال،
چا شیرێ هەلال،
کۆچەر بێ کەسەر،
خار دبه لسەر،
و ئاڤا وێ سار
ڤەدخوە کوبار.
بن ڤێ تەعڤا گەش،
ئەڤێ ڕۆژا خوەش،
سەرێ خوە هێدی،
بێ داردا ئیدی،
دبه و تینه
ڕۆژا بیر تینه.
دبەژە: "کۆچەر،
بێ مال و بێ دار،
بەرێ چ بوویی؟
لێ نها بوویی
خوەیێ مال و دار،
عەمرێ بەختەوار".

١٩٥٩

## ئەم کۆچەر بوون

ئەم کۆچەر بوون، ئەز ژی بەرخڤان،
ل ناڤ مەرگێد ئەلەگەزێ،
و ڕۆژێد مە دەرباز دبوون،
نۆلا ئاڤێد ئەلەگەزێ.

دەرباز بوونە سال و زەمان،
کۆچەری چوو... بوومە خوەندکار،
لێ کولیلکێد ئەلەگەزێ
ئەز بیر تینم هەڕۆ، هەر جار.

ئیرۆ ئیدی ئەز دۆخترم،
ئەز، ئەولادێ ئەلەگەزێ،
ب ئەشق و شا دخەبتم
گوندێ پالا ئەلەگەزێ.

## گولان

ئەز حز دکم گولانێ،
یا کو تینە گولێد گەش
یا کو ددە تەبیەتێ
خەملا ڕەنگین، عەمرێ خوەش.

گول و سۆسن دبارن
مەها شیرن گولانێ،
جەوێد بلبل دبەزن
ژ بەدەنا گولانێ.

جماعەتا من بەختەوار،

گولەش مینا گولانێ،
پەسن دکە چا هەرجار،
عەیدا یەکێ گولانێ.

١٩٥٦

## چرپیا نەخش

ئەز بچووک بووم، تێ بیرا من،
کالۆ چرپیک دارێ چنی،
رند نقشاند، دا دەستێ من
و دوا کر: "تم پسپۆربی".

وەختا باڤۆ ژی بەر پێز هات،
چرپیا دەستێ من دا وی دیت،
زەعفی هێرسبوو ئەو لسەر من،
و چرپیا نەخش کەوکی ئاڤێت.

جیێ بەرشڤکێ، بەریا کولەڤ،
دەرخست قەلەمەکە زەعف کن،
و کەنەکی تەعلایی دەڤ
ب شیرەتی ها گۆتە من:

ئەز چووک بووم راست نۆلا تە،
چرپیک رابەری من کرن،
وێ رۆژێ دا عەمرێ من چوو،
تمێ شڤان، چا پێشییێد من.

ئەڤا دا من ئوورسەکی،
گۆ:-هان، شڤان، ڤێ قەلەمێ،
و من خوەبکر، وەکی رابی

دەوسا چرپیێ حز بکی ڤێ.

هانێ لاوۆ و ڕێکە دن
خوە ڕا ببین، تو لێ هەرە،
ئەم کال-باڤا تمێ شڤان،
تو شڤانتیێ ڤەنەگەرە.

ئەز بچووک بووم، تێ بیرا من،
ئەو قەلەما من گرتە خوە،
و چرپیا نەخش بەر چەعڤێ من
ئوندا کر چوو، ئەو ڕەوشا خوە.

و ئەز برم ڕێکا دن ڕا
وێ قەلەمێ، ب گول و شا،
ژ حەزارا کانیێد ئولمێ
من ئاڤ ڤەخار، ڕازلخی دا.

سال زەعف چوونە، تێ بیرا من،
کالۆ چرپیک دارێ چنی،
ڕند نقشاند، دا دەستێ من،
و دوا کر، "تم پسپۆر بی"

١٩٥٨

## بیرانین

ئەز و شەمال مە تم دلیست
ل بن دارا حەوشا مە دا،
ئەم مەزن بوون، دار ژی گهیشت،
سەربەست، ئازا وێ بەلگ ڤەدا.

هەوارا شێر گهیشتە مە،
ئەم چوون، مە هشت دار ل گوند دا،
مە کرە شەر و حسرەتا
دار و گوند بوو دلێ مە دا.

لێ سبەکێ گولا نەیار
هنگاڤت عەمرێ هەڤالێ من،
بن دارەکە دوورا کوبار
وی تەگدیر دا سەر دەستێ من.

ئەز کەوکریم، دار گرییا،
ڤەکر، داخست وێ گولیێ خوە،

و لووری کر، چاوا داییک،
سەر مەزەلێ ئەولەدێ خوە.

من کرە چەعل، ئەز دەرباز بووم،
هەیفا هۆکر دلێ من دا،
ئالتبوو دژمن، ئەز ڤەگەریام،
دار و مەزەل دلێ من دا.

١٩٥٤

## دو سێوی

١

دو سێویێ تەعزی،
پێخاس، بێ لەزی،
بەرف چیا و عەردا،
بن بارێ دەردا،

ڕەخ هەڤ کەتبوون،
دچوون و دچوون.
ڕێنگا وان درێژ،
بایێ کەری گێژ
دسترا تمێ
بۆیی ئەوێ دهمێ،
کو ئەوە تی نە،
تەزی، برچی نە،
کو ئەو سێوی نە،
بێ مال و جی نە،
کو ژ گوندەکی
ناڤا لەعزەکی،
تەنێ ئەو هیشتن،
ئێ دن گ کوشتن،
وەکی ل دنێ
ئەوانا تمێ
دەریا بکوتن،
ب دلڤەرۆتن،
بۆی وێ عەجێبێ،
تم بێژنە دنێ.

٢

ڕۆکێ جیکی ژی
جماعەت بوو تژی،
هەڤ ئوندا کرن،
بەخت ئەو هەرد برن.
هەر یەک ل ڕێکێ،

بنێ دنێکێ.
هەرد ژی بوون ئاشق،
ب چەعف و ئیشق،
گرتن دەستا ساز،
کرن گازە-گاز،
ب کلاما نوور
کولێد کوورە-کوور
وان گلی کرن،
هێسر ڕێ کرن،
کو ئەو ڕۆژ هەرن،
قە ڤەنەگەرن،
تونەبە کوشتن،
سێویتی، مرن.
دەرباز بوون زەعف سال
ئەو هەرد بوونە کال.

٣

لێ وەختا نها
سبا، ئێڤارا،
ئەوان برێد گور،
خوونخورێد شەرکر،
دخازن دیسا
عەجێبێد ئوسا
بینن ڕوو دنێ،
بکوژن باڤێ،
سێویکن زارێ،
بدنە سەرێ پێ.

میلیۆن دخازن،
ب دەنگ و گازن،
دەوسا شەرێ ڕەش،
عەدلایا دل خوەش.

ئەو هەرد سێوی ژی
ب دلێ تژی،
ساز وا هلدانە،
لسەرێ ڕیانە،
ب عەمرێ کالتی
دلێ جاهلتی،
بۆی وان عەجێبا
دبێژنە گشکا.
هەر براک جیکی،
هەرد ژی گلیکی
بۆی هەموو دنێ،
دخازن تمێ:
"عەدلایی گولبە،
تم ڕوو دنێبە".

١٩٥٨

## ئەرەز

ئەرمزە، کلام و سازە،
دەشت و گەلیا ڕا دبەزە،
بۆی هەر دەرا ب ئاڤا خوە
گول و سۆسنا دخازە.

ئەرمزە، ل چیا لەزە،

کەفێ داڤێژە، دبەزە،
عەمر ددە ئەردێ مرێ،
خومێ گولا ئال-گەڤەزە.

ئەرمزە، وەک ڤیزا نازە،
هوسن و جەمال لێ دبەزە،
بۆنا هەموو دنیالکێ
ئەو ژی عەدلایێ دخازە.

١٩٥٨

## "ڤیز و خوەندن"

"ڤیز و خوەندن"؟ ئاها دگۆت
پیرکا من کارێ
پێ ڕا ڕووێ خوە تم ڤەدروت،
وێ هەموو جارێ.

"کولفەت دارا شکەستییە"،
گەرە نەچە دوور.
مێرێ خوە ڕا بندەستییە،
دایکا زارێد هوور".

وێ ها دگۆت هەرۆ-هەر جار،
وەختا خووشکا من،
هێسر چەعڤا ب زارە-زار،
دگۆتێ جەم من:

"ئەز ژی مینا برانگێ خوە
دخازم هینبم،
ئەز ناخازم مینا دایێ

بندمست بمینم".

"ئەو تە ناکە، ئیدی ئوسا
مەڤێژ تو لال–دور،
مە ناف گوند دا مەکە ڕوسا
تو مەبە پڕرکور".

هەرە، لاڤ، تەشیێ بادە،
یان کولیکە تو،
کێ دڤێژە، وەکی دادە
ب دەست بەختێ خوە".

تەعفێ دا سەر وەلاتێ من،
گهیشتە وێ ژی،
و خووشکا من چوو خوەندنێ،
هلنەدا تەشی.

هەیف، پیرکا من تونە،
ئەگەر بدیتا،
"کولفەت کەوا فراقەتە"
وێ ها بگۆتا.

١٩٥٨

## مەڤە سەحەت

سەحەتا بچووک نۆلا دلێ من،
نۆلا تامارا خوونێ لێدخە،
چا ڕۆژا چوویی، چاوا دەقێد دل،
دەقێد نها ژی دڤە، دوور دخە.

ئۆهـ، بەسە سەحەت، ئەو دەقێد بها
مەڤا قاسەكێ، برا بسەنن،
جماعەتێ ڕا من هەتانی نها
تشتە نەكرییە، برا پووچ نەچن.

كەنگێ ڕۆكێ من بۆنا جماعەتێ
كەڤرەك ئانی ژ تامێ وێ ڕا،
سەحەت، وی چاخی، هلدە قەوەتێ،
وان دەرا بڤە، عەمرێ من پێ ڕا.

١٩٥٩

## سینۆر

دو گوند هەنە دەڤ ئەرەز دا،
یەك مەسكەنێ كول و دەردا،
ئێ دن چاوا مێرگا چییا،
گولێد حەزار ڕەنگی تێ دا.

تمێ دكشە ئەرەز ب لەز،
وی ئالی دەرد، ڤی ئالی ڕەز،
ژ هەڤ دكە وان هەرد گوندا،
چاوا شەرا ڕەش و گەڤەز.

دكە خوشین و پێل ددە،
حەزار فكر ئاڤێد وی دا،
دەرباز دبە ئەرەز ب لەز،
چا سینۆرێ دو دەولەتا.

١٩٥٩

# حوب و حزکرن

## حزکن کلامێ

کلام شابوونە، کلام عەمرە،
کێ وێ حز بکە، توجار نامرە،
تمێ مەرتالە بۆنا دلێ چێ،
ئۆ، هەڤالێ من، حزکە کلامێ.

کلام مەرڤا دکە ئالتندار،
و ئەو گەرم دکە دلێ سکی–سار،
ئەوە شیرنە نۆلا حوبا دێ،
ئۆ، برێ عەزیز، حزکە کلامێ.

ناڤا قرا دا ب کلاما دل،
ئاڤا سار دەرتێ، دکە خولە–خول،
حوبا خەیدی دیسا شوون دا تێ،
هوون تەمام، تەمام، حزکن کلامێ.

١٩٥٩

***

دەرێ مالا من، نۆلا مالا من،
تم ڤەکرییە بەر هەڤالێد من،
برا کەرەمکن ب کەن و گری،
ب سدقێ ساخلەم، نۆلا ڤی دلی.

ژ شێمیکا من، کو دبوهورین

جەم خوە دمخەسيێ برا نەگرن،
برا بهێلن ژ شێميکێ دمر
و بێنە بال من بێ کين و خەدمر.

١٩٥٩

## یەک ئەز، یەک کانی، یەک ژی دلێ من

ناڤا مێرگا دا ب ئەشق دگەرم،
ئەز و کانی نە تەنێ، کەس تونە،
تەبيیەت بەدموە، پێرا شا دبن:
یەک ئەز، یەک کانی، یەک ژی دلێ من.

ل ڕەخ کانیێ گولەک ڤەبوویە،
ئەو گول و کانی هەڤ ڕا دلیزن،
بينا گولێ ڕا بێ حەد شا دبن:
یەک ئەز، یەک کانی، یەک ژی دلێ من.

چڤیکەک فری دانی سەر زنێر،
کرە ویتە–ویت، گۆتە یەکە دن
درهەڤا حوبێ، تەنێ ئەو فەم کر:
یەک من، یەک کانی، یەک ژی دلێ من.

ئەزی مالدا مە، تەمام ڕازانە،
شەڤە درێژە، بەحرمکە بێ بن.
نیڤێ شەڤێیە، هەڤرا دسترێن:
یەک ئەز، یەک کانی، یەک ژی دلێ من.

١٩٦٠

## دلێ من چیایە

دلێ من چیایە،
مەسکەنێ گولی،
هوندور دا دەوات،
تو لێ خەملی.

دلێ من مێرگە،
مێرگەکە فرە،
و چەمێ حوبێ
ڤر فوورە—فوورە.

وەرە، عەزیزێ،
وەرە ها نابە،
وەرە بێی بووکێ
تو دەوات نابە.

هوورک بمەشە،
تو ناڤ مێرگێڕا،
نێزیکی چێم بە،
فینجان ژی تە ڕا.

و ژ وی چەمی
فینجانێ داگر،
بەلکی هێسابە
ئەڤ دلێ ئاگر.

دلێ من چیایە،
مەسکەنێ گولی،

هوندور دا دەوات،

تو بووک-خەملی.

١٩٦٠

## یار

یار ئەسمەرێ، یار قەمەرێ،

یار زراڤێ، پشت کەمبەرێ،

کلێ سبحان چەعف-بوروویا،

چیا چیاتیا خوە من ڕا گریا.

یار، تو گولی، یار بلبلی،

یار، تو تەعفی، لێ سەر دلی،

گولێد زێرین هوور هوونایە،

ئاگر بەری دلێ من دایە.

یار، تو گولی، کوورا گوری،

یار، وێ چبە، کو بفری،

چا گوگەرچین، دەقەکە کن

حەواس بێیی کێلەکا من.

١٩٥٩

***

گەلۆ کانێ، گەلۆ کانێ،

کودا چوو؟

ئیشقا چەعفا، ئیشقا چەعفا،

ئوندا بوو.

ئەز بلبل بووم، ئەز بلبل بووم،

بوومە لال،

پۆر سپیکر، پۆر سپیکر،

بوومه کال.

١٩٦٠

## زەریێ

ئیرۆ وەرە سەر کانیێ،
هیڤیا تەمە سەر کانیێ،
کۆفیا زێرا تو چێبکە،
عەسە وەرە سەر کانیێ.

وەرە، خەما خوە بیر بکم
ب حوبا تە ب چەعڤێ ڕەش،
وەرە، بێ تە سەبر ناکم،
قیزا بەدەوە بەنگزی خوەش.

وەرە سەر کانیێ ئەسە،
ئەو مینا من هیڤیا تەیە،
ئەو دخوەزە پێ بحەسە،
حوبا مە چا گولڤەدایە.

ئیرۆ وەرە سەر کانیێ،
هیڤیا تەمە جەم کانیێ،
بەژنا کوبار بخەملین،
زەریێ وەرە سەر کانیێ.

١٩٥٧

## چەعڤێد ڕەش

کودا هەرم، هوون جەم منن، چەعڤێد ڕەش،
هوون کەسەرا دلێ منن، چەعڤێد ڕەش،

و دلێ من ب حوبا وە داناڤی،
هێ دسترێ، دنڤێژە، چەعڤێد ڕەش.

وە شەمال دا لسەر ڕیا من بەدەوی،
چەعڤێ من وە، بەرب وە هاتم ئەز دلخوەش،
هوون ئوندا بوون، دیسا ڕیا من ما تەعری.
گەلۆ کێ بوو، کێ بوو سەبەب، چەعڤێد ڕەش؟

چڤا ژی سال دەرباز بن ژ عەمرێ من،
چڤا زەری بخەملن ڕەنگ و ڕەوش،
وە بیر ناکم، هوونن ل بەر چەعڤێ من،
هوون داغا کوور سەر دلێ من، چەعڤێد ڕەش.

١٩٥٧

## بهار تێ

دارا بەلگ دا حەزار دلی،
ئاڤا ئەرقێ شا خول-خولی،
ئازا بوو ژ قەیدا بووزێ،
ب شا سترا دەنگێ قیزێ:
بهارا دێ،
بهارا دێ،

چیا کراسێ سپی ئێخست،
ڕەخت و هێکەل سینگێ خوە خست،
گولێ سۆرکر ناڤ مێرگێ دا،
ها کۆت کانیا دەڤ زنێر دا:
ک تەڤێ دا،
ک تەڤێ دا.

مۆزا هنگڤ فری ژ مال
و چوو بەر ب کولیلکا ئال،
گۆهێ وێ دا هێدی گۆتێ
- تو ژی مە ڕا شابە خووشکێ،
بهارە تێ،
بهارە تێ،

١٩٥٨

## خەزال

خازلا ئەز ببیاما خەزال
ل ناڤ مێشێ شین و کوور دا،
و بهاتا ناڤ لاوکێ دەلال
ل نێچیرێ وی مێشە دا.

و گولا وی برا دمنگ دا،
کوور تێکەتا ناڤ دلێ من،
تەنێ-تەنێ وی پەی وە ڕا
مێزە کرا ل چەعڤێ من.

١٩٥٧

***

چەعڤێ تە دا تم حوب هەیە،
حوب و حکیات، گول، سۆسن،
چەعڤێ تە دا عەمر هەیە،
عەمرێ شیرن بۆنا من.

و دلێ من دبە دۆژە،

کو چەعفێ خوە دکری،
ئەو کەسەرا دلێ تژی،
چیا ژی من ڕا دکری.

چەعفێ تە دا ب ئالاڤی
ئیشق ددن حەزار تەڤ،
چەعفێ تە دا بەختەواری،
لێ ئەم هەلا دووری هەڤ.

١٩٥٩

## سۆسنڕا

عەمر تژی،
ناڤ دا بژی.
تەعڤە گەشە
بۆنا تە.
تو خوە گولی
گولێد سۆر ژی،
ڤەبوونە دۆر
بەرێ تە.

١٩٥٩

## گول و مەعر

ل ناڤ ڕەز دا سەر دارێ گەش
گول ڤەبوویبوو، بین ددا خوەش،
ب ملێ بێ، سڤک و هوور،
بەلا دبوو بینا وێ دوور.

وی ڕەزی دا، جەم گولا گەش،

ددەبری مەعرەکی ڕەش،
قە نکاربوو وی ببرا،
وەکی گولا گەشە ورا.

لێ جارەکێ ژی تەعفێ ڕا،
مەعر دەربازبوو ڕەخ گولێ ڕا،
بن لێڤا ڕا تەعل-تەعل کەنی
و گولێ ڕا ها پێ ئانی:

– زەعف کاو نەبە، تو گولا گەش،
مرن هەیە هەمووشکا ڕا،
ئیرۆ شایی، بەنگزێ تە خوەش،
سبە توێ هەری ورا.

– ڕاستە – گولێ گۆت ژ مەعر ڕا، –
ڤرا ئەز ژی سەر سۆزێ تە،
لێ خازلا من وی بەندی ڕا،
ئێ کو گول تێ، گول ژی دچە

١٩٥٦

***

ئەز گولیمە، زەر گولیمە،
ئەز خەزالا چیا کووڤیمە،
قەید و چیدار من نەدیبوو،
نها حوبێ قەید کریمە.

لاوکۆ، جانۆ، من تەعل مەکە،
گولا خوە سەر من ڕاست مەکە،
گولا چەڤێ تەیە بەلەک

ئەز هنگافتم، دوجار مەکە.

١٩٥٩

## زەڤی و زەری

زەڤی شینە،
زەڤی بینە،
و دکەنە،
تەعڤێ ڕا،
ئەوە بەرە،
نۆلا بەرە،
و دلیزە
ئەو بێرا.
قیزمکە ناز،
ب شەرا خاس،
دمەشیا
وان دمرا،
خوە- خوە چا گول،
دەستا دا-گول،
گول شا دبوو
گولێ ڕا.

ئەزی دوور بووم،
بەرب وێ چووم،
وەکی گولەک
بخاستا،
وەکی ئەو گول،
ب ئەشق و دل،

هلدا سینگێ
خوە خستا.
دموسا گولێ.
مینا کولێ
ئاڤرووکە تەعل
دا من، چوو،
چەعڤێد ڕەش ژی
گولا گەش ژی،
لاوکێ خوە ڕا
وێ بر چوو.

لاوکێ دەلال،
حوبا وێ بال،
دخەبتی
دلی خوەش،
خوە شوخولکار،
پێش دا هەرجار،
وی حەلال بە
چەعڤێد ڕەش.

١٩٥٨

## ئوسا مەنهێر

ئوسا مەنهێر، ئوسا منهێر
تو ل من،
بێ دوو، بێ دوو دشەوتە
دلێ من،
ژ ئاڤرێ تە، ژ ئاڤرێ تە

قیزا باش،

دلکه منه، دلکه منه

تم نه‌خوەش.

ئوسا مه‌نهێر، ئوسا مه‌نهێر

تو ل من،

به‌سه، ئیدی ئیشق نه‌ما

چه‌عڤێ من،

سیڤا سۆری، سیڤا سۆری

ل ناڤ ڕەز،

تمێ ژ ته، تمێ ژ ته

ڕۆژی ئه‌ز.

وان ئاڤرێ ته‌عل، وان ئاڤرێ ته‌عل

بیر بکه،

باقێ گولێ، باقێ گولێ

چێ بکه

و حه‌لالکه و حه‌لالکه

تو ل من،

وەکی قه‌نجبه، وەکی قه‌نجبه

دلکێ من

١٩٥٦

ڕێداکتۆر میکائیلێ ڕەشید

ڕێداکتۆرا نه‌شیرتیێ و کۆرێکتۆرا کۆنترۆل ئێ. بەکۆیێڤا

شکلچی ئان. گاسپاریان

تەخ. ڕێداکتۆر ڤ. گالستیان

*Ордихане Щәлил*

# Т'ели Һ'әмзә



НӘШИРӘТА ҺӦКӦМӘТА ӘРМӘНИСТАНЕ
ЕРЕВАН 1963

س (كورد)

١٩

پۆيێما "تێلی حەمزە" ئاڤتۆر دەرهەقا شەركاريا جماعەتا كوردا مقابلی زەفتچییێد ڕۆمێ گلی دكە، تێما بۆنا پۆيێما خوە ئاڤۆتر ژ فۆلكلۆرا جماعەتێ هلدايە.

بەرهەڤۆكێدا هەيە ئوسا ژی شێرێد وەتەنهەزیێ و حكیاتەكە جماعەتا كوردا.

"تێلی حەمزە" بەرهەڤۆكا نڤیسەرێد ئۆردیخانێ جەلیلە دودایە.

ئایرێترات، ئێرێڤان ١٩٦٣ ز.

## ئەزى كوبارم پر

ئیرۆ دیسا وەک وێ رۆژێ،
کو بەلا بوو بەعسا خێرێ،
کو گەمیا مە ڤر فری ژۆر،
ئەز دبینم قەواتا زۆر.

ترێ ئەوێ ژی عەزمانێ سووت،
پەنجێ خوە دامن و قاپووت،
ترێ عەردێ بێسەر–بنی،
کوباریا خوە ژێ هلدچنی.

دێ ببهێن حەموو–حەموو،
حەموو مەرڤێ هێنا مە نوو،
بوویە راستی چ کو خەون بوو،
چ کو بەرێ نەبییانی بوو.

ل بەرب عەزمین، بەرب ستەیرکا،
ب کوباریا بایێ خوەڤا،
فری گەمیا دۆرگەرا مە،
و هیڤ کرە پێگا پیا خوە.

ئەزی ئیرۆ کوبارم پر،
کو دنێدا جارا عەولی،
باژارڤانێ وەلاتێ من،
دۆرا دنێ دایە فتل.

## ئیرۆ شەبەقێ ئەز زوو رابوومە

ئیرۆ شەبەقێ ئەز زوو ڕابوومە
ئەز زوو ڕابوومە ژ خەوا شەڤێ،
ئیرۆ شەبەقێ ئەز ئەشقلوو بوومە،
ژ شەوقا پەنجێ ڕۆنایا تەعڤێ.

چقاس بەیراقێ سۆرن دۆرا مە،
ژ بایێ پاییزێ دململن نەرم،
ئەوانا بوونە شەعدێ شەرێ مە،
بۆنا ڤێ ڕۆژا مەیە شا و گەرم.

بەیراقێد مە سۆر، هێ سالا حڤدا،
حنجراندنە تەخت–تاجێ پادشێ،
وانا ڕێ ڤەکر بۆنا مە گشکا،
کو پێشدا هەرن ئەم پیا شەرکارێ.

مە عەمرێ تەزە ئیرۆ چێکریە،
تمێ بەیراقێد سۆرە دەست مەدا،
مە عەرشێ عەزمێن دۆرگەرا شاندیە،
ب وان بەیراقا مە ئەو نەخش کریە.

و ل سۆقاقا خۆرت ڤیزێد جاهل،
بەیراقێد خوە سۆر بلند گرتنە،
ئەوانا دچن مل دایی ل مل،
وەکی جێرگێد وان مینا پۆلا بە.

ئیرۆ شەبەقێ ئەز زوو ڕابوومە،
ئەز زوو ڕابوومە ژ خەوا شەڤێ،

ئیرۆ شەبەقێ ئەز ئەشقلوو بوومە،
ژ شەوقا پەنجێ ڕۆنایا تەعڤێ.

## ئۆکتیابرا مە

من هلدایە قەلەم، کاغەز،
و مەتحێ تە ددم تم ئەز،
مەتحێ بەژن و بالا دەلال،
تو ئۆکتیابترا مە ئازادار.
مەرا بوویی ڕیا خوەشبەختیێ،
ڕیا براتیێ و پسمامتیێ،
ڕیا یەکەتیێ، بەختەواریێ،
پێشداچوونا مەخلووقەتیێ،
چاخا گەمیا "ئاڤرۆرا"-یێ،
سالا حەزار نەهسد حڤدا،
زەریا ئەولن ل دنێ خست،
بەرف و بووزا ئەلەگەزێ،
ژ جی هەژیان هاتنە خار.
و ستەیرکێ ڕووێ عەزمین،
ژ شابوونێ دتەیسین،
لێ دژمنێ خایین، مەرز،
مە دنهێرین ب دزە- دز،
چکا ئەمێ چاوا بژین،
چاوا ئەمێ پێشدا هەرن،
چاوا ئەمێ تەمیێ لێنین
ل عەمردا میاسەرکن.
مینا ڕووڤیا خوە تەلاندی،
دژمن تشتێ شایێ نەدی،

ئەوی هلدا ب خاینتی،
سەر مەدا گرت ب نەیاری،
لێ مە دیسا ب مێرانی،
کولما مێرا بەر وی دانی.
من هلدایە قەلەم، کاغەز،
و مەتحێ تە ددم تم ئەز،
مەتحێ بەژن و بالا دەلال،
تو ئۆکتیابرا مە ئازادار.
مە ڕاکریە خوەلیا خۆپان،
ب خوودانا میلیۆن مەریا،
وەکی شێنبە وەلاتێ مە،
و گولڤەدە هەرە پێشدا،
وەلگەراندیە چیایێ بلند
و دەوسا وان بەر چێکریە،
قووم-قوومبستان مە ئاڤ دایە،
ئەو ژی بوویە گول-گولبستان.
چەمێ هار ژی مە زینکریە،
مە گەمکریە گەمێ هەسنی،
و ڕۆنکایا گوند و باژێر
ئەم دستینن ژ چەمێد خێر.
بازارێد مە مینا بەرێ،
تەک-توک نینن و قنجلی،
ئەوە پرن ل هەر ئالی،
و شا دکن میلیۆن دلی.
لێ بەیراقا ئۆکتیابەرا مە،
تەنێ ل ڕوویێ عەردێ نینە

وەکی مینا چرا ڕۆنک،
دچرووسە و شەوق ددە.
لاوێد وەلێت عەگیتێ مە،
مینا تەیرێ حەزار پەری،
بێ ترس و خۆف، ب مێرانی،
خوە ل سینگێ عەزمین دانە.
ئەوێد فێرز، مێرخاسێد مە،
ب کۆم دچن بۆنا گەرێ،
ئەو ب حەنەک، ب لاقردی
دچن عەزمین ل سەیرانگێ.
تەڤ خوە دبن عەرشێ عەزمین،
ستەیرکا سۆر ئەو خەملا مە،
تەڤ خوە دبن بەرب هیڤێ
نێت ، مەرهەمێ ئۆکتیابرا مە.
نها هێنا بەرێ نینە،
ئۆکتیابرا مە زارۆ نینە،
ئەو ب عەمر پر مەزنە،
و ناترسە ژ تو بەندان.
ئەو سەکنییە سەر ڕیا دژمن،
دەوسا ئاگر تەختە دانیە،
و دخوەزە تەڤ خوەشبەختبن،
کو عەدلایی دنێ هەبە.
من هلدایە قەلەم، کاغەز،
و مەتحێ تە ددم تم ئەز،
مەتحێ بەژن و بالا دەلال،
تو ئۆکتیابرا مە ئازادار،

مەرا بوویی ڕیا خوەشبەختیێ،

ڕیا براتیێ و پسمامتیێ،

ڕیا یەکەتیێ، بەختەوەریێ،

پێشداچوونا مەخوولقاتیێ.

## تێلی حەمزە

(ب مۆتیڤا کلاما جماعەتا کوردایێ مێرخاسیێ)

عەورێ ڕەش-گران، مینا کارڤانا،

هێدیکا دکشیان، دکشیان سەرێ چیا،

ئەو تەڤ هەڤ بووبوون مینانی پەزێ

کو گور ل پەیبە، بێ خوەیی خودان.

جارنا ژی دوورڤا، ژ عەرشێ عەزمین،

دەنگێ گورییا عەورا دهات ور،

و ناڤا ئەو دەنگێ عەورا

ساوا خوە گران داڤێت سەر مەریا.

وێ شەڤا تەعری، تەعری-تەعریستان،

سیارەکی تەنێ دلەزاندە چیێ،

هەسپا وی کحێل دپەکییا ژ جی،

دفری پێشدا مینانی گولێ

ئەو ڕێ، ئەو دربا، ئەو کەڤر و کوچک،

ناسی سیار بوون هێ زووڤا-زووڤا،

چاخێ تەڤ زارا حەموو بهارا،

ل ناڤ ڤان گەلیا دلیستن هەڤرا،

دلیستن هەڤرا، هەڤرا دستران،

جارنا ڕادبوون هەڤدو دکوشتن.

و وێ ئێڤارێ، بن بانێ عەزمین،

بارانەک باری، تەیرۆک ژی پێرا،
چەمێد مچقی تەڤ ڕابوون بەزین،
مۆلک و خانی دانە بن پێلا،
ل ناڤا گێلی وێ شەڤا تاری
بووبوو هێوورزە و ڕابوو لێیی.
سیارێ تک-تەنێ دلەزاند وێ دەمێ،
تو کەس نزانبوو چ بوو نێت، مەرەم.
سبێ شەبەقێ، بەربانگا سبێ،
تەزە ڤەدبوون پەنجێد ڕۆیێ،
تەزە چڤیکا دکر ویتە-ویت،
گەلیا مژ-دوومان ژی سەر خوە داڤیت،
و بایێ سبێ ژ دوورڤا-دوورڤا،
گەلەکی زەلال ناڤ گەلیێ کووڕا،
ژ چیایێد بلند، ژ چیایێد هێشین،
دانی دەنگێ کلاما دلێشین:

هێدی بازۆ، هێدی بازۆ،
هێدی بازۆ، بۆی خوەدێیە،
هێدی بازۆ، هێدی بازۆ،
هێدی بازۆ، بریندارم.

وایێ، وایێ، وایێ، وایێ، وایێ، وایێ،
دلێ من خەما د خەمادا،
برەک سیار و پەیایێ مە،
خوە دانە بەر پەرێ عەزمانا

خوبارا ڤێ مژێدا،
گوڵەک بەری بەدانا خەلیلێ برا دانە،

گوڵه مایه د چۆکێدا.

هێدی بازۆ، هێدی بازۆ،

هێدی بازۆ، بریندارم،

هێدی بازۆ، هێدی بازۆ،

هێدی بازۆ، بۆی خومدێیه.

وایێ، وایێ، وایێ، وایێ، وایێ، وایێ،

خەلیلێ برا ژ مال دمرکەت چوو ئیلانووکێ،

گوڵه باروتێ ڤی کافرێ ڕۆمێ

سەر خەلیلێ برادا

دبارن مینا تەعقیا ڤێ تەیرۆکێ،

گوڵەکێ بەری بەدمنا خەلیلێ برا دانه،

گوڵه مایه هەستوێ ل ڤی چۆکێ.

هێدی بازۆ، هێدی بازۆ،

هێدی بازۆ، بریندارم،

هێدی بازۆ، هێدی بازۆ،

هێدی بازۆ، بۆی خومدێیه.

وایێ، وایێ، وایێ، وایێ، وایێ، وایێ،

خەلیلێ برا ژ مال سیار بوو، سورا سار تێ،

گوڵه باروتێ ڤی کافری

سەر خەلیلێ برادا چارنکال تێ،

گوڵەکێ بەری بەدانا خەلیلێ برا

سیاری چەعفرمش دانه.

جنیازێ وی خۆرتێ توونسز ل سەر بارێ

بارخانا هێدی–هێدی بەر ب مال تێ.

هێدی باژۆ، هێدی باژۆ،
هێدی باژۆ، بریندارم،
هێدی باژۆ، هێدی باژۆ،
هێدی باژۆ، بۆی خوەدێیە.

ئەو تێلی حەمزە، باڤێ تێلی تەمۆ،
سەکنیبوو تیک-تیک ل حافا گێلی،
ئەوی گوهددا ل وێ کلامێ،
کو دۆربەر حەموو کربوو بەندێ.
دنهێری حەمزە ل بەرب گەلی،
و دیت نشکەڤا کحێل ی.
ئەوی سێ دەنگا تەمۆ کرە گازی:

تەمۆ لاۆ، تەمۆ، خوە ئەگلە نەکە،
دێ ڕابە، ڕابە بلەزینە،
خوە ئالیێ مالێرا بگهینە،
دووربینێ ژ بن ستێر دەرینە
و باڤێ خوەرا تو وێ زوو بینە.
ئیشەڤ من گەلە خەونێ گران دینە،
خەونێد تەڤگەر ئیایی تەرکا من نەدان،
ئێڤاردا دەنگێ زارا، چووک و مەزنا،
دەنگێ دۆتا و کولفەتا
کەتبوو ئێلا مە ژێرینە.
دە بکە لاۆ بلەزینە،

خوە یالێ مالێرا بگهینە،
دووربینێ باڤێ خوەرا بینە،
سیارەکی وێ خوە دایە سینگێ چیێیە.

ببە سیار سیارێ خێرتیە،
ببە سیار سیارێ شەرایە،
دە زوو بکە لاو، تو بلەزینە،
خوە یالێ مالێرا بگهینە،
دووربینێ باڤێ خوەرا بینە.

تێلی تەمۆ بهیست دەنگێ باڤێ،
خەبەرێ گران کزراند دل و جەگەرێ،
ژ خێنی بانزدا، بەزی بەرب ئۆدێ،
دەستێ خوە کرە بن کوژێ ستێر،
دووربینا درێژ گهاند باڤێ.

تێلی حەمزە دووربینێ هلددە،
دووربینێ بەر چەعڤێد خوە دگەرینە،
سیارەکی ئاگر دوورڤا دبینە.
دڤێ، لاو، تێلی تەمۆ،
شیرێ دایکا تە تە حەلال بە،
مرازێ مە شایا تەبە،
دە تو بکە بلەزینە،
خوە وی سیاریرا بگهینە.
سیارەکی سیاران وێ ژێلڤا تێیە،
ژ جی دپەکە مینا گولێیە،
سیار سیارەکی ئێلا ژێرینە،
فەسەلا ویرا کڤشە،
وەکی سیارێ خێرێ نینە.

تو خوە وی سیاریرا بگهینە،
تمتێلا ویرا کڤشە

مینا ئووسڤێ جارێیه،
خومێ کحێلا عەرەبییە.
دە لاوۆ بکە، بلەزینە،
بێ، ئووسڤۆ براو،
باڤێ من چەعڤێ تە ڕادمووسە،
باڤێ من تو گەلە سلاڤ دکری،
تو قەت هاژ ئێلا ژێرین نینیی؟
شەڤێ دنێ، نیڤێ شەڤێ بوو،
بارانەکە گور ل مە گرتبوو،
ئەو چ قالمەقالم بوو،
ل ئێلا مە ژێرین کەتبوو؟

سەر خەبەرێ باڤێ
تەمۆ خوە گهاند هەسپێ،
مینا با و برووسکێ،
بەرژێر بوو ژ سەرێ چیێ.
گهیشتە سیارێ ژ دوورڤا هاتی،
گۆ، ئووسکۆ، براو، باڤێ من حەمزە،
تو گەلەکی سلاڤ دکری
دگۆ، تو قە هاژ ئێلا ژێرین نینی؟
ئووسڤێ جارێ ل تەمۆ دقیرینە:
مالا تە خرابە سەر مالا مدا،
وەێ خوە دایە ئێلا ژۆرینە،
پشتێد خوە دانە ل خاس بەلگیانە.
قە هاژ بایێ دنێ تونینە.
شەڤا دمربازبووی، نیڤێ شەڤێ بوو،
بارانێ سەرمەدا ژی گرتبوو،

بینباشێ ڕۆمێ، شوورێ دەولەتێ،
ب دەستێ زۆرێ خوە مەرا گهاند،
ئێلا مە ژێرین گرت و شەوتاند،
خۆرتێ ئێلێ ژی وێ دیل برنە.
بینباشێ ڕۆمێ دایە بەر قامچیا
بیستوونج خۆرتا عەلیبەگێ خارزیا،
دەستێ وانە کەلەمچێنە،
لنگێ وانە قەیدێنە،
ستۆیێ وانە لەلێنە،
خێرا گرتیا ژ خومیارا تونینە.
بینباشێ ڕۆمێ سمێل بادایە،
قورە سەکنیە سەر سەرێ عەلیبەگێ خارزیا،
و کریە گازی پێشییا جماعەتێ:
"ژ ئیرۆ شووندا، دبێژم وەرا،
گهیشتییە ڕۆژا خەزەڤا کوردا،
ئەزێ ب زۆرێ، ب پێلێ ئاگر
بشەوتینم ئوورت-ئۆجاخێد وە.
ئەڤ کوردێ هانا خراڤ کرنە،
ناڤێ دەولەتا ڕۆمێیا گران؛
دە هەرە حەمزە مێرمکی چێیە،
مێرمکی سەرخوە، تووتکێ کولێیە،
برا بێ ژ مە ب دەستێ زۆرێ،
گرتیە ئێلا وە خلاسکە قەتلێ".
ئووسڤێ جازێ هێ کوتانەکر،
خەبەرا پاشن ئەو ژی بایێ بر،
تێلی تەمۆ ب دو-سێ زەنگۆیا

١٩٢٣-٢

تەنشتا كحێلا عەرەبیدا،
نافا چەند دەقا ئەوێ خوە گهاند
تێلی حەمزەرا.
باڤۆ، شیرنۆ،
باڤۆ، دەلالۆ،
باڤۆ، هەی باڤۆ،
مالا مە شەوتیۆ.

مە خوە دایە ئێلا زۆرینە،
قە هاژ بایێ دنێ تونینە،
لێ تو نابێژیی، وەکی ئێڤاردا،
بینباشێ رۆمێ ب دەستێ زۆرێ،
خوە ئێلا زێرینرا گیهاندیە،
چارنکالێ وێ ئاگر پێدایە،
بیستوویێنج خۆرتا عەلیەگێ خارزیاڤا
تەڤە بێگونە دیل برنە.
بینباشێ کافر ب دەستێ زۆرێ،
ئێلا مە زێرین هاتییە خەزەڤێ،
جەهدەکێ لاوکێ مە عەشیرا،
تەڤ کەتنە بن سمێد هەسپێ ئەسکەرێ رۆمێ.
بینباشێ رۆمێ ناف نیڤێ شەڤێ،
کوردێد دیل بری تینە ئۆرتا بێدەرێ،
وانا کێلەک-کێلەک وەلدگەرینە،
ب چێر و کوتان و بێیسافی.
بەسە، وەعدەیە دها ئەم تابکن،
دەولەتا رۆمێ وا بێیسافی
ها دقەلینە کۆکا کوردایە.

تێلی حەمزە سێ دەنگا تەمۆ دقیرینە،
دڤێ، تەمۆ لاو، تو باڤێ من کربی،
تۆیێ دها وەعدە مە ئوندا نەکیی،
دە سیاربە، سیاربە بلەزینە،
خوە ئێلا مە کوردارا بگهینە،
بێژە حال-حەوالا مە و ڕۆمێ ئەڤە.
چەند سیارێ باڤچێ-خالچێ،
ب چەک و سیلحڤا،
ب کارێ شێرڤا،
تو کەکێ خوەرا بگهینە،
حەتانی باڤێ تە وێ دەمێ
تڤدیرا شەرێ گران دڤینە.
یازیا گرتیێد مە دەستێ کافرە،
کارێ تە بەردانا وان گرتیا
برا ڤە تونەبە.
دە سیارە، پەلەوانۆ،
دە سیارە، براۆ،
خوە کوردارا زووترکە بگهینە.

تێلی تەمۆ، کورێ تێلی حەمزە،
خوە زووترێ زینێ پشتا هەسپێ دخینە،
ڕیا سەهەتەکێ نیڤ سەهەتیدا دقەدینە،
خوە ئێلا کوردارا دگهینە،
دەفا هەوارێ ل ور دخینە.
دڤێ برانۆ، پزمامنۆ،
حالێ مە دەستێ ڕۆمێدا گرانە،
ئیشەڤ نیڤێ شەڤێ گوندێ مەیە ڕەنگین،

ب دەستێ ئەسکەرێ ڕۆمێ بوویە خوەلی.
دە ڕابن، ڕابن، ڕابن،
دە ڕابن هەرنە هەوارێ.
و چاخێ تێلی تەمۆ ب مێرانی،
کەتە پێشیا سیارا ب سیاری،
تێلی حۆشێ پارا لێ کرە گازی:
- تێلی تەمۆ، لاۆ سەبرکە،
چەند تەمینێ من ل تە هەنە،
برا دا شیرێ سپی ل تە حەلال بە،
دا خوەدێ ل ئۆغرا تەبە،
لاۆ، باڤێ تە دها کالبوویە،
ژ مەزنایێ ئاقل سەری نەمایە،
بەختێ تەمە، تەمۆ، شیرنۆ،
تۆیێ ڤێ تەمیێ باڤێ خوەرا بگهینی.
بێ دایکا منە حۆشێ دگۆ،
ڕۆما ڕەشە پر خاینە،
برا وێ ل خوە نەحەسینە.
کۆم ب کۆم لاوکا خوەرا نەگەرینە،
سیارێ ئەسکەرێ ڕۆمێ سەرێ ڕیا دڤەبۆینە،
گێدووکا شەوتیدا ڕێ ل وە بگرە،
گولّا نۆلا تەعڤی تەیرۆکێ
وێ ژۆردا ل سەر وەدا ببارینە.
سیارە جاهلن، توونسزن،
دڤەک خوە شاشکن، حوجوومکن،
کەسەک ژ وان ساخ نامینە.
برا نیڤێ سیارا، جاهلا،

باڤێ تە پاشدا ڤەگەرینە،
و مەعنا ڤەگەراندنێ وان پێ نەحەسینە.
دە لاوٚ شیرنۆ،
لاوٚ مێرخاسۆ،
ئۆغربە وەرا".

تێلی تەمۆ و دۆنزدەهـ مێرێ چێ،
ب چەک و سیلح ژ چیێ چوونە ژێر.
تەمۆ زووترکە خوە حەمزێرا دگهینە،
دڤێ، باڤۆ، خەبەرا دایکا حوجێ ئەڤ بوو،
"رۆما رەش پر خایینە،
برا وێ ل خوە نەحەسینە،
کۆم ب کۆم لاوکا خوەرا نەگەرینە.
سیارێ ئەسکەرێ رۆمێ سەر پیا دەڤەبۆینە،
گێدووکا شەوتیدا رێ وێ ل وە بگرە،
گولا نۆلا تەعڤی تەیرۆکێ
وێ ژۆردا ل سەر وەدا بپارینە.
سیارە، جاهلن، توونسزن،
دڤەک خوە شاشکن حوجوومکن،
کەسەک ژ وان ساخ نامینە.
برا نیڤێ سیارا، جاهلا،
باڤێ تە پاشدا ڤەفەرینە
و مینا ڤەگەراندنێ وان پێ نەحەسینە".
باڤۆ، وەلە ئاقلێ وە سەرێ مەدا تونینە،
کرنا کو تە پێ گرتیە،
نێتا مە تو مرازارا ناگهینە.
مێرێ کورد چڤاس ژی خورت بە،

ئەو نكارە ئاشكەلا ڕابە،
دەولەتا ڕۆما خايين وەلگەرينە.
دە تو وەرە،
سيارا كشكا بجڤينە،
ئەوان مەعنا ڤەگەراندنێ نەحەسينە،
دەولەتا ڕۆمێ بێبەختە، دەرەوينە،
تو وێ ل مە نەحەسينە،
ئەوێ سەرێ ريا دڤەبڕينە
گێدووكا شەوتی ڕێ ل مە ببرە،
گولا نۆتلا تەعڤی تەيرۆكا بهارێ
وێ ژۆردا ل سەر مەدا ببارينە.
سيارە جاهلن، توونسزن،
دڤەک خوە شاشكن، حوجوومكن،
كەسەک ژ وان ساخ نامينە...

تێلی حەمزە گوهداريا تەمۆ كر،
ب تليێ درێژ سمێلا پالک نيک كر،
گۆ، – تەمۆ، لاۆ،
ئاقلێ ديا تە ئاقلێ مێرانە،
لێ برا حوجێ توجارا، بيرنەكە،
لاوێ كوردا بۆنا دژمنا،
مينانی قتيتكێ مێرێ كولێ نە.

تێلی حەمزە خەبرا خوە كوتا كر،
ب عەينەلوويا قۆنتاخ زيڤين
سێ گولە هەوێدا ئاگر كر،
سيارا دۆرا خوە تۆپ كر،

گۆ، – گەلی سیارۆ، باڤێ من کربن،
هوون ستوونا جماعەتا کوردا نە،
ئیرۆ ڕۆژا ئۆغرمێ گرانە،
گوڵە دبارن مینا تەڤیێ تەیرۆکێ،
هەسپێ بن وە دا تەڤ مەعنەگینە،
زینێ پشت وانە مەردینی نە،
گەمێ وانە دیاربەکری نە،
تڤنگێ ملێ وە دا کوچک چاپی نە،
بەختێ مدا بە،
قسوورا ئەز کو بدم سەر وە تونینە.
دە هەسپا سیار بن، سیار بن لاوکنۆ،
ئەمێ هەرن پێشیا بینباشێ ڕۆمێیە،
و کۆما سیارا مینا با و برسکێ
بەرێ خوە دانە بەر ب دمڤەگۆینێ.
چاخێ سیارێ تێلی حەمزە
پشتا چییدا خار بوون،
ئەوی سێ دەنگا کرە گازی:
تەمۆ لاۆ، تەمۆ،
تو باڤێ من کربی،
کۆنێ هانی بن پالا چیێ دبینی؟
ئەو کۆنێ مستێ ڕەشکێ یە،
مستێ–دەستەبرانگێ باڤێ تە یە،
خوە ل وی کۆنی ڕا بگهینە،
زانم مستێ دەستەبرانگێ من
مێرێ ڕۆژێ ئۆغرمێ گرانە.
دە بکە بلەزینە، بلەزینە،

خوه مستێ رەشكێرا بگهینە
بێژە ئاپێ مستێ، فەلەكە خایینە،
ئەو ئیرۆ ل مە بوویە مێڤانە،
بێژە دۆنزدەهـ مێرێ عەشیرێ یە سیاری،
دچن پێشیا بینباشێ رۆمێ یە،
قەزیاكە پر گران ل مە قەومیە،
ئێلا ئەم گران دانە بەر گولانە،
ئۆدە و كۆن ئاگر پێدانە،
عەلیبەگێ خارزیا بیستوپێنج گرتیاڤا
بوونە دیلێ بینباشێ رۆمێیە.
برا مستێ برا خوە ئاگلە نەكە،
سەد زێری دەیین مەرا بشینە،
حەتا سەلامەتی ژ ڤی شەری
ئەم ڤەدگەرن ب رووسپیتی،
كو ڤەگەریام هاتم، ئاد و قرار بە،
برا ل دەوسێ
بیست سەلەفێ خوە سەردا بستینە.
دە، تێلی تەمۆ، خوە ئەگلە مەكە،
خوە مستێ رەشكێرا بگهینە.

تێلی تەمۆ مینا بایێ برووسكێ،
چرییا هەسپێرا پێرا-پێرا
خوە ل كۆنێ عەرمبیرا دگهینە،
دڤێ، -كەكێ مستێ، رۆژا تە خێر،
قەزیكە گران ل مە قەومییە،
دۆنزدەهـ مێرێ عەشیرەتییە سیاری،
دچنە پێشیا بینباشێ رۆمێ یە.

ئێلا مه گران شەڤ نیڤێ شەڤێ،
دانه بەر گولّا، ئاگر پێ دانه،
عەلیبەگێ خارزیا بیستوویێنج گرتیاڤا
بوونه دیلێ رۆما رەش خایین
باڤێ من حەمزە وا گۆت:
"برا مستێ خوه ئەگله نەکە،
قەدەرا سەد زێری دەینی بشینه،
چاوا ڤەگەریام ژ شەرێ گران،
سەدی بیست سەلەڤێ زێده بستینه".

مستێ رەشکێ پاتکا خوه خوراند،
ب لەز و بەز خوه ستێرا گیهاند،
قوران ژ بن ستێر ها-هانگا دەرخست،
سێ جارا دەستێ خوه ل قورانێ خست،
بەر تێلی تەمۆ سۆند خوار،
گۆ: - تەمۆ لاۆ، خوەدێ شەعدە یە،
مالا من میرات بە،
خێرێ ژێ نەبینم،
روحێ مستێ وێ دنێ
قیرێ دا بکەلینن،
لڤەک زێر مالا من دا نابینن.

گلی دەڤێ مستێ دا نیڤی ما،
تێلی تەمۆ رابوو سەر پیا،
گۆ، -مالا مستێ گرانە، پر گرانە،
تێ سۆرکرنێ ژ پەنگێ زێرانە،
برا بەر دەستێ خوەدێ ئاد و قرار بە...

تێلی تەمۆ لنگ دکە زەنگوویە،
بەرێ خوە ددە ئالیێ باقێ یە.
مستێ رەشکێ سپیچۆلکی
ڤەدگەرە تێ ئالیێ مالێ یە،
دینا خوە ددە کەڤانیا مالێ
هەڤیر تەزە دسترێ.
دڤێ، عەیشێ ها عەیشێ،
ڤێ گاڤا هانێ،
تێلی تەمۆ بایێ برووسکێ،
خوە ل کۆنێ مە ڕا گهاند،
گۆ، – قەزیکە گران ل مە قەومیە،
دۆنزدە مێرێ عەشیرەتێ یە سیاری،
دچنە پێشیا بینباشێ ڕۆمێ یە،
ئێلا وان گران شەڤ نیڤێ شەڤێ،
دان بەر گولا، ئاگر پێ دانە،
عەلیبەگێ خارزیا بیستوو پێنج گرتیاڤا
بوونە دیلێ ڕۆما ڕەشە-خاین.
و تێلی حەمزە، دەستەبرانگێ من
سەد زێری ژ من خوەستیە ب دەینی،
لێ من سۆند خار ب ڤێ قورانێ...
حال-حەوالێ من و تەمۆ ئەڤ بوو،
ئەو گەلەک ژ من نە ڕازی بوو...
لۆڤەلەزکێ کولێ ل من گرتنە،
من چەعڤێ ویدا ڕوحستینێ خوە دیتنە.

تێلی عەیشێ، کەڤانیا مالا گران،
زوو دکە و دلەزینە،

دهستێ خوه ژ هەڤیر دەردخینه،
تەپەکێ دودا ناڤ چەعڤێ مستێ دخینه،
دڤێ، –بمری مێرکۆ، بمری،
مال هیڤیا من بمینه،
تە چەوا سۆندێ دەرەو خارنە؟

تێلی عەیشێ کولفەتا قەدر، سیانەتا،
داو و دەلنگا هلتینه،
پارا پەی تەمۆ دکەڤە،
ئاگر بەری لۆدا گیهێ ددە،
پێلێ ئاگر دگهیژە عەزمینه،
و پەی تێلی تەمۆ دکە قیرینه:
– تەمۆ لاۆ، تەمۆ،
ئەز بەختێ تە مە، تەمۆ،
تویێ دزگینیا مەعنەکیێ بکشینی،
بۆنا خاترێ مەتا خوە یە،
تویێ ب خەید ژ مالا مە نەچیی...

دەنگێ عەیشێ کەتە نەوالا،
کەتە زنارا، چیا و وان بانیا،
گهیشتە گوهێ تەمۆیێ سیاری.
تەمۆ دەمەکێ تێلی عەیشێ بیر تینه،
دزگینێ ل دەڤێ مەعنەکیێ دخینه،
بەر دەرێ مستێ رەشکێ دسەکنینه،
عەیشێ خوە ل تەمۆ را دگهینه،
دەستێ خوە بەر پشتا خوە دخینه.
سەد زێری بەر تێلی تەمۆ داتینه،
– تەمۆ لاۆ، ئوورت و چارا مبیی،

سەڤا خاترێ مەتا خوە بباخشینە،
بێبەختیا مستێ حەمزێ نەحەسینە،
ڤان زێرا سەڤا خاترێ مەتا خوە هلینە،
بێژە باڤێ خوە تێلی حەمزە،
تێلی عەیشێ ڤان زێرا
چاوا خووشک تەرا دشینە،
چ کو لازمی وی بە، برا جاڤێ
سەر خووشکا خوە دا بشینە.
وەختا مالا مە ژ زۆزانەکێ باردکە،
و زۆزانەکە دنێ داتینە،
ئەختەک ئانجاخ زێرێ مە دگەرینە،
هەر تەنێ برا لاوێ مە کوردا
عەلیبەگێ خارزیا بیستوویێنج گرتیاڤا
ژ دەستێ بینباشێ ڕۆما خایین ڤەگەرینە.
تێلی تەمۆ خوە باڤێ ڕا دگهینە،
دڤێ، باڤۆ، بهارە خوەش بهارە،
تو دەولەتیا مەجێربینە،
قەدرێ خوەدی بها دەستانی،
بادیهەوا ئارزان نەجێربینە.
حال و حەوالێ من و مستێ ئەڤە...

تێلی حەمزە دەرمکێ هەر دەرمکێ،
بەر پیێ خوە نهێری و کوور فکری،
پاشێ هێدیکا سەر ملێ چەلێ زڤری،
گۆ، – ئەرێ لاۆ، تویی ڕاستی،
مێر ئەو مێرە، کو ب ڤی دەستی،
دەرمان دکە برینێ گەستی.

ده رابن خۆرتنۆ، رابن،
ئەمە رێوی نە.
ئێڤار دا کۆما خۆرتا مەشیا،
ئێڤار دا کۆما سیارا کشیا،
ئێڤار دا دزگینا هەسپا ماشیا.
وێ رۆژێ تەعڤێ ژی خوە ئەگلە کر،
ئەو ژی دەرمنگ قولبی،
ب پەنجێ خوە را ڤەرێکر،
ڤەرێکر سیارا بەرب ئێگر.
وێ شەڤێ کولیلک ژی رانەزان،
وانا ژی خوە جڤاندە هەڤدو،
وانا ژی ب نەرم سەرێ خوە هەژاند،
و لاوک بەرب شەر ڤەرێکر،
وێ شەڤێ کانی هەڤرا خولخولین،
هەڤرا خولخولین ژ رێ زڤرین،
وانا ژی ب قەیدێ خومیە خولینە،
دکۆتن، "ئۆغر بە، ڤەگەرن زووترە"،
وێ شەڤێ تەیر توو رانەزان،
تۆپ بوون رەفێ خوە گرێدان،
وانا ژی ب قیرین و قووژین،
دکۆتن، "خۆرتنۆ، هەر بژین"،
تەعڤێ پەنجێ خوە دها بەرمز کر،
هنەکی ژی ئەوێ خوە ئەگلە کر.
بەر پرێ تێلی حەمزە سەکنی،
سێ گولە هەوێدا ئاگر کر،
کۆ، – خۆرتنۆ، ڤردا ها ڤردا،

ئەمێ وا هەرن، پێش دا ها پێش دا،
تەمۆ لاۆ، تو خومکی ب خوەدێکی،
بەرێ هەسپا بۆز بەرب ڤی چیایکیی،
تو خوە گوندێ کیارا بگهینیی،
هەواریا مە بەر گوهێ دەستەبرانگێ من خینی،
بێژە دەستەبرانگۆ، ها دەستەبرانگۆ،
حال و حەوالێ مە و ڕۆما ڕەش ئەڤۆ،
بێژە، باڤێ تێلی حەمزە،
دپرسە کێف-حالێ تە و مالێ،
برا ڕابە، زانم پر زەحمەتە،
تێلا برووسکێ سەر سێ ڕیادا بکشینە،
چکا کافرێ سیارێ بینباشێ ڕۆمێ
عەلیبەگێ خارزیا بیستوویێنج گرتیاڤا
ب کوتان بریە کیژان ڕێدا؟
ڕابە وان دایە دیباربەکرا شەوتی،
یانێ بازیدا وێرانە-وێرتاس،
یانێ ژی بەر ب دەڤەبۆینا وێران؟
دە لاۆ بلەزینە، بلەزینە،
وەعدە بادیهەوا نوندا نەکە،
زووترە جاڤەکێ باڤێ خومرا بینە.

تەمۆ خوە زینێ هەسپێرا زەلقاند،
تەمیێ باڤێ تەڤ سێوراند،
و بەرێ خوە دا بەرب گوندێ کیا،
باوەریا کۆمەکێ دلدا.
تەمۆ شەڤەکێ تەمام ڕێ چوو،
بەربانگێ هەر بەربانگێ

گهیشته گوندێ دەستەبرانگێ باڤێ.
ئەو گوندێ بچووک، هۆلکێ خوەلی،
ناڤ کەڤر-کوچکا بوویبوون نە تو حالی.

تێلی تەمۆ خوە دەرێ مالێ کیێرا دگهینە،
ب کولما ل دەرێ وی دخینە،
دڤێ ڤەکن، ڤەکن، ئەمە رێوی نە.
خومێ مالێ ژنێ دقیرینە،
دڤێ، - خانێ، ها خانێ، بلەزینە،
تو خوە دێریرا بگهینە،
سڤکایی چرا-پلتێ ل مە ڤێخینە،
ئەڤا نە چڤێتا رێوینە،
تەخمینا من ئەڤا شڤێتا کوردا نە،
شڤێتا تۆرنێ مالا شەرۆ نە
ڤێ بەربانگێ، بەربانگا سبێ،
وانا بەرێ خوە ل مە دانە،
عەسە قەزیاک ل وان قەومیە.
خانێ دکە دلەزینە،
خوە دێری را دگهینە،
چرا پلتێ ڤێدخینە،
ئەجیبەکە گران بەر چەعڤە دبینە:-
تێلی تەمۆ، کورێ تێلی حەمزە،
ڤا ل پشت دێری سەکنیە،
خوودانێ ئاڤیتییە ل عەنیێ یە،
پریسکێ ئێگر دپەکێن ژ چەعڤانە.
دڤێ، - لاۆ، تە خێرە، خێر نینە،
چ ل مالا برێ من قەومییە،

تەمۆ دڤێ، -کیاو، ها کیاو،
قەزیکە گران ل مە قەومیە،
بینباشێ ڕۆمێ، شووری دەولەتێ،
ئێلا مە ژێرین دایە بەر میراتێ
عەلیباگێ خارزیا بیستپێنج گرتیا ڤا
ئەڤا چەند ڕۆژە دایە بەر قامچیانە،
دەستێ وانە کەلەمچێ نە،
لنگێ وانە تەڤ قەیدێ نە،
ستویێ وانە لەلێ نە،
خێرا گرتیا ژ خومیارا تونینە،
باڤێ من تە ڕا پر سلاڤ دشینە.
دڤێ، –برا سەڤا خاترێ براتیێ
سێ تێلێ برووسکێ عەزمێن خینە،
چکا کافرێ بینباشێ ڕۆمێ
بیستووپێنج گرتیێ عەشیرەتێ
کیژان ڕێ دا دشینە؟

کیا شەڤ نیڤێ شەڤێ بوو،
خوە ل ستوونێ تێلا برووسکێ ڕا دگهینە،
سێ تێلا سەر سێ قەزا دا دشینە،
چکا بینباشێ ڕۆمێ، شووری دەولەتێ
گرتیە کوردا کێ پێدا دشینە؟
وەختا تێلا سەر ئەرزرووەمێ دکشینە،
دڤێن "برا هێ تو کەس تونینە"

چاخێ تێلا ڕیا بازیدێ دکشینە،
دڤێن: "کورد زوو ڤا ژ برا برینە".
وەختا تێلا ڕیا دەڤەبۆینێ دکشینە،

دفێن: "وەلە بینباشێ رۆمێ،
گرتیە عەشیرێ،
عەلیباگێ خارزیا بیستووپێنج گرتییا ڤا
ل بەر کێلەک-کێلەک وەلدگەرینە،
دە هەرە مێرن برا زوو بکن،
مینا برووسکا عەورێ نیسانێ
خوە گرتیارا بگهینن.
دەست وانە تەڤ لەلێ نە،
لنگێ وانە ل قەیدێ نە،
خێرا گرتیا خوایارا تونینە.
سیارێ بینباشێ رۆمێ ل ڤێ ئێڤارێ،
سمێل بادانە، گۆتیە بەر جماعەتێ:
"ئەزێ هێ سێ رۆژا ژی ل بەر بمێنم،
و ئەجەلا کوردا ل ڤر ببێنم،
ئەزێ ڤان گرتیان تەڤ بزێرینم،
برا کوردێ ڤان عەردا هەرن-بێن،
عەجێڤا گران چەعڤێ خوەڤا ببینم،
و برا دەستێ خوە ژ خرابیا
دەولەتا رۆمێ دها بکشینن".
ئاخ، چەوا خارزیێ تێلی حەمزە،
بیستووپێنج گرتیاڤا مێرخاسێ مێرا،
کەتنە دەستێ دەولەتا رۆما خاین.
هەر ئەڤ یەکا تێلی تەمۆ سەکر،
لنگەکی خوە ل سەر پشتا مەعنەگیێرا خار کر،
و بەر باڤێ خوە ژ سەر هەسپێ پەیا کر.
گۆ، -باڤۆ، ها باڤۆ، خوە ئەگلە مەکە،

گرتیێ ئێلا مه ژێرین
دهستێ بینباشیێ ڕۆمێ زاره-زارن،
دهستێ وانه کهلهمچهنه،
ستوێ وانه تهڤ لهلێ نه،
لنگێ وانه ل قهیدێ نه،
سهر ڕیا دهڤهبڕینا شهوتی
کێلهک-کێلهک وهلدگهرینن.
ژ دهستێ کوتانێ خێرا وان تونینه.
کافرێ سیارێ بینباشیێ ڕۆمێ
هێ وێ سێ ڕۆژا ل ور بمینه.
ب سالخیا گوندیا،
ڕێویێد وان ڕیا
دهسمالا سهر چاڤێ خوه دشدینن،
بۆنا عهلیبهگێ خارزیا و بیستووپێنج گرتیا
ل وێ ڕۆژا گران دا نهبینن.

وێ ژ وێدا تێن عهشیرێ کالن
ژ دیتنا گرتیا کوور دنهلن،
وهختا چهعف ل تێلی حهمزه دکهڤن،
ههسپا زهنگو دکن و بهر ب وی دلهزن،
دهنگهکی دودا حهمزه دقیرینن،
دڤێن، تێلی حهمزه، ها تێلی حهمزه،
تو هاژ ڤافێ خوه تونهیی،
ڕۆما ڕهشه-خایین ب دهستێ زۆرێ،
مه کوردا گشکا دزێرینه.
ده بلهزینن، مێرخاسێ کوردا،
بهرێ خوه بدن بهرب دژمنا.

بەری ئێڤارێ، هێ شنگا-شنگا با بوو،
تەعف ژی ب خەملا خوە ل ڤێزا چیێ بوو،
سیارێ تێلی حەمزە کشیان ل رێ دا،
ئوندا بوون ل ناڤ تۆز-دوومانێ دا.
بەربانگا سبێ چیکینیا تەعفێ بوو،
سیارێ تێلی حەمزە ل وێ بەستێ بوون،
چاردەهـ کۆنێ رەش عەرەبی،
ل وێ راستێ بێ خۆف دانیبوون.
دیلێ کوردا ب تی و برچی،
ژ بەربانگا سبێ حەتا ئێڤارێ،
کێلەک-کێلەک وەلدگەراندن ب کافری.
تێلی حەمزە ژ دوور ڤا بهیست نەعلی،
وێ نەعلینێ دلێ وی ژۆر دا ئانی،
ڤەی گرێ دل-هناڤێ وی شەوتی.
گۆ، - سیارنۆ، هەی سیارنۆ،
ئەزێ ب قلخێ دەوریشا هەرم،
بەر کۆنێ بینباشێ رۆمێ یە
هەرگێ کو بێ شەر و بێ دەو،
بینباشێ رۆمێ نایێ یۆلێ یە،
جارا ئیژارن خەلقێ بڤینە،
مێرانیا خالێ عەلیبەگێ یە.

تێلی حەمزە خوە دکە قلخێ دەوریشە،
دچە دگهێژە بەر کۆنێ بینباشێ رۆمێ یە،
دڤێ، -بینباشۆ، ها بینباشۆ،
تو ڤان گرتیا بەردە ژ تەنگیێ یە
هەر یەک ژ وان چرا مالەکێ یە،

ڤێنەسینە چرا وان ئۆجاخانا،
کورد بریندارن، برینێ وان هێ زووڤا یە،
مەزن نەکە وێ برینا ملەتیێ یە.
دە وەرە، بینباشۆ، ها بینباشۆ،
تو ڤان گرتیا بەردە ژ تەنگیێ یە،
ڤان گرتیا ئازاکە ژ زەلوولیێ یە،
بۆنا خاترێ خوەدێ یە.

بینباشێ ڕۆمێ دەرتێ ژ چادرێ،
دینا خوە ددێ بەر دەرێ وی
دەورێشەک ژار ل ور سەکنیە.
بینباش سێ دەنگا خولاما دکە گازی،
دڤێ، -خولامنۆ، وەرن ها وەرن،
وەرن ڕاستکن دارا ڤێ ڕووزێ یە،
باڤێژن ستوێ ڤی دەورێشی یە،
پاشێ دەستپێکن نمێژا سبێ یە.
گلی هێ دەڤێ بینباشێ ڕۆمێ دا،
تێلی حەمزە سێ گاڤا خوە ژ چادرێ
ها ژ چادرێ دوور دخینە،
عەبا دەورێشیێ سەر خوە هلتینە،
زووترمکە هازریا خوە دڤینە.

دڤێ، -تەمۆ لاۆ، بلەزینە،
خاس عەینەلوویە باڤێ خوە ڕا بینە،
ئیرۆ یان ڕۆژا منە پاشنە،
یانێ ژی ئەزێ وەلگەرینم ستوونا ڤێ چادرێ یە.
ئووسڤێ جازێ دەنگەکی دکە گازی،
دڤێ، - کەکۆ، ها کەکۆ،

گوڵا من ڤا بەزی،
تو نەحەرمینە گوڵا خوە حەلالی،
ئووسڤێ جازێ کورێ کوردە چیایی،
خوە هێدیکا ددە پشت کەڤری،
گولەکێ بەردده بەرب چادرێ کافری.
بینباشێ ڕۆمێ دقەتینە بشکۆکا چادرێ،
خوە پاراڤا کەندالێ ژێرین ڕا دگهینە.
ئووسڤێ جازێ پاراڤا گولەکێ داڤێ،
گولە ڕاست دگەرە ل قۆتکێ،
قۆتک دفرە
ژ سەر فینۆئێ سەرێ بینباشێ ڕۆمێ.

تێلی تەمۆ ئاگر ل چەعڤا،
خوە کۆنێ پێشرا دگهینە،
شوورێ شین بەر خوە دکشینە،
مینا برووسکێ ژۆر دا تینە،
قەید-زنجیرێ بیستوویێنج گرتیا
مینا مووکی سەریا دقەتینە،
عەلیبەگێ خارزیا بیستوویێنج گرتیێ کوردا ڤا
ژ دەست-پیێ دژمن دەرتینە.

شابوون کەتە دەشت و بانیا،
کلام و ڕەقسێ خوە دانە هەر ئالیا.
وێ ڕۆژێ تەمام، ل سەرێ چیێ،
کۆڤەندەکە گران حەمدێ خوە گەریا.
ئێڤارێ جاڤا بینباشێ ڕۆمێ
دچە بگهیژە ل ستامبوولێ،
"تێلی حەمزە و کوردێ چیایی،

بێفەیدە کرنە تاخبوورا ڕۆمێ،
ب شوور و قەما، ب دەستێ زۆرێ،
وان حجووم کریە سەر بینباشێ ڕۆمێ،
ئازا کرنە ژ قەید و زنجیرا،
عەلیبەگێ خارزیا بیستوویێنج گرتیا"
شایی هێ تەزە دها پر دبوو،
چاخێ فەرمانەک تەزە پەیدا بوو:
"کی کو بۆنا سلتانێ ڕۆمێ،
سەرێ عەلیبەگێ و تێلی حەمزە
بینە و دمینە دیوانا ڕۆمێ،
وێ ب گرانیا سەرێ هەردوا،
زێرا بستینە ژ دەولەتا ڕۆمێ".
سەر ناڤێ کوردا فەرمانێ ئوسا،
ژ ستامبوولا پەیتەختا ڕۆمێ،
پر بەلا بووبوون ل ناڤا دنێ.

بەری ئێڤارێ سیارێ کوردا
بەرێ خوە دانە بەرب مالێ خوە.
کشیا کۆما سیارێ کوردا،
کشیا، کشیا، کشیا ها پێش دا.
عەلیبەگێ خارزیا سیارێ کورداڤا،
تەڤ تێلی تەمۆ و تێلی حەمزە
دەرباز دبوون ناڤ گوندکی خرابە ڕا،
ب ئەشق و شا، ب کەن و حەنەک.

پشت خرابەکی ل بن سیا دیوێر،
خوە ڕا پال دابوو یەکێ کالەمێر،
ژ دەنگێ سترانێ، فرینا هەسپا،

ئەو کالەمێرا ڕابوو ژ پیا.
دیت کو ئەو سیارن، خۆرتێ بەژن بلندن،
پشتا مەعنەگیا خوە گرتنە ڕند.
فکری خوە ڕا، خوە ڕا دا ستاند،
گۆ: "چرا ئەزێ خوە بتەلینم،
ئەزێ گولەکێ ڤر بتەقینم،
بلا ئەڤ سیارا کو وا کوبارن،
نەڤێژن چ گوندەکی تەڤ خرابە یە".

و فەکێ کال، هەسپێ هەسپا،
دەستێ خوە ئاڤێتە تڤنگا کەر-لال،
تڤنگا مەزن، کو زەنگ گرتبوو،
هێ زوو ڤا فیشەک خوە دا نەدیبوو،
ڤێ جارێ تەقیا سەر سەرێ سیارا،
دوومانێ پێ گرت، دووما گران.

و چاخێ سیارا ل سەر وی دەنگی،
ل هەڤ نهێرین، پاش دا زڤرین،
ئەو عەلیبەگێ خارزیا، کو ژ دەست دژمن،
هێشکا ئازا بوو و خوە ڕا شا دبوو،
کەتبوو عەردێ خوونێ دا مەوجی.
ئەوی کوور نەعلیا و وا گۆ حەمیا:
- خال، خالۆ، خالۆ شیرنۆ،
سەرێ من قوربانا ل سەرێ تە بە،
عەمرێ من ل سەر عەمرێ تە بە،
ئاخ، چەوا کافرێ کورێ کافرا
نەهیشتن خالێ من ب مراز شابە،
ئاخ، چەوا مێرانیا خالێ من عەردێ خست،

ئاخ، چەوا ئەوی فەکیی
مێرانیا خالێ من ئوندا کر،
دلێ دەولەتا ڕۆما خایین،
ب کوشتنا من شا کر.
هێسر، کو هێ تو کەسی
نەدیبوو ژ چەعڤێ تێلی حەمزە،
وێ گاڤێ هێسر ژ چەعڤێ هاتن خارێ.
ئەو نێزیکی عەلی خارزیا بوو،
کو ل ئەدرێ ڤەلەزیا بوو
و گولا خەدار ل سینگ دا بوو
گۆ، – خارزیا، ئاخ خارزیا،
دلێ من کینە-کینە،
برا فەکیێ خێرێ نەبینە،
چەوا ب مخەنەتی تەل دا بەخیرێ دا
گولەکێ سینگێ عەلیبەگێ خارزیا
مێرێ مە ڕا دایە ب نەیاری.
برا ڕۆژا ئیرۆ ئین،
ئاخ ڕۆژا ئیرۆ ئین،
کۆکا مێرا ل من بهاتا،
تەنێ برا ناڤێ کوشتنا
عەلیبەگێ خارزیا دنێ نەکەتا.

– خالۆ، هاڤینە، خوەش هاڤینە،
برا فەکیێ بازیدێ خێرێ نەبینە،
چەوا ئەوی گولەک ل من خست؟
گولە خەدارە، من زەحف دێشینە،
دە هوون بکن بلەزینن،

جنیازێ من برهڤینن،
ڕۆما خایینه،
وێ بێ ب دهستێ زۆرێ
جنیازێ من ژ وه بستینه...

## حکیاتا بەکسەمەت

زهمانەکی، تەخت-تاجەکی،
پادشاک هەبوو وەلاتەکی،
خوەدێ چل کور پێشکێش دابوو،
چل ژی ویرا نۆلا چیا بوون.
سال سالا چوو، مەهـ مەها چوو،
جماعەتێ پرسا هەڤیێ دابوو.
– پادشێ پادشا، تمێ خوەش بی،
حەتا کەنگێ بێ نەبی بی؟
چل کورێ ته شکر هەنە،
ناڤا سالێ ب دەف، زورنە،
هەما دودا بزەوجینە.
پادشا شەرمکر ڤان خنەبەرا،
ڕابوو جڤاند دیوانا خوە،
گۆ، حال-حەوال ل من ئەڤە،
دڤێن کورا بزەوجینە.
پادشا هلدا دا و ستەند،
بەرب سندۆقێ خوەدا لەزاند،
ڕابوو ڕۆکێ ژ مال دەرکەت،
چۆل و بەریستانا ئەو کەت،
دۆرا دنێ تەمام گەریا،
پۆر و پۆشمان ئەو ڤەگەریا.

ئەو ڤەگەریا شەهەرێ خوە،
بوو مێڤانێ کاڤانێ خوە.

وێ ئێڤارێ کو ڤەگەریا
کاڤانێ کال ژ چۆل-بەستا،
ب کەن-حەنەک ب گالە-گال،
چل ڤیز پێرا هاتنە مال.
پادشا کاڤان سلاڤ دان هەڤ،
سلاڤ ل هەڤ ڤەگرتن ئەو،
ژ هەڤ پرسین حال-حەوال،
لتبێ شیرن گەلەک دەلال،
پاشێ مالخوێ گۆتە مێڤان،
گۆ، مێڤانۆ، وا ب دەورێشی
ئەڤ چەند سالە تو دگەری؟
گۆ، کاڤانۆ تویی خوەشبی،
ئەز ناگەرم ب دەورێشی،
دەردێ کورا ئانیمە ڤر.
ئەزم پادشێ ڤی شەهەری.
کاڤان کەنییا ب پیرقە-پیرق،
گۆ، مێڤانێ منی لائیق،
تو قەرفێ خوە ل من دکی؟
ب لاقردی من دکەنی؟
پادشێ پادشا ئەگلە نەکر،
ڕابوو ژ پیا کارێ خوە کر،
گۆ، کاڤانۆ، کاڤانێ من،
ئان ژ تەرا کیسێ زێرا،
چێکە خوەرا کۆشک و سەرا.

ئان ژ تارا چل گوستیلکا،
چل ژی تێکە تلیێ قیزا،
وەکی سیارێ منێ متلق،
سەرێ مەهێ ب ڕەقە-رق،
وێ پەیا بن بەر دەرێ تە،
ئەوێ سیارکن چل قیزێ تە.
سەرێ مەهێ سیارێ پادشێ،
سیار بوون هەسپا، کەتنە ڕێ،
ب کەن حەنەک، ب لاقردی
چوون گهیشتن بال خناميا.
هەر چل بووکا ل دەعنەکێ،
ب دەف زورنە سیار دکن تێن.
پادشێ پادشا هەو دڤینە،
سیارێ وییا هێور دانینە.
سبەترێ، چاخێ ڕۆن بوو،
چ کو دیتن ئەجێبەک بوو:
زیاکی مەزن، ڕەشی درێژ،
مەرڤ ترێ پێدا قرێژ،
دەعواتڤانا کریە بەندێ
و پال دایە سەر پۆچکێ.
جاهابا گران ددن پادشێ،
«ئەڤە حال-هەوالێ مە و زیێ».
پادشا ڕابوو بوو دل ڕجاف،
چوو بال وێ زیێ گۆ، بمبارەک،
سەرێ ریا مە ڤەکە هنەک،
دەعواتڤانن ئەمە ئیرۆ،

تو مە نەکە ڤرا گیرۆ،
زیا وێدەرێ دکێلمە:
- مرازێ من تشتەک نینە،
هەر بەکسەمەت تو بشینە،
جەم من برا ئەو بمینە.
هەرگێ هوون چوون، تە دەرەو کر،
تە بەکسەمەت ڤەرێنەکر،
سەر شەهەرێ تەدا دگرم،
ئەزێ گشکا حووفی خوەکم.
پادشێ پادشا ئاد قرارکر،
و ڤێ جارێ دەرەو نەکر.
چل بووک جیکی ب شین-گری،
ب شین مهێل کەزی برین،
ب رەش مشۆت گهیشتن جی.
بەکسەمەتێ کورێ پادشێ،
چوو گهیشتە ل وی زیایی،
گۆ، بمبارەک، ئەز هاتمە،
گۆتنێ تە چکا چنە؟
گۆ، براۆ، بەکسەمەتو،
ئەز نە زیامە، ئەز ژی خۆرتم،
ژ دەردێ خووشکێ ئەز بوومە زیا،
تو گەرەکێ خوە پاش نەگری،
خوە پاش نەگری، کۆمەکێ بدی،
کو خووشکا من مالا باڤێ
زوو بگهیژە بەختەوارێ.
ئەو ژی ڕابوو تەڤ بەکسەمەت،

ڕابوو ل سەر ڕیا شەهەر کەت،
گۆ، ئا، ئەوە شەهەرێ مە،
کو خووشکا من نها لێیە.
پەرێ شەهەر ل مالەکێ،
بەکسەمەتێ کورێ پادشێ،
بوو مێڤانێ پیرەدێکێ،
گۆ-پیرێ، دایێ، ڕەمەل باڤا،
تو خوەی ناکیی قە مێڤانا؟
گۆ، لاۆ، وەرە، وەرە، وەرە،
مێڤان مێڤانێ خوەدێیە.
ب چ دەولی تو هاتی ڤر،
کو ڤەناکی گلی و سور.
گۆ، ئێ، پیرێ، ئەز چ بێژم،
چ ژ خوەدێ تە ڤەشێرم؟
ئەز هاتمە ڤی شەهەری،
بوومە مێڤانێ حەموو دەری،
بۆی خازگینیێ قیزا پادشێ،
بۆی بەدەویا وێ و بەژنێ.
پیرێ جیدا بوو کەڤری،
ژ خەبەرێ وی مێڤانی،
گۆ، هەی لۆ، لاۆ، بێ ئاقلۆ،
ژ دەست ئاقل تونەبوونێ
توێ بڤیی تۆز و خوەلی،
تشت نامینە بەژن و بالێ.

سبەترێ ل شەبەقێ،
بەکسەمەتێ کورێ پادشێ،

چوو هوندورێ وێ کۆشک-سەرێ،
کو پادشا ور ڕوونشتبوو.

پادشا گۆتێ، هاتیی، هاتیی،
کورێ دەلال، من بەلەدی؟
تو کەلا ناڤ وێ دبینی؟
سەریک مایە لێ تەمام بە،
تە چ دلە، چ جەگەرە
ل قیزا من بوویی بەلا؟
شەرتێ منی ئەول ئەڤە:
ڤێ ئێڤارێ ل مەیدانێ،
ئەزێ بەردم پەلەوانێ
خومیە عەزیز بۆی گولاشێ.
تو ژی بینە ڤێ ئێڤارێ،
پەلەوانێ خوە گولاشێ،
هەرگێ ئەوی ئێ من ئالتکر،
شوخولێ تەیێ تەڤ دوروست بە،
هەرگێ ئێ من ئێ تە ئالتکر،
جەلادێ سەرێ تە لێخن.
پادشا ڕابوو ل ئێڤارێ،
پەلەوانا دا مەیدانێ،
بەکسەمەتێ کورێ پادشێ
چوو سەکنی بەر سوورمکێ،
پەلەوانا گازیکرێ،
گۆ، حال-حەوالێ من ئەڤە،
چارمک ل من بکن، برا.
پەلەوانێ کورێ پادشێ،

خوه هنەکی دانە پاشیێ،
ڤردا–وێدا خوه برن–ئانین،
دژمنێ خوه گشکا دانین.

پادشا ئەڤ یەکا چاخێ کو دی،
گۆ–بەسە خوونێ بکن لێیی.
بەکسەمەتێ کورێ پادشێ،
دڤێ پادشا، ناێن یۆلێ،
تەمام نها دەڤخوون بوونە،
تەمام نها چەعڤخوون بوونە،
کی دکارە وان لەڤ بینە؟
هەڤرا دڤێن پەلەوانە.
پادشا ڕابوو، گۆ، بەکسەمەت،
شەرتەک ژی هێ ل سەر تە کەت،
ئەزێ سڤێ، سبەترێ،
ل مەیدانا ڤێ کۆشک–سەرێ،
تەیرا بەردم بەرب هەوێ،
چکا تەیرێ مە کیژانی،
وێ ئالت بکن تەیرێ دنێ.
هەرگێ تەیرێ منە سیمر
ل تەیرێ تە ئانینە ڤر،
جەلادێ من نیڤێ شەڤێ،
وێ سەرێ تە تێکنە بیرێ.
گۆ، پاک، پادشا، برا وا بە،
ڕێکە خێرێ هلبەت وێ هەبە.
سبەترێ تەیرێ پادشێ،
تەڤ قلۆز بوون ل ناڤ هەوێ،

بەکسەمەت ژی ل پشت دێری،
تەیر و تویا دا ئالیکی،
گۆ، ها تەیرنۆ، تەیرێ سیمر،
فیرا تەیرێ پادشێ بینن.

حەتا نیڤرۆ تەیرێ دژمن
خوونا هەڤدو پر درێژن،
یەکۆ-یەکۆ تەیرێ پادشێ
ژۆردا تێن خار سەر کێلەکێ.
پادشا ژ جی قلۆز دبە،
دڤێ،- ئاوا نابە، نابە،
شەرتەکی من هەلا مایە.

ڕۆژترا دن ل مەیدانێ،
بوو ڕنگینا دەف و زورنێ،
قیز و بووکا خوە خەملاند،
جماعەتێ تەڤ ل ور لەزاند،
کو جریدا چلیەک قیزا
بەر چەعڤێ خوە وان بدیتا.
و نشکێڤا بوو تۆز دوومان،
چل و یەک سیار مەیدانێ دا،
مینا بایێ و برووسکێ،
هەسپ ئاژۆتن بەرب دەشتێ.
وانا هەسپا، ئاژۆت، ئاژۆت،
وان دنهێرین تەڤ قیز و خۆرت،
چل و یەک سیار پر وەستیایی،
هاتن پێشییا پادشێ دانین.
پادشا ڕادبە و دبێژە:

ژ ڤان ڤیزاکییه هێژا؟
و بەکسەمەت ژمارت یەک-یەک،
چەپێ بیستەک، ڕاستێ بیستەک،
گۆ، ئان پادشا، ئەڤە هێژا،
ئەڤە گولا ناڤ هەڤالا.
پادشا گۆتە ل بەکسەمەت:
- گەلە شەرتێ من تە هەیە،
لێ شەرتێ من تە ڤەنابن.
سبەترێ کورێ پادشێ
هات سەکنی بەر کۆشک-سەرێ.
پادشا ڕابوو دلەکی ئێش،
ڤیزا خوە دا کورێ پادشێ.
و بەکسەمەت تەڤ وێ ڤیزێ،
ڕێکەت و چوو بەرب پیرێ.
وی گۆ، پیرێ، تو دایکا من،
ڕابە تەڤ مە بەرب مال هەرن.

و بەکسەمەت، ڤیزا پادشێ،
ڕێکەتن چوون تەڤ وێ پیرێ،
چوون گهیشتن وی خۆرتێ زیا،
کو مابوو ئەو ل سەرێ چیا.
وی خووشکا خوە دوورڤا کو دی،
لڤاڤێ خوە دەرکەت هێدی،
بوو خۆرتەکی بیستپێنج سالی،
شابوون کەتە ل هەر ئالی.
و بەکسەمەت وا گۆت: دەلال،
ئەڤە برێ تەیی حەلال،

ئەز ژی تەرا دڤم براک،
تو ژی مرا خووشکا حەلال.
خووشک و برا تەڤ بەکسەمەت،
تەڤ پیرەدێ ئەو چوون ڕەحەت،
شەهەرێ باڤێ بەکسەمەت.
چاهار گهیشت بووک و برا،
کو بەکسەمەت سلامەت هات.
شایی تەزە کەت چارنکال.
بووک و قیزا کر گالە-گال،
تەزە ور بوو دەعوات، شایی،
بوو دەعواتا چل برایی.

ڕێداکتۆر ک. چاچانی
شکلکێش ژ. ناراکێلیان
ڕێداکتۆرێ بەدەواتیێ ئان. گاسپاریان
ڕێداکتۆرێ تێخنیکیێ ڤ. گالستیان
کۆرێکتۆرا کۆنترۆل نێ. بەکۆیێڤا

# کلامێد جماعەتا کوردا

بەرەڤکر و هازرکر

خ. چ. مووورادۆڤ

نەشیرەتا دەولەتا ئەرمەنستانێ
یێرێڤان ١٩٦٣

## دەوسا پێشخەبەرێ

جماعەتا کوردایە قەدیمێ ناڤا تاریقا خوەیە پرقورنەدا فۆلکلۆرەکە دەولەمەندە پرژانر عەفراندیە. وەکە بەرەکە بێ سەرۆبنە چیرۆک، بەیت، مژوولی، مەسەلە و مەتەلۆکێد جماعەتا کوردا، ناڤا کێژانادا جیکی مەزنی لاییق دگرن کلامێ وێ.

من وەختێ خەباتا خوەیە ڕادیۆیێیە پارا کوردیدا ب حزکرنا دل گەلەک کلام ژ دەنگبێژا نڤیسینە و نها ئەڤ کلامێ کو تێنە نەشر کرنێ، گەلەک ژ وانا پێ ڕادیۆیێ تێن دایینێ و حەساب دبن چاوا فۆندا ڕادیۆکۆمیتێیە ڕێسپووبلیکا سۆڤێتییێیە سۆسیالیستییێیە ئەرمەنستانێ.

بەرهەڤۆک بەلایی سەر چار پارا دبە. پارا عەولن "کلامێ تەزە" نە، کێدەرێ جماعەتا عەفراندار کلام سەر لێنینێ مەزن، پارتیا کۆمموونیست و حوکوماتا سۆڤێتیێ عەفراندنە، ناڤا کێژانادا جماعەتا کوردا بۆنا عەمرێ خوەیی شایی بەختەوار ڕازیبوونا خوە ددە لێنینێ مەزن، پارتیا کۆمموونیست و حوکوماتا سۆڤێتیێ.

کلامێد مێرانیێ، کلامێد بەنگیتیێ و چەند کلامێد گۆڤەندێ پارێد باشقە-باشقەدا هاتنە جیوەر کرنێ.

خەلیل موورادۆڤ

## کلامێد تەزە

### لێنینێ مەزن

مەرڤێد سۆڤێتیێ تەمام برانە،
عەمرێ تەزەڕا ئەشقن و شانە،
لێنینێ مەزن تم بیرا وانە،
تم بیرا وانە.

نها عەمرێ خوە ئەم ناکن گازن،
عەدلایا دنێ حەموو دخازن،
چاوا قیز و خۆرت، ئوسا ژی مەزن،
ئوسا ژی مەزن.

ئەم ژ پارتیا خوە گەلەک ڕازینە،
قرارێ پارتایا یێ، مەڕا مزگینە،
خێر و خوەشییێ تم مەڕا تینە،
تم مەڕا تینە.

مەرڤێد سۆڤێتیێ تەمام برانە،
عەمرێ تەزەڕا ئەشقن و شانە،
لێنینێ مەزن تم بیرا وانە،
تم بیرا وانە.

## کۆلخۆزێ مه کانینه

مه ئانی، کۆلخۆز چێکرن،
لێ، لێ، لێ، لێ، لێ، لێ،
دەشت و زۆزان شێن کرن،
هەی جانێ، جانێ، جانێ.

دەشت و زۆزان شێن کرن،
لێ، لێ، لێ، لێ، لێ، لێ،
هەی جانێ، جانێ، جانێ.
دلکێ مه ژی شاکرن.
کیلەرێ مه تژینه،
لێ، لێ، لێ، لێ، لێ، لێ،
خەباتچییێ مه جندینه،
هەی جانێ، جانێ، جانێ.

ئەلەگەز تەمام کانینه،
لێ، لێ، لێ، لێ، لێ، لێ،
فێرمێ مه لێ دانینه،
هەی جانێ، جانێ، جانێ.

ئاشق کامل ساز دخینه،
لێ، لێ، لێ، لێ، لێ، لێ،
گلی-گۆتنا بیر تینه،
هەی جانێ، جانێ، جانێ.

## کۆلخۆزڤان

کاویٚ یار–یار، ڕندیٚ یار–یار،
کاویٚ یار–یار، ڕندیٚ یار–یار،
بسکا بادە مینا هەرجار،
بسکا بادە مینا هەرجار.

ئۆرتا گوندیٚ مە ب گۆلە،
فێزا گوندیٚ مە ب گۆلە،
کاوا من بوویە کۆمسەمۆلە،
ڕندا من بوویە کۆمسەمۆلە.

فێزا گوندیٚ مە زۆزانە،
بنیا گوندیٚ مە زۆزانە،
کاوا منە کۆلخۆزڤانە،
ڕندا منە کۆلخۆزڤانە.

ئۆرتا گوندیٚ مە ب بیرە،
فێزا مالا مە ب بیرە،
کاوا من بوویە بریگادیرە،
ڕندا من بوویە بریگادیرە.

دە هوون لێخن قەیدیٚ گیزمیٚ،
دە هوون لێخن قەیدیٚ گیزمیٚ.
ئەم چێدکن کۆموونیزمیٚ،
ئەم چێدکن کۆموونیزمیٚ.

## کلاما تەزە

هەی جان، هەی جان، هەی جانێ،
لاوکێ من چوو ڕەوانێ،
لاوکێ من چوو بخوونە،
کتێب دۆستێ وی بوونە.

هەی جان، هەی جان، هەی جانێ،
ژ شەهەرێ ڕەوانێ
لاوکێ منی چەعقشینە،
منڕا نەما دشینە.

هەی جان، هەی جان، هەی جانێ،
ل شەهەرێ ڕەوانێ،
حەزار جاهل دخوونن،
ناڤا واندا لاوکێ من.

هەی جان، هەی جان، هەی جانێ،
ژ شەهەرێ ڕەوانێ
ڕۆکێ خوەندی و زانە،
لاوکێ من بێ گوندێ مە.

هەی جان، هەی جان، هەی جانێ،
لاوکێ من چوو ڕەوانێ،
لاوکێ من چوو بخوونە،
کتێب دۆستێ وی بوونە.

## جان پێرێڤان

هەی-هەی، هەی-هەی، جان پێرێڤان،
تەعف و شەمال ل تە بوو مرجان،
ڕوح و کەمال وەڕا قوربان،
هەی-هەی، هەی جان پێرێڤان.

گول و سۆسن، ڕەزێ تری،
چارنکالێ تە نتری،
نۆلی بووکێ مە خەملی،
بوویی کان-مکان پێرێڤان.

شانەشینێ بلند و بەر
چێکرنە تەڤ ژ مەرمەر،
هەواس و حوبا من ل سەر،
دەلال و تەلییان، پێرێڤان.

ب تە عەمرێ من زەعف گەشە،
نۆلی گول، سۆسن، بنەڤشە،
سەیرا ل تە چقاس خوەشە،
تەڕا ئەز حەیران، پێرێڤان.

ئەز ژی کورەکی کۆچەرا،
بەنگی مە تە و ڤان سەرا،
عەمرێ فرە نۆلی بەرێ،
تو منڕا گولان، پێرێڤان.

## چ سبەکە ئەشقە-خوەشە

چ سبەکە ئەشقە، خوەشە،
چ ڕۆژەکە ناڤ-نیشانە،
گوند و باژار تەڤی نەخشە،
ڕۆژا عەیدا ئۆکتیابرێیە.

ئیرۆ ڕۆژا عەیدا مەیە،
عەیدا پالا و گوندیایە،
عەیدا شایێ و ئەشقێیە،
هەرگاڤ خوەش بی تو عەیدا مە.

ئیرۆ عەیدە ڕۆژا شایێ،
عەیدا وەتەن-جماعەتێ،
عەیدا خوەشیێ و ئازایێ،
یا چێکرنا کۆموونیزمێ.
هەی هەڤالنۆ بمبارەک بە،
بمبارەک بە و پیرۆز بە،
عەیدا ڕەنگین ئۆکتیابرێ،
عەیدا شایێ و ئازایێ.

## کلامێد مێرانییێ

### بەندێ دەورێشێ عەڤدی

ڕێکا ڕحایێ ڕێکە پەعنە،
ژێ دکشە تەلپەکە گرانە،
من ترێ دووخانا کەرێ میانە،
یان بازرگانێ دەڤانە،
من نزانبوو جەردا میرێ عەرەبانە.
دەرێ کۆنێ عەرەبی لەڤ جڤیانە،
برە جاهلێ مە ڕابوونە،
ددنە خوە گەفان-گورانە،
ئەزێ چەعڤێ خوە دگەرینم،
چما دەورێشێ عەڤدی نە ناڤدا نە.
گەلی ئەسکەرێ میرێ عەرەبا، بێبەختی نە پێشێ مێرانە،
ئانجاخ بابەتە دەورێشێ عەڤدی مێرا بکوژە،
قەنترما بینە ژ ئەسکەرێ میرێ عەرەبێ فەرحانە.
دەورێشێ، قوربا، دلێ من دبێژە،
گەلی میرێ عەرەبا، ئەگەر هوون پرسا دەورێشێ عەڤدی ژ من دکن.
دەورێشێ منی تەکی تەنێ ناڤا شەرە.
قرار-قەسەمێ خوەدێ بە،
حەتا ئەزێ ساخم، ڕێ هەواتا دنێ مە،
پاشی دەورێشێ عەڤدی برا من تۆبە بە گۆشتێ پەزێ
نێرە.
دەلالێ، وا دلکۆ،

زەعفاق، وا بچووکۆ، مال تەنکۆ،

خودانێ ڕما دۆنزدە مۆڤکۆ،

خودانێ شەشخانا کنکۆ،

بال جینارا–نە تو یۆ، نە تشتکۆ،

بال من عەڤدالا خودێ مینا حەڤکە حنارەک، حنارێ ڕحایێ،

لێ بیرایێ، ل بەسرایێ، ل حەمکێ، ل حەمایێ،

قەترباشی بێن خوەڕا ڤێ حنارێ بکرن،

خورێ کالان، پیران، بێ دەندکۆ.

***

دەلال قوربا، حەیامێ بهارێ، وەختێ دەرکەتنێ،

وەرێ مە کەم بوونە، کێچ کەتنێ.

پیرەدێنگا منە بەر مرنێ،

کالەباڤێ منی بەر شووشتنێ،

هەر حەڤت برێ منە بەر گرتنێ،

کاڤا چەعڤێ من چەعڤێ دەورێشێ عەڤدی دکەڤە،

من ترێ شینا مالا باڤێ من دەرەوە،

حەموو ساخن، ڕوو هەواتا دنێ.

***

ئەزە نە کیکی مە، نە ملی مە،

ڤیزا زۆر تەمر پاشانگێ ملی مە،

برازیا عەلی پاشایێ زەنگوو زێری مە،

خودانا کۆنێ دۆنزدە ستوونی مە،

وەکی منێ زۆر تەمر پاشایێ ملێ فەنێ نەکرا،

دەنگەکێ منێ کورمانجی بڤیراندا،

یەکی ژی عەرەبی بلیلاندا،

سەڤ خاترێ دەورێشێ عەڤدی دەلالێ مالێیە.

***

زولما تێدانن نەدیتییە تو کەس،

گەرمایا تەعقێ ئەم مانە تما،

بال مە مقیم تەعری–تەعریستانە،

قەت ناکەڤمە سێری، گەلۆ چما؟

وا کەوشەنێ مەی ور قەت شێن نابن،

تو نزانی ئەم چ حالی دا نە،

ور لنگێ مە ناڤا قەیدێیە،

دەستێ مە ناڤا لەلێیە،

خوەیێ مە تونە، لۆ قەت کێ کێیە...؟

بەرخوە کەتم، ڕێ، مەجال نەدی،

ڤاسەکێ فکریم، دل من تژی بوو،

من گۆت: "نە تە دلێ من سۆت، گدی،

ئاخر دنییاکێ چووم دنیاکە دن...

تو ڕند بزانبە، نەخوەندییێ برا،

ئازایی خوە خوە نەهاتییە ڤرا،

ئەو هاتییە بال مە ب خوونا مەرییا؛

نائێ بیرا تە، برێ نەخوەمدی،

ئەو زەلوولی، چ کو مە هەڤ ڕا دی؟

مە زارۆتی تەڤی هەڤ دەربازکر،

لێ من ژ وی عەمرێ خوە چ فەمکر؟

هەواریا مە بوو، ئەم دفەتسێن،

بۆنا پەری نان مە دوا دکر،

گەلۆ حالێ مە قەت کێ دپرسی،

تەڤی تە بەلەنگاز بووم بێهەساب،

ئەز کو دنەلییام تو بوویی سەبەب...

نایێ بیرا تە ئەز دبەعجیم،

بۆنا من خوون و قنێت بوو هەر جی،

ئەز چ بووم، ئەز کی بووم؟ بێخوەیی، سێفیل،

بال وە ئەز ببووم یەکی لاپ هێسیر،

وی حالی دا ئالیکی دکولییام،

ئالیکی دلبرین ها دکالییام".

نەخوەندیتییا من ب حسرەتەکە کوور

وا بەژن و بالا من دنهێری،

حالێ خوە ڤا هم نێزیک... هم دوور،

تو گلی نەگۆت، ما کەلۆگری...

لێ هێدی-هێدی هێرسا وی ڕابوو،

ئەز کەتمە سێری دەعوا وی چ بوو،

ئاها چاوا کڤش ببوو نشکێ ڤا،

ئوسا ژی ئوندا بوو ل بەر چەعڤا.

کاڤا ئەز هشییار بووم ڕابوومە پییا،

دیت چییایێ ئێگرداخێ یە سەربەلەک،

دەشتا ئاراراتێ باخێ خوە ڤا

چییایێ ئەلەگەزێ دکەنییا،

ماشینا مە ژی چاوا کۆمباینەک

کەتبوو ناڤا وێ دەشت و دووزێ،

هەوێ دا دوو دکر خەلەق-خەلەق،

کەوشەن، باخ و باخچە، ڕێ و زەڤی،

مەقەس دکر، داڤێت کێلەک-کێلەک،

دەنگ ددا تەڤا، دکرە گازی،

وا دلێ حەزار مەرییا بارکری

ئەو چاوا بەسبر پێش دا دبەزی.

ڕاستی ژی مۆسکڤا حوب و ئاگرە،

حوبا پێ گرتی قەت ناتەمرە.

## ئەز حەيرانا چەعفێد وە مە

(شەرکارێد کوردێ ئیراقێرا)

هەی هوون کوردێ باڤ و برا،
دێ و خووشکێ مە یە ورا،
ئەز حەيرانا چەعفێ وە مە،
دەنگێ وە تێ حەتا ڤرا،
ڕوحێ خوە ڤا تەڤی وە مە.
بەعسا خوەستن، عەگیتییا وە
دنییا تەمام تەماشەیە،
شەرکارییا وە ڕاستە، هەقی،
د ناڤ مالا، مالێد عەڤدا
بێی شەر و دەعو، ب تاریقی
قولچەک دخاست ئێرا خوە دا.
دیوانا وە خایین دەرکەت،
هوون خاپاندن مینا هەرجار،
نەخوەست هوون بڤن بێمنەت،
بۆ وە نین بە گول و بهار.
ئەوە مەعنە، ئاوا ئیرۆ
بوونە یەک-یەک خانچێنگزێرین،
تێلی حەمزە، قەرەتاژدین.
بۆنا حەقییێ کێنلوو، حەیفدار،
سەکنینە پێشییا دژمن،
دحەژینن چیا و زنار.
قەی خووت هوونن لاوێ "دمدم"،
ڕابوونە بۆی ڕۆژا مەزن،
کەتنە پەی ڕەڤا دژمن،

کو ڕانەڤن ئەو جارکە دن.

قەی بۆنا شەرێ وە یی مەزن،

ئاها بووکا خانچەنگزێرین،

کو ژ دمدم¨ حەملە ڕەڤی

ئانییە کورێ توونجکزێرین،

حەزار دۆتێ خەزال، کووڤی،

مەزنکرییە ب حەیفداری،

کریە یەک-یەک پلنگ و شێر،

بەری دایە مەیدانا شێر.

هەی هوون کوردێ باڤ و برا،

ئەز حەیرانا چەعڤێ وە مە،

وە ڕاکرییە کەلا دلا.

هوون شەر دکن بەرک و باوار،

دقەتینن قەید و چیدار.

بلا ژ دمربێ وە یە هەقی

نەیار تەمام پێبحەسن

حسرەتا وە یە تاریڤی

کو بوویە ئاگر و ئالاڤ،

ڕوحێ وە دا ناتەمرن،

ژ تربا خوە بلا ڕابن

کال و باڤێ مە یە "دلسار"،

لاوێ خوە ڤا ئەو پر شابن.

ئەز حەیرانا چەعڤێ وە مە،

ڕوحێ خوە ڤا تەڤی وە مە...

س ١٩٦٣

***

من دخوەست بدیتا هژمەتکاریيا تەبییەتێ،
ژ کیژانی خەمل و بەدەوەتی دەرتێ.

گەلەکی چەتن گهیشتم بلندایا چییێ،
من ور دیت گەلەک خەملێ ڕند، هژمەتکار و چێ.

ور کولیلک بێحەساب هەبوون، نازک و ڕونگ-رەنگ،
حەتا من چەند کولیل چنی-وەعدە بوو دەرەنگ.

نزانم چاوا لنگێ من کەڤرەکی کەت،
ژ وێ ئێشێ ئاخینەک ژ دلێ من دەرکەت.

ل سەر قەواتا خوە مینا هەرجار پر باوار
نێزیکی کەڤر بووم و خوەست ئەو هڵکرا خار...

هێسیرێ جهالییێ بووم، وی کەڤری ڕا شەرکر،
تەنێ بووم، چقاس قەواتا من هەبوو، خەرج کر...

قەومی، نشکێ ڤا شمتیم ل وێ دەرێ
و دەوسا وی کەڤری ئەز تێل بوومە ژێرێ.

گاڤا سەر حشێ خوە دا هاتم، نهێری ژۆر،
تەخمین کر: کەڤرەک نینبوو ئوسا مابوو تەک،

ئەو سەرێ زنارا بوون ل وان دەرا دۆر،
ناڤ خوەلییێ دا ڤەشارتی، هیم ڤا گەلە بەرک.

گەلە وەدە دەرباز بوون مینا بازرگانا
و قەومی ئەز دیسا چوومە جییێ زنارا.
ستانسییا ئێلێکتریکیێ من ل ور دیت ئیجار،

ور تونەبوو نە کەڤر، نە ژی زنار...

## هەی کۆنێ ڕەش

هەی هوون کۆنێ ڕەش، کۆنێ ڕەش،

وەعدەک هەبوو بەختێ مە ژی

مینانی وە ڕەش بوو، ڕەش،

فرقی هندک بوو ئۆرتا مە،

هوون گرێدایی بوون شریت و ستوونا

بەختێ مە ژی مینا وە

ئاڤێتبوونە کەلەمچا.

ئازایێ ئەو حالێ مە دیت،

وێ ڕاکر با و بۆبەلیسک،

لێ دا، قەتاند، هوور و خاشکر

ل سەر هەڤ سنگ، ستوون و شریت،

ژ مە ڕەڤاند قەید و چیدار.

تێن دەرباز دبن پر بهار،

لێ ئەز ئیدی وە ناڤینم.

هەی، کۆنێ ڕەش، کۆنێ ڕەش،

وەعدەک هەبوو بەختێ مە ژی

مینانی وە ڕەش بوو، ڕەش،

چ قومسیتیبیا وێ هێنێ بوو،

بۆبەلیسکێ منا کر، چوو.

## کلامێ دلێ من

من ترێ هێ دەنگێ دلێ من تێ،

چمکی ئەوی ڕند زانبوو خەیسەتێ

مژ و دوومانێ، سورا تەبیعەتێ.

کلامێ دلێ من پرجووره بوون،
سەودەسەر بوویی درەڤییان، دچوون
رۆمێ جینارایە نێزیک و دوور،
ل سەر ڕێنگا دلا دگەرییان،
پێش دا دانین حسرەت و خەمێ کوور؛
ئەگەر جیکی دا خوە شاشکرانا،
بن سییا کولیلکێ نازک دتەلییان،
نقۆ دبوون ناڤ ئاڤا کانییا،
دبوو نازکایا دەنگێ خۆرت، قیزا،
تەڤی دەنگێ وانا چاوا گولاڤ
ئەو دبرن بەرب مرازا،
ل وان ژۆر دا دانین دل و هناڤ،
لێ نها بوویە یەکی مالوێران،
ناسترێ ئیدی کلامێ بەرێ،
وا تەمام بیر کرییە دەشت و زۆزان،
قەت تەڤی کلاما ناچە گەرێ.
دلێ من خەییدییە، نزام چما،
ژ دەنگ، مقامی مامە تما،
تەمزایا تەبیعەتێ ڕوحێ من دا
ئەو من دشەوتینە بێ ئاگر،
دل خوە ڤەشارتییە ب گەلە پەردا،
ور دکە خوششین منا پێلێ گور.
من ترێ هێ دەنگێ دلێ من تێ،
چمکی زانبوو سورا تەبیعەتێ...
ژ من ڕەڤییا ئەو دەنگێ حژمەتکار،
ل بال جاهلا، - ئەز یەکی ئەختییار.

بەدەوییا تەبیەتێ ڕوحێ من دا
ژ دەنگ-مقامێ خوە مامە تما...

***

ژ دیا خوە هاتمە دنێ ل سەرێ چیێ،
پاشلا تەبیەتێ دا، نافا خاسباخچێ وێ؛
کولیلک، هێشنایی من ڕا بوونە بەرپال،
بەرخ و کارێ نەعس من ڕا بوونە هەڤال؛
ویتە-ویتا دەنگێ تەیر و تەیرادا،
خولە-خولا دەنگێ جەوا و کانییا.
تەڤ بوونە حوب، دلێ من دا پەرڤەدان،
چووکتیێ دا وانا تەڤا دلێ من سۆت،
شنگینیا با بێشینگا من هەژاند
و مینانی دیا من "لووری-لووری" دگۆت،
ڕۆیێ ژی ژۆر دا بەژن-بالا من پیڤا،
ب ڕەحمداری شەوقا خوە ل من ڕەشاند...
ژ دیا خوە هاتم دنێ ل سەرێ چیێ،
پاشلا تەبیەتێ دا، نافا خاسباخچێ وێ.

***

شڤانتیا خوە دا
نافێ یارا خوە
من ل بەرخێ کر،
من حەمبێز دکر
ئەو بەرخا ساڤا
و من ڕادمووسا
ئۆرتا هەردو چەعڤا.

وێ بەرخا خشیم
سەرێ خوە هلددا،
ل من دنهێری
مینانی مەرییا،
زمانێ خوە وێ
سوورتێ من ددا،
من ترێ یا منە
یار و تەڤ دنییا.

***

جارەکێ یەکی
مەرییێ کۆر پرسی:
ب تەخمینا تە
چ تەڤایە رۆ،
کو شەوق-شەمالێ
ئەو ددە دنێ؟
ئێ کۆر فکری،
ب زەلوولی گۆت:
– ئەز ئێ چ بێژم
دەرهەقا رۆیێ،
گاڤا نەدیتییە
بەژن و بالا وێ...

***

شەڤێ پاییزێ
و زڤستانێ
گەلەک درێژ بوون،

مینا دەردێ مە
خلاس نەدبوون
ئەو شەڤ و كۆخكێ
مە یی بووزخانە
ڤكە و ڤالا
ل مە ببوون لاپ
خەتا و بەلا.

***

من زانبوو بەلەكییا
چییایێ مە یی چارسالە
ج چاخ تەمام دحەلییا؛
كاڤا ئەز خۆرت بووم ئیدی،
مەعنا حەلێ بەر چەعڤ دی،
بۆنا ڤیزا گوندییێ مە
ئەز ژی حەلییام جی ب جی،
مینا بەرفا چارسالە.

***

چاوا ژ كولەكا مە
دوویێ زراڤ دكشیا دچوو
هەوێ دا ئوندا دبوو،
ڕۆژەكێ ژی ئەز ب خوە
ژ مالێ دەركەتم، چووم،
تەڤی خەلقێ نەناس بووم...

***

گەلۆ خەزالا من کێ خاپاند،
پێ خاس و قوماشا کێ خەملاند؟
مینا دەنگێ من گازی وێ کر،
و ژ چیپایێد مە بەرژێرکر...

***

ئاخ چیا و بانی،
کولیلک و کانی،
هەر وە حەمێزکم،
ناخوەزم ناسکم
تو جنەتا دن،
هوونن خەونا من.

***

ناڤا ستەیرێ ڕوو عەزمین
دگەرییام ئەز ستەیرا خوە،
چەعڤێ خوە کر چاپ، مەزن،
لێ من نەدیت ستەیرا خوە.

***

(ب مۆتیڤێ جماعەتێ)
کەلەش لاوکێ من ڕازا یە، هشییار نابە،
مەسا پێکم، هێدی هەرم کو ڕانەبە،
هەرم کێلەکێ ڕوونێم، لێ تێکم سی،
کو ئەنییا کەڤەر بەر تەعڤێ قەمەر نەبە؛

وەختا كۆما خومیی-خودانا ئەز دیتم،
هلبەت یەكی خێرخازێ ناڤ دا هەبە،
وێ بێژە حوبا دلە، لۆمە نابە.

***

پرسین:- شاییر، ناڤا
ئاوقاس دەردێ كوردا،
لێ چاوا قەومیە
قایشا پشتا تە
تەزە مایە جی دا؟
گۆت: - باوەركن، حەیران،
من ئەڤ قایشا هان
چەند رۆژە گرێدایە،
لە... گومان هێ هەیە.

***

پرسین: - شاییر، ئەگەر
كوردستانا تە هەبە

تێ وی چاخی خومیكی،
چ خەباتێ بكی؟

گۆت: - وەی، ئەو چ خەبەر،
سینگێ خوە بدمە بەر.

***

پرسین: - شاییر، نە تو دچی،
- گەلۆ تە پەی خوە چ هشتیە؟

گۆت:

پەی خوە هشتیە باقێ گولا،

پێشکێس کرییە ب دلحەلال،

ئەو یێ مقیم شین بن هەر سال،

بخەملینن حوبا دلا،

وێ دەرباز بن سال و زەمان

و وێ بێژن: - تەمییێ تە مان.

***

ئەو شکەوتێد مەیە

کوور و تاری،

کو خۆفا گران

لێ دکشاند مەری،

چاوا گوندێ

بێ بنەلی،

ڤک و ڤالا،

ڤەی بووبوون مەرییێ

نەپاک، دەڤبەلا،

خەبەردانا من

دوەکلاندن،

دەر و جینار

پێ دهەساندن.

## کالێ ئاقلبەند

## (یا جماعەتێ)

پادشەکی زولکار هەبوو،

خەوا شەڤێ ژێ ڕەڤی بوو،

نۆتلا مەریکی سەودەسەر–دین
بووبوو مۆتاجێ خەوا شیرین.
ئەو بووبوو یەکی لاپ بێ عیلاج،
بەر چەعف نەدهات پادشاتی و تاج.
وەزیر، وەکیلا هەر تشت کرن،
چقا حەکیم بوون تۆپ کرن،
ڕوونشتن، فکرین وێ نێتێ،
چاوا بکن خەوا پادشێ بێ.
و پاشێ خەو لێ فری
مەجالەکە وا فکری:
– چیرۆک چەرمزن، کو مەری ببهێ
دبە عاجزە، دبە کو ڕازێ.
عەمر کر گازی چیرۆکبێژا کن؛
چیرۆک گەرە ئوسا بێ گۆتنێ
حەفت شەڤا نەبێ ختم کرنێ،
کێ خوە بەگەمە پێش دا بێ،
دو قرارن وێ ئۆرتێ:
یان کیسە زێر وێ بستینە،
یان ڕوحستین وێ ببینە.
گازی گەلەک چیرۆکبێژا کرن،
ژ وانا هەر یەک کەمالەک لێ بوو،
لێ چیرۆکێ گۆت کوتا دبوون زوو.
تو چیرۆکبێژا حەفت شەڤا
نکاربوو چیرۆک درێژکرا.
پادشا هێرس دبوو، بەری ددایێ،
سەری لێ دەرنەدخست، دهات ڕایێ.

شەڤ دەرباز دبن، بەرێ ئێڤارێ،
گوندیکی دنێدی، ڕوودان درێژ،
تێ و خوە ڕا ڕوودنێ دەرێ
کۆچکا پادشێ چاوا چیرۆکبێژ؛
پێ دحەسن، وی دبنە ژۆرێ،
کالێ بەر تەختێ پادشێ ڕوودنێ
و پاشە گوندییێ ئاقل، کەمال،
تەقلگلی، ب دەنگەکی زەلال،
ئاها ئەو پادشێ خوە ڕا دبێژە:
"من چیرۆکا دا پر عەجێب بهیستییە،
لێ خەملێ کۆچکا تە، پادشە خوەش بە
هێ تو چیرۆکەکێ دا نەبهیستییە.
پادشا ساخ بە، ئەگەر ئیزنا تە هەبە،
کێماسییا کۆچکا تە ژ من بپرسی،
ئەزێ پادشێ ڕا بێژم ئەو کێماسی..."
پادشا کالێ و مەرییا نهێری،
کەنیا، چ جاب بدە وی گوندییی؟
کالێ ب خوە ژی جوورەکی شیرن
کەنیا، پادشێ ڕا گۆت: - "پادشا ساخ بە،
هەر تشتەک تە ڕا مایە کێماسی
ژ کیژانی هەلا تو نە ناسی،
ئیزنێ بدە بێژم، پێ بحەسی..."
پادشا دیسا کەنیا، ئیزنا وی دا
و ب ڤی جوورەیی کالێ دنێدی،
دەست ب چیرۆکا خوە دکە هێدی.
"سال و زەمانێ خوەدێ درێژن،

پادشا خوەش بە، پادشێ خوە ڕا بێژم،
وا هەبوو، تونەبوو، پادشاک هەبوو،
ئەو جامێر ژی ناڤێ خوە ڤا چوو.
هێ پەسنێ وی ددن ب جماعەتی
چاوا پادشاکی زۆر و کێرهاتی.
لێ حەزارحەیف سورا قەواتا وی
حەتا نها مایە نە عەیانکری.
چ فەیدە، وەکی وێ سورێ زانم،
گۆتی پادشێ مینا تە بزانبن،
تەنێ کێری تە تێ سورا ئوسا،
عەینی چاوا ئاڤە بۆنا مەعسییا.
مەرییێ عەمر ڤا ژ من مەزنتر،
خوەدێ یەکۆ-یەک ڕوحێ وانا بر،
وا ژ وان مەرییا ئەز تەنێ مامە،
سورا پادشە هەر ڕوحێ من دا نە.
ئەو سور و چیرۆک تەنێ لاییقی
پادشێ مینانی تەیە، ئێ هەقی.
چیرۆکەکە درێژە، لێ دەلال،
ئەو تاسە ئاڤە پر زەلال.
ئەگەر سەرێ پادشێ نەئێشینم،
ئیزنێ بدە ئەز تە ڕا بێژم..."
ژ خەبەردان و کەمالا کالێ
پادشا ڕابوو، گەرییا ناڤا مالێ،
دەستێ خوە دانی پش خوە چوو و هات،
سەکنی گۆت: - گلییێ تە خوەشی من هات،
ئەگەر چیرۆکا تە ژی ئوسا بە،

پێشکێشا بدمە تە حەلالە..."

کالێ پەیهاتییا چیرۆکێ دکە:

"ئاڤێ وی پادشایی عەڤدلە یە،

ئەفەندییێ خوە ڕا بێژم ڕۆژەکێ

پادشاک ژێ ڕا کاخازێ دشینە.

کاخازێ دا دنڤیسە-هەرکێ

ژ فلان جییی پێرا خوە نەدی

ئەزێ ب شەر ژ تە بستینم وی جییی.

عەڤدلە پادشا گەلە هێرس دبە،

زوو ئەسکەرێ خوە تەمام تۆپ دکە،

وەکی پێشییا وی پادشایی شەرکە.

لێ خوە ڕا ژی چەند سۆمەر

گەنمێ کرک دبە چەعل دکە،

بێمەعنە، چەند قولکا دهێلە،

وەکی چەعلێ دا هەوا بلیزە،

کو گەنم تێ دا نەرزە.

پادشێ را بێژم، بلا عەڤدلە

پادشا بەرب دژمن بلەزینە،

وان ئالتکن، شابن، بگرن گۆڤەندی،

لێ ئەم هەڤ ڕا هەرنە ئالییێ چەعلێ،

ل کو سورا عەڤدلەیە بنیێ...

پادشێ خوە ڕا بێژم ئاوا چڤیک

پێ دحەسن، قولکێ ڕا دادکەڤن،

گەنمێ چەعلێ خوە ڕا تێر دوخون،

چەند حەبا ژی پێ نوکولێ خوە دەردخن،

دەرتێن، دفرن دچن بال جووجووکێ خوە.

ده، چڤیکن، زەعف تالاشا وانه،
مقیم ناڤا هەوا تەمز دا نن.
کو برچی دبن، دکەڤنه چەعلێ،
هەمی یەکسەر تێر دوخون وێ دمرێ،
چەند حەبا ژی جووجووکێ خوه ڕا هلددن،
ب دۆر، یەکۆ-یەک ژ چەعلێ دمرتێن،
دفرن دچنه بال جووجووکێ خوه...
گوهدارا ڕا بێژم، نه چڤیک ژی
دنیایێ دا ب عەمرێ خوەدێ دژین،
کو ئوسا بێخەم بن و بێمنەت.
ئەرێ، پادشێ خوه یی عەزیز ڕا بێژم،
وا چڤیک دچن ناڤا خاسباخچا،
ل زۆزانا، ناڤا مێرگ-چیمانا،
خوەرا سەیرامیش دبن وان دەرا،
گاڤا پاش دا تێن و برچی دبن،
پەی هەڤدو دادکەڤنه ناڤا چەعلێ،
چڤاس کێفا وانا تێ تێر دوخون.
و پاشی تێربوونێ ژ وانا هەر یەک
چەند حەب بۆنا جووجکێ خوه ئەو دێمەک
هلددن، پەی هەڤ دمرتێن یەک ب یەک..."
بۆنا وەکلاندنا چیرۆکێ
پادشا ئیدی تاپ ناکه، ژێ دپرسه:
– لێ سورا عەڤدله پادشا ل کو ما؟
چیرۆکبێژ ڕحەت جابا وی ددە:
– باڤێ مە، سەبرکە، ئەز ب قوربا،
لازمه ئەز چیرۆکێ تەمامکم،

پاشێ وێ سورێ تە ڕا عەیانکم...
- باش، چقاس هێ مایە، تو بیرنەکە،
سبێ ئێڤارێ وەرە تەمامکە...
چیرۆبێژێ کال ئێڤارا دنێ
ب ئیزن تێ، جیێ خوە دا ڕوودنێ،
ئارخاین دەست ب چیرۆکێ دکە:
- پادشا خوەش بە، پادشایێ خوە ڕا بێژم
گاڤا سبا خوەدێ سافی دبە
و ل سەر دنیایێ شەوق ڤەددە،
ئیدی چڤیک قەت وێ بێنە زەڤتێ؟
دفرن تێن دکەڤنە ناڤا چەعلێ،
تێر دوخون، چقاس کێفا وان تێ.
پاشێ هەر یەک وا چەند حەبێ گەنم
پێ نوکولا هلددن و یەکۆ-یەک
بێمەعنە وێ قولکێ ڕا دەرتێن
و دچنە بال جووجووکێ خوە دێمەک...
پادشا دبێژە: - تە ئەو دەر گۆتییە،
هەرچێ مایە، پەیهاتنێ بێژە.
کالێ دبێژە:
ئەز قوربا، ئەز زانم من گۆتییە،
لێ چیرۆک چەتن و درێژە."
پادشا دبێ: - لێ گۆتنا تە چییە؟
- گۆتنا من تو زانی، پادشا ساخ بە،
ئیزنێ بدە حەتا کوتا دبە.
پادشا ساخ بە، دلێ خوە فرمکە،
ئەزێ بمرم، بۆنا من یەکە.

- ده بێژه، لێ گلیيا نەوەكلینه،
ئەو وەكلاندن هێرسا من تينه.
كالێ دەست ب چيرۆكێ دكه:
- پادشێ خوەیی عەزیز ڕا بێژم
چڤیک دیسا د چنه خاسباخچا،
هلدكشن ل سەر چقلێ دارا،
كاڤا برچی دبن، دیسا ئەو تێن
یەكۆ-یەک ئەو دكەڤنه چەعلێ...
پادشا هێرس دبه سەر وەكیل، وەزیرا:
- ئەز نزانم، هوون كێری من چنه؟
ئەڤ ئەختیارێ هان وە كو ئانییه؟
ئەڤا دو شەڤە، سەرێ من برییه.
گشک ڕادبن، بەر وی دسەكنن،
تالاشا كالێ نینه، دبێژه:
- ئەڤ چیرۆكا من هەلا تو بەندا
بال پادشاكی مینا تە نە گۆتیه،
بۆنا وێ یەكێ وەعده لازمه،
ده، وەعدێ پادشێ مه تونه...
ئەگەر دكارن وێ سورێ دەرخن،
عەمركه بلا سەرێ من لێخن.
كالێ مینا من كی دەرێ دەستخی،
سورا عەڤدله ژ چەعلێ دەرخی؟
حەتا كوتاسییا چیرۆكێ ببهێ،
وێ گەله-گەله لازمی تە بێ.
پادشا دكەڤه ناڤا متالا
خەوا فری چیچكەک تێ بەر چەعڤا.

شەڤەک ژی دەرباز دبە و ئاها
کالێ دیسا تێ، کو دەست ب پەیڤاتییا
چیرۆکا خوە بکە، پادشا دبێژە:
- تو چیرۆکا خوە عەسە کوتاکە.
کەنەکی خوەش تێ سەر لێڤا کالێ،
دبێ:
- پادشا، ئەز قوربا، ئوسا نابە،
چەعلە تژییە، گەرە ڤالابە،
هەما وێدا نە سورا عەڤدلە.
پادشا خوەش بە، سەری ژی ئەوە خووت،
ڤرا لازمە گەلە زانەبوون،
لێ نە جەبرخانە، تۆپ و کرکووت.
- گۆتنا تە چییە؟ پادشا دبێژە.
- پادشا ساخ بە، دە، شەڤە درێژن،
ئیزنێ بدە چیرۆکا خوە بێژم.
پادشا ئیزنا وی ددە.
کالێ چیرۆکا خوە دەستپێ دکە،
دەرهەقا چڤیکا دومکلینە...
پادشا عاجز دبە، خەوا وی تێ،
خێلەک دبوهورە، جیدا ڕادزێ،
کالێ دچە کو پادشا ڕازێ.
ور شوون دا پادشا ئیدی ڕادزا،
ژ خۆڤا ڕازانێ لاپی ئازا،
ڕۆژەکێ ژی هەما نشکێ ڤا
عەڤدلە پادشا کەتە بیرا وی.
ڤەی ئەورێ گران دگرن دێمێ وی

و عەمر دکە زوو گازی کالێ کن.
پادشا جی دا دچە، تێ دپرسە:
- نە تە دگۆت، سورا چەعلێ چ بوو؟
- باڤێ مە، - کالێ گۆت،- سورا چەعلێ
ئەو خووت دەرمانێ ڕازانا تە بوو،
عەڤدلە چیرۆکبێژێ تەیی کال بوو...

## کەڤۆتک و قولنگ

قولنگ، پسمام، نە بهارە،
ل کەوشەنا، مێرگ، چیمانا،
گول و سۆسن ور دبارە.
جا بنهێر چ ڕۆژنە خوەشن،
هەموو دەرا کولیلک ڕەوشن،
هەڤالێ تە ل وان دەرا
ب ئەشق و شا ئەو دمەشن،
پەرواز ددن، دقیرینن،
نوکلێ خوە ڤا زلک-زلک،
قرش و قالا پەی هەڤ تینن،
هێلینا خوە دنترینن.
بهارا خوەش دنییا هنگاڤت،
مەری، ڕوحبەر، بوونە گیرۆ،
تەبیعەت بوویە دەف و دەوات،
من تو دیتی، گونێم تە هات.
بنهێرە، مالخرابێ،
دنیا ئازا یە، هەر خەمل لێ،
چرا ئوسا مایی تەک و تەنێ؟
چ کەسەرە دلێ تە دا،

دشەوتی تو ناڤ خوە دا؟

"ئیتماز دکم، کەڤۆتکا قەنج،

ژ من نەکە پرس و پرسییار...

بۆ من نینە، نە ڕۆ، نە پەنج،

هێلینا من ئانینە خار.

بوومە یەکە لاپ بێ عیلاج.

ئەز ئەو نینم چاوا هەرسال...

ب قەواتا خوە، ڤان باسکا

هێلین چێکر نەڤسا خوە ڕا.

بنی، کێلەک، نازک نەرم کر،

بووم ماشۆقێ حوبا خوە گوڕ.

جووجووکێ خوە من مەزن دکر،

کەتمە جێرگێ قەلفێ لاپ پڕ،

ب ئیسافی دەرباز دکر.

لێ... ڕۆژەکە نەبیرکری

مەریکی هات ئەو دار بری...

گەلەکی کر گازی، هەوار،

ئیدی نەبوو دەرمان و چار،

هەر بهارا هەڤالا ڤا

پەرواز ددن قەلفە-قەلفە،

تێنە ڤرا مینا سالا.

خەملێ دنێ ئەم دبینن:

جیکی بەرفە، جیکی شینە،

جیکی چییا نە، گەلی، مێشە،

جیکی بەرە، جیکی گۆلە،

چەم و کانی ور دکشە...

وێ بەدەوییێ تو فەم ناکی،
ئەگەر فەمکی، تێ چ بکی؟"
– باوارییا تە هەبە، خووشکێ،
ڕۆژێ ئازا پرقەنج وێ بێن،
دنیا ببە عەدلی، شێن،
دارێ تەزە ل ور شینبن،
هێلینێ سەر وێ زەعف بەرکبن،
دنیا ئالەم تەمام یەک بن،
بالتە، برەک وێ تونەبن.

## زوو وەرە بهار

جان، خووشکا بهار،
جان، خووشکا نازدار،
دە تو زوو وەرە،
وەرە سڤککە
خەما ڤی دلی،
دلێ بارگران،
دەستی دلێ خوە
بوومە مالوێران.
ئەز قوولەکم بەر،
قەت سەبر ناکە،
دگەرە یەکسەر
و یا خوە دکە.
جان، خووشکا بهار،
جان، خووشکا کوبار،
دە وەرە نەخشکە
مێشە و ڕۆزان،

دەشت، مێرگ و چیمان.
حەیران، زوو وەرە،
نووبارا هەرسال...
نە ئاخر دلە؟
دل تو ناڤە ئاف،
بوویە زارەکی
نەرحەت، تفال،
ناخوەزە هەرە
بال تو کەسەکی،
شەڤ و ڕۆژ دگری،
دکە زارە-زار؛
کەلا ڤی دلی
ئەز بوومە نەچار.
نە دلێ من ژی
ڤەی بوویە بهار،
حسرەت ڤا تژی،
ڕوحێ من وی خوار؛
زوو وەرە، شاکە
دلێد ئەڤیندار،
خەملا خوە لێکە،
خەما سڤککە،
بۆ دلێد ئەڤین
پەردا خوە گولین
تو تێکە تەعلدە.
ئاخ، خووشکا بهار،
کەلۆ تو زانی
بەنگی مە ئیسال؟

## چرا ئەو قەدرێ تە نزانە؟

گاڤا بەدەومکە مینا تە ل ڕووبارێ دنێ دا هەیە، مال و هەبوونا دنیێ دبە قرێژا دەستا.
لێ چرا ئەو قەدرێ تە نزانە؟

تو دحەرمینی خەوا خۆرت و مێرا، ئەوانا ژ مال و حالێ خوە کووڤی دبن.
من سی و شەش گولی ژمارتن لسەر ناملێ. گاڤا کتێ گولییێ تە دنهێرم، من ترێ
پەنجێ تەڤا زێڕین بن، شەوقا وان قەی داڤێژە قافێ زنارا.
لێ گاڤا من کۆتی-شندۆکێ مێرێ تە دنهێری، دفکریم: گەلۆ چرا ئەو قەدرێ تە نزانە؟
ژ حسرەتا تە عەگیت و مێرخاس ژی دبن قەی تاقەتکەتی، نکارن دلێ خوە دا ڕحەتییێ
ببینن.
گاڤا بەدەومکە مینا تە ل ڕووبارێ دنێ دا هەیە، مال و هەبوونا دنیێ دبە قرێژا دەستا.
لێ چرا ئەو قەدرێ تە نزانە؟

## کەوا خوە دگەرییا

بهارە باخچەنگێ دلێ خۆرت و قیزێد ئەڤین ژی ڤەبوون.
چیایێ ئەلەداغێ مینانی هەرسال خوە خەملاندبوو. مەرڤ حەیر-حژمەتکارێ چیێ بوو.
کۆچ دکشییان شبێتا حەزار بازرگانێد بارگران.
ڕۆژا سسییا زۆزانڤانێ وەستییایی دانین سەر کانیێ. زۆزانڤانێ ئێلەکە دن ژی د وان
نێزیکایا ڕحەت دبوون. خۆرت و قیزێ هەردو ئێلا چوونە جیێ بنداروکێ. ب عەدەتێ کال
و باڤا بنداروک خەملاندبوون. تلیێ هەڤ گرتن، کەتنە گۆڤەندێ...
دلێ خۆرتەکی ڤی ئێلێ کەتە کاوەکە وێ ئێلێ. گۆڤەندێ دا ب چەعڤا قرارا دلێ خوە
کرنە یەک.
چەند ڕۆژ دەرباز بوون، خۆرتێ بەنگی دەستی حەیرا شەواتا دلێ خوە کەتبوو ناڤا
سینۆرێ وێ ئێلێ. دزی ڤا کۆنێ باڤێ وێ کەوێ دپرسی، لێ کەسەکی تو سالخ نەددا.
ڕۆمەکێ دا لسەر کانیێ ئەو ڕاستی ژنکەکێ هات، ژ وێ پرسی. ژنکا نەناس گۆت: -
زۆزانێ گوندێ مە سسێ نە، هەر یەکی سێ بەلەکی لێ نە، برانگۆ، یانگا کۆنێ وێ
دپرسی، نزانم دانینە کیژان بەلەکییا.

– خووشکێ، دنیـایێ دا مـرن هـەقـە، کەفـەن فـەرزە، وەرە تـو برینا دلێ من تەزە نـەکـە، سالخەکێ بدە من.

– برانگۆ، ئـەز نکارم سـالخـیـیـا وێ تە ڕا بدم. گەلەکا ژ بۆنا چەعف و بوریـیێ وێ کەوا گۆزەل ژنێ خوە بەردانە...

خۆرت گەلە بەرخـوە کەت، هـەر گۆت: – وەی خووشکێ، دە بـرا جێرێ سـەر ملێ بکەڤـە بشکێ و تو بێی ئاڤ بدی سەر ڕێ. سەرێ خوە کرە بەر خوە، چوو کەوا خوە بگەرە.

بهـار بوو، گول، سۆسـن، کانی و نـەوال تەبیعـەتێ ڕا دکەنیـیـان. خۆرتـەکی سمێلقـەیتـان کۆنێ مـالا باڤێ کەوا خوە دپرسی.

## خۆرتێ نەخوەش

خۆرتەکی دەلال دەستی دەردێ دل نەخوەش کەت، ناڤا جی–نڤینا دا کوور دنالیا.

بەژنا بەدەوا وی ئوسا بوو، تە یێ بگۆتا دارێ لەیلانە.

چەعف–بوریـیێ وێ ئوسا ڕەش بوون، قەی بێژی شەڤەرەشا بەختێ وانا بوو.

گولییێ وێ ئوسا درێژ بوون، مەری ترێ زۆزانڤانا شریتێ کۆنێ خوە ژێ بریبوون.

خـۆرتـێ نەخـوەش ژی کـەربا دل بەر خـوە دا خـەبەردا. نەفـەرێ مـالـێ بەر دلێ وی دا دهـاتن، لێ ئەوی دگـۆت: – هـوون نزانـن، ئەز زانم... ڕەشـایا چـەعـڤێ وێ نە ژ کلدانێ یە، پشتا وێ زراڤە، نە ژ گرێدانێ یە.

دیا وی فەقیر بۆنا بەرخێ خوە خوە دا دشەوتی...

خۆرت هیڤی کر، گۆت: – دێ و باڤێ وێ ڕا بێژن، قە نا بلا بهێلن بەری مرنا من بێ ئەز بڤینم...

دێ و باڤێ ئیزنا وێ نەدابوون. وەختا نەخوەش ئەڤ یەک تەخمین کر، گۆت:

– ئاخ، خوەزلا ڕۆژا مرنا من، لێ نە ڕۆژا ڤێ برینا دلێ من...

نەخـوەش ڤـەجێنقی و ب دەنگەکی نمز تەواقـە کـر: – قـەت نا، بێژنێ، بلا گـولیکە خـوە ل سـەر سینگێ چیایێ ئەلەداغێ بۆنا من ڤەکرە، دەوسا کەڤرێ سەلیما من.

بلا بۆنا من ژ چەعڤێد بەدەو هێسرا نەبارینە، ئەز ڤێمیشی چەعڤێد وێ نابم...

خۆرتەکی دەلال دەستی دەردێ دل نەخوەش کەت، ناڤا جی–نڤینا دا کوور دنالیا.

## ئەز و گەورا من

ڕۆژەکێ، بەری ئێڤارێ، ئەز و گەورا خوە جارا ئەولن، مە تەهەرمکی خوە ڕا مەجال دیت، خەوله بوون و کەتنه ناڤ مژوولییا شرن...

عەور هێدی-هێدی جڤیانه هەڤدو، سەر مە دا گرتن. لێ ئەم ژ هەڤدو تێر نەدبوون.

گەورێ من پرسی: ئەو چ عەورنه گرانن؟ ئەورا کۆم-کۆم کرنه گورین، ئەوێ وەکلاند: – ئەڤ چ ئەورنه گرانن؟

من قەی دەنگێ عەورا نەدبهیست، کەتبووم پەی حسرەتا خوە یە چەندک-چەند سالا. دەوسا جابا پرسێ من ڕامووسانەک ژێ کەرەم کر.

باران باری، مە خوە دا بەر تەعلدەکی و دیسا کەتنه ناڤا مژوولییا شیرن. ئەوێ پرسی:
– ئەو چ عەورنه گران بوون؟

من گۆتێ: – دینێ، ئەو عەورا شەعدێ سورا من و تە یە ڤێ ئێڤارێنه... خێله وەدە ئەم خوە ڕا کەتبوون ناڤا مژوولییا شیرنه نەبیرکری.

برووسکێ لێدا، قەی ژ شووری وێ ئاگر-ئالاڤ پەکیا. چاردۆرێ مە بوو ڕۆنکایی. تەیێ بگۆتا گەورێ حەمێزا من دا ژ خەوا شیرن ڤەجێنقی:

ئەڤ چ سبەیە؟

– من گۆت: – دینێ، ئەڤا بەربانگا مرازێ من و تە یە، بهارا دلێ مە یە، سینگێ تە ژی چیایێ مە یی چارسالەیە و من ڕامووسانەک ژی ژێ کەرەمکر...

ڕۆژەکێ، بەری ئێڤارێ، ئەز و گەورا خوە جارا ئەولن، مە تەهەرمکی خوە ڕا مەجال دیت، خەوله بوون و کەتنه ناڤا مژوولییا شیرن...

ڕێداکتۆر جەردۆیێ عەسەد

شکلکێش ئان. ف. گاسپاریان

ڕێداکتۆرێ بەدەوەتیێ ڕ.س. بێدرۆسیان

ڕێداکتۆرێ تێخنیکیێ ئۆن. پانیکیان

کۆرێکتۆرا کۆنترۆل ئێ. ئوو. باکۆیێڤا

خودانێ کتێبێ پێشێ خوە دا ئاگرۆنۆمە. گەلەک وەخت نینە، کو دەست ب ئەمرێ ئەفراندارییێ کرییە، شێرێد وی ڕۆژناما "ریا تەزە"-دا هاتنە نەشرکرنێ. ئەڤا کتێبا وی یە ئەولنە. تەمائێد پۆززیا یە. بۆییک ئە هیملی وەتەنهزی، ئەدلایی، شەرکاڕا جمائەتا کوردا یە ملەتیێ-ئازادارییێ، هوب و تەبیەتن.

ئەز سەر ڤێ ڕێ،

ڕێ ل دنێ،

دنیا ڕەنگی

ئەز سەر بەنگی...

***

ئەدلایی

ڕابم

ڕابم ژ ئەورا

و ئەورا سیار بم...

بازۆم،

بازۆم وانا

بەر ب ئەزمانا

و نیڤێ شەڤێ

بگیژمه هیڤێ...

ستێرکا تۆڤ کم

ئەزمان وێ شۆڤ کم...

و ل سەر ئەزمانێ سایی

ب ستێرکا

بنڤیسم

ئەدلایی...

***

ئاگرەکی گەش

ئاگرەکی گەش

تمێ دشخوله

ئۆرتا دلێ من،

من دکشینه

بەر ب ڕێکێ

ڕێکە درێژ،

ڕێکە بێبن...

وێ دەرێ، جیێ کو

ئەور هەڤ تۆڤ بوونە،

برووسک لێدخە،

تەیرۆک دبارە،

و دکە قرچین...

دەهژە دنیا...

جیێ کو هەزارا

شەر دکن پێشیا

قەتلێ و زولمێ

بۆنا ئازایێ...

گور به تو ئاگر
بشەوتە دل،
نەترسە تو قە،
هەرە تو ژی ور
و ناڤ ئاگر دا
تو ژی بتەقە.

***

دڤی، بڤە...

هەرگێ مەرڤی،
هاتی دنێ،
دنێ را تو نەکە زنێ...

دەورانێ را
تو بڤە کور،
دکشی،
بکشە چا ئاڤا گورِ...

دڤی، بڤە
هزکی کەڤر،
ئێ کو تینن دکن دیوار،
نە کو ل چیێ کەتیە بێ کار...

دڤی، بڤە
هزکی تو دار، یان سپندار،
هەما ب سیێ تو بدە کار
نە کو بڤی زەڤیێ را قار.

دڤی، بڤە

هزکی کانی
ژ تە وەکی ئاڤێ ڤەخون
زەڤی و تی،
نە کو بکەڤی گەلیکی کوور
و ژ مەریا تو دوور بی، دوور...

دڤی، بڤە
تو چێکرچی، نە پینەچی،
چێکە تاما، ڕاکە خاما...
نە کو زەڤیا تو بکی خام،
تام هلشینی بکی وێران،
دەوسا شێنکی
کۆرپووچکی وان.

هەرگێ تە ڕا دڤێن مەری
گەرە مەری
تشتێ قەنج ڕا بڤە دەری.

***

چ ڕندە،
ناف گوندە،
مەزن ئوو
بلندە
قاپییێ من.

دخولخولە،
دململە،
ڕەنگ-رەنگی،
دخەملە

دنیا من.

چ شینه
ئەڤینه
خەملی،
و دینه
یارا من.

قاپیێ من
دنیا من،

یارا من،
ئەز بەنگی،
هوون ڕەنگی،
دۆرا من.

***

چ دخوازم ژ دنیێ؟..
هوب-هزکرنا جۆت یارا،
ک چیا مککینا کارا،
تونەبوونا نەیارا...

چ دخوازم ژ دنیێ؟..
قەنجبوونا کەر و کۆرا،
قەلسبوونا نەهەق، زۆرا،
هلدانا سوور، سینۆرا...

چ دخوازم ژ دنیێ؟..
ومکەهەڤیا وەلاتا،
گولڤەدانا جمائەتا

و براتیا مله‌تا...

چ دخوازم ژ دنێ؟..
سیله بڤن جوٚت، کوٚتان،
کشکا ڕا هه‌به وه‌ته‌ن،
من ڕا ژی دێ کوردستان.

## دلێ دیا کورد

ئانین
و مه‌یتێ کور،
به‌ر دێ دانین...

هیڤیێ بوو باناسیست ئه‌ل-ئاهمه‌د،
وه‌کی دێئێ خوه باڤێژه سه‌ر مه‌یت،
ڕێژکه ده‌نگێ خوه ب دیروٚک و به‌یت،
بکه وه‌ره‌-وار
بکه قاره‌-قار...

و وێ کاپیتان
سمێل بادداں،
بن سمێلا دا
دکه‌نیا...

لێ دێ
سه‌کنی بوو،
سه‌کنی بوو ور ل به‌ر مه‌یتێ کور،
ل دا شه‌وات، ئاگره‌کی گور،
سه‌کنی

خەبەر نەددا، نەدکر ئاخین،
دلێ خوە دا وێ خومیی دکر برین...
سەکنی بوو...
بناتارێ دهات قرچینا تۆپا،
دژمن وێ دخواست،
هێسرێ دیا کوردا
بەر چەڤێ خوە بدیتا...

دێ قووز بوو سەر مەیت،
بائاسیست کەنیا،
ئەوی ترێ ئیدی
تژە بوو
دلێ دێ...
لێ دێ
ئەنیا کور پاچ کر،
و سەرێ خوە
کوبار هەڤراز کر...
دەوسا دێ چیا گریان،
ژ ئەورا هێسر باریان.

لێ دێ سەکنی بوو،
سەکنی بوو پیا،
نەدگریا...
– تە شەرکر ئەگیت،
بۆنا مالا خوە

تە شەر کر، وەکی کورد و کوردستان
بەسە بمینن ئەتیم، بێ وەتەن...

تە شەر کر ئەگیت،

و سەرفنیازی

بەر دەرێ مالا خوە

تە سەرێ خوە دانی.

ئەز ناگریم، وەکی شا نەڤن دژمن،

نەکەنن ئەو ل سەر هێسرێ من...

زەندە گرت

بائاسیست ئەل-ئاهمەد

"قە بیە، وەکی دێ

نەگری سەر ئەولەد؟..."

- پیرا بێ ئیمان،

نە ئەڤ کورێ تە یە،

لێ هێسرێ دێ کانێ، ئێ، کانێ؟..

کاپیتان چا دارا بی

هات

و بەر دێ سەکنی...

- بائاسیست ئەل-ئاهمەد، کورێ هار،

دلێ دیا کورد ناگری تو چار.

بوو شەلپین

و سوورەتێ ئەل-ئاهمەد

بەر سیلێ شەوتین...

بوو تەقین،

دلێ دیا کورد

ب گولێ پەرتی...

دێ کەت

سەر مەیتێ کور بێ ئاخین...

***

ئۆ، بەرا بێبن، ئۆ، بەرا مەزن،

مینا ئاڤێ لەز، مینا ئاڤێ فەرز

جمەتا من!..

دبێژن وە دا، بەرێ پێل ڤەدا،

بن بوو چار تیشا، چار یالا دا

وەتەنێ من!..

دڤێن بەر یەک نە و بنی یەکە

تیشبوونا وێ قە تو باوار مەکە

گومانا من!..

و دیسا دڤێ، شەبەقا سبێ

وێ بڤە یەک، بەرا پێلەک

ئۆ، سەبرا من!..

ئۆ، بەرا مەزن، ئۆ، بەرا بێبن

پێلدە تو قالم، بگیهینە هەڤ

جمائەتا من!..

***

سەر دێمێ کالکێ من کشک ڤەرچوومەکن،

ڤەرچوومەک کوورن

مینانی گەلیێ فەزا گوندێ مە...

و وەدێ دڤێم: کالکۆ، دێمێ تە

چ نەوال، سوورن،

مەزن و هووړن؟..

دڤە: نە، لاوۆ، ڕیا مە درێژ بوویە،

دنیا گەلی بوویە،

ئەمری تێ دا خار،

دەوران بێخێر بوویە، بێسۆز، بێئیتبار...

ڕیا ئەمرە، لائۆ، خوە دێمێ من دا،

ڕیا ئەمرێ کور دا.

***

چیایێ دێرسمێ وێ ب مژە،

بایێ شەنگالێ گوژە-گوژە،

چڤاسی گەلۆ ئەز سەبر کم

هەتا ئەو من ژ وێ بکشە.

***

هوب و هزکرن،

تەبیەتا شیرن

سەر ڤێ ڕیا من،

... من ڕا هەڤالن

## دیا خوە ڕا

ناڤا باخچە دا بنێر ڤێ دارێ،

چاوا ڕەز گرتیە مێل بیە وێ کارێ،

باخڤانچی دایە بەر ملا خشمار،

وەکی نەتەوە ئەو بن هاقا بار.

ئۆ، دیا منە جان، ئەزێ چاوا دار

بکەڤمە بن وان ملە تە یە چار...

وەکی سەرێ تە
مقیم بلند بە...

***

چەڤێ من بەعرا بێبن،
ڤەیکا تە ناڤ چەڤێ من،
شێلوو نەکە تو بەعرێ،
وەکی چەڤ نەیێ گرتن...

## هێسرێ بووکێ

چەڤێ تە ڕا گولۆل دڤن
ئەو هێسرێ دور و لال،
دلێ تە دا گولەک ڤەبیە
سەر بلبل ئە گالە-گال.

بگری، بگری، گری نینە،
ئەز هز دکم گریێ تە،
ئەو بارانا بهاری یە
کو چەل، کۆلا ئاڤ ددا.

باران دڤە گول و سۆسن،
هێسر دڤن هوب و زار
دلێ تە دا گولەک ڤەبیە،
ئاڤ دە ب وان چلکێد ئال.

## هەرم

(میهانی پ. سێڤاک)

ڕابم،
ڕابم،

هەرم جەم وێ،
هەرم جەم وێ
ل ڤێ شەڤێ،
هێدی،
هێدی،
بکوتم ئەز
خەونا گەڤەز
... پەنجەرا وێ
و وەدێ وێ
گۆ: کەرمکە،
ئەزێ بێژم:
بباخشینە،
وەدێ کەنیا
ئەزێ بێژم:
دلی دینە،
وەدێ سۆر بوو
ئەزێ بێژم:
سەر تە ئەڤ دل
... زۆر ئەڤینە
وەدێ هێرس بوو
ئەزێ بێژم:
من شاش کریە،
بباخشینە.

## هیڤیێ را

ئەز و تونە دمرتین هەڤرا
هەر شەڤ، هەر گاڤ،
ئەز و تونە دچن هەڤرا
ب هوب و ساو،
ئەز و تونە بەر دارا بییێ
وێ دڤینن...
ئەز و تونە،
لێ تو دچی،
ئوندا دڤی
وەدێ ئەو تێ...
ئەوە ئیدی
شەوقێ ددە
ڕیا من ئە سی...
و دڤێژە:
"هیڤا ڕەنگی،
هەرە ئاڤا،
ئەزێ دمرێم،
ئەزم بەنگی".

***

بنێر، دیسا باران تێ،
ئاڤا ئەوریێد گران تێ،
ئەرد و بەرنق، ژ وە چوویە،
دیسا بەر ب وەتەن تێ.

## وێ زڤستانە...

سبە شەبەقە، بەرف دبرقە،
ئەزمانی سارە، رۆیە بەروارە،
وێ قرفە–قرفە، دار درجفە،
بنێرن هارە، پووس وێ دبارە.

ئەلەگەز کانە، بن بەرفێ دانە،
ئاپنجیێ قەرقاش ناڤا ملانە،
ئاپنجی پووسە، ب بەرف و بووزە،
کولکە چۆکانە، وێ زڤستانە...

## مەری

ئەرشان سەرا یە، سەراکە مەزن،
ستێرکا گۆڤەند گرتیە دلیزن.
ئەور خێلی یە، هیڤ ژی ئەزمان بووک،
مەری ناڤ واندا نقتکەکە چووک.
زممان لێدخە قەیدەکی گران،
دنیا دکشینە سەرگۆڤەندیا وان.

مەری چا مقام سەر لێڤا دنێ
چا دخوازە وانا
ب هونورێ خوە ددە لیستنێ.

## ڤێ شەڤێ

هنە هەوا خاش بیا،
شەڤەرمش بیا ڤێ شەڤێ،
مقامەکی باش بیا،

رێ قەرقاش بیا ڤێ شەڤێ...

چەڤێ تە دا کەن بیا،
هویا دل بیا ڤێ شەڤێ،
ئۆرتا مە دا تێل بیا،
تێل بێ کێل بیا ڤێ شەڤێ.

هاتنە تە خێر بیا،
جارا پێشن ڤێ شەڤێ،
دیتنا مە بێتێر بیا
هەتا-هەتێ ژ ڤێ شەڤێ...

ڕێداکتۆر: ئەمەریکێ سەردار
شکلکێش: ل. ە. ماناساریان
ڕێداکتۆرێ بەدەوەتیێ: ئان. ڤ. گاسپاریان
ڕێداکتۆرێ تێخنیکیێ: ئۆن. س. پانیکیان
کۆرێکتۆرا کۆنترۆل: ئێ. ئوو. بەکۆئێڤا

# مەسەلە و مەتەلۆکێ جمعەتا کوردا

ئۆردیخانێ جەلیل

---

کتێبا ٢

نەشیرەتا "هایاستان"
ئێرێڤان ١٩٧١

Ордихане Щәлил


# әсәлә у мәтʼәлоке щьмәтʼа кʼӧрда

## кʼьтʼеба II


нәширәта «Һайастан»
Ереван · 1971

ئەڤا کتێبا پەیهاتنا "مەسەلە و مەتەلۆکێ جمعەتا کوردا، یا جلدا پێشنە، کو سالا ١٩٦٩ ئا ئێرێڤانێ دا چاپ بوویە.

ڤان دو _ سێ سالێ پاشومختیێ خودانێ کتێبێ ئێپێجە مەسەلە و مەتەلۆکێ تەزە بەرهەڤ کرنە. تێرا هات دیتنێ، وەکی مەسەلە و مەتەلۆکێ تەزە، یێ کو ب هەرفا م-ڤا دێستپێ دبن ڤێ کتێبێدا ژی بێن چاپکرنێ.

ئێرێڤان ١٩٧١

م

٢٤٠١. مالا بێ ژن بێ خوییه.

٢٤٠٢. مالا کورا،

هەر کەس ژ خوڕا.

٢٤٠٣. مالا کێ دەعواتە، چەعڤێ وان ڕۆنک.

٢٤٠٤. مالا کەسیڤا - هێلوونا شێرە.

٢٤٠٥. مالاڕا و تفاق، قۆناخا میر و هاکمانە.

٢٤٠٦. مالا هێلەکا،

پەزێ کێلەکا.

٢٤٠٧. مالا شێرا ژ هەستییا ڤالا نابە.

٢٤٠٨. مالا شێخێ من ئۆرتا باسیسکێ،

خار دۆنزدە نان، لەگەنە نیسکێ،

ڕاهیشتە شەقەک یا گیسکێ.

٢٤٠٩. مالا جینارا تێر ڤە، جینار ژی پێڕا تێرە.

٢٤١٠. مالا جینارا تفاق ڤە، جینار ژی پێرا تفاق دڤە.

٢٤١١. مال بێ قرقر نابە.

٢٤١٢. مالێ دەولەتیا بەر کەسیڤادا ناچە.

٢٤١٣. مالێ دنێ- عەیبڤەشێرە.

٢٤١٤. مالێ دنێ نە ژ ئاقلا یە، داینا خوەدێ یە.

٢٤١٥. مالێ دنێ، چەعڤێ کۆر ساخ دکە.

٢٤١٦. مالێ زەعف، عەدووێ خوەیێ خوە یە.

ئا) مالێ زەعف خوەیێ خوە ددە کوشتن

٢٤١٧. مالێ مەریا هەڤە، توجار خوەخوە تێنە بەر دەرێ مەریا.

٢٤١٨. مالێ من ئەڤە،

نیڤی ئاڤە،

هەزکی بڤە،

هەزکی نەڤە.

٢٤١٩. مالێ مسرێ ژ مسرێ دەرنایێ.

٢٤٢٠. مالێ تە عەیبا وی هەڤە دوور بفرۆشە.

٢٤٢١. مالێ فرۆتی پەرێ هووره.

٢٤٢٢. مالێ حەلال دبە موو، ناقەتە،

مالێ حەرام دبە وەریس، دقەتە.

ئا) مالێ حەلال دڤە موویێ سەریا ناقەتە.

ب) مالێ حەرام بڤە کێران، وێ بشکێ.

٢٤٢٣. مالێ حەرامیێ وێ حەرامیێ ژی هەرە.

ئا) مالێ قەلپ بفرۆشی، پەرێ وی قەلپیێ ڤا دچن.

٢٤٢٤. مالێ وی هەیە، دنیا گشک ژێرا برانە،

مالێ وی تونە، دنیا گشک ژێرا ئاگرە.

٢٤٢٥. مالەک بێ مەزن بە،

مینا کەریێ بێ شڤان بە.

٢٤٢٦. مال زمینەتا دنێ یە

شەرەف (ناموس) زمینەتا قیزێ یە

٢٤٢٧. مال مێرا بەنگی دکە،

جەهـ کەرا مسری دکە

٢٤٢٨. مامەک هەبوو، زینەک هەبوو، ئێ دی حەموو زێدە کرنە.

٢٤٢٩. مار ببە سێڤ نەخە پاشلا خوە دا.

٢٤٣٠. مار دڤێ: "خازی من تێر خوونا گووزەکا ئنسان بخارا"...

٢٤٣١. مارێ ڕەش - زیارەتە.

٢٤٣٢. مار - مارە،

نە جی یە، نە وارە

٢٤٣٣. مار ڕەنگێ خوە دخەیرینە، لێ خەیسەتا خوە ناخەیرینە.

٢٤٣٤. مار خازیا خوە بەژنا ئنسان تینە.

٢٤٣٥. مار حەتا خوە ڕاست نەکە، نکارە هەرە قولا خوە.

٢٤٣٦. مار و ئنسان تمیٚ نەیارێ هەڤن.

٢٤٣٧. ماسی باڤێژە ئاڤێ، ماسی نزانە لێ خودێ وێ بزانبە.

٢٤٣٨. ماچا جۆتێ خوە بدە دەستێ دۆستا، مەدە دەستێ دژمنا.

٢٤٣٩. مێرا - مێرێ پێش و پاش،

هاجەت - هاجەتێ سمتەراش،

ئاشا - ئاشێ چار فەراش.

٢٤٤٠. مێرانی ئوندا نابە.

٢٤٤١. مێر بێ کێر؟

٢٤٤٢. مێر گەلە هەنە، تەڤا نە ل عەردەکی نە.

٢٤٤٣. مێر - ژنێ کراسەکی.

٢٤٤٤. مێرێ دیوانێ ژی کۆتیبوون هلدانە، کەسیڤی هلنەدانە.

٢٤٤٥. مێرێ عەراقێ ڤەخوە، قەدمحا ناژمێرە.

٢٤٤٦. مێرێ کۆتی دکەڤە سەر مێرێ چێ ڕاناڤە.

٢٤٤٧. مێرێ ماقوول (ئاغا، بەگ) بێ دەستەک نابە.

٢٤٤٨. مێرێ ماقوول (ئاغا، بەگ) بڤە پرا، سەررا دەرباز مەڤە.

٢٤٤٩. مێرێ ماقوول (ئاغا، بەگ) گەرە ئێلێ وەکە هەڤ بگرە.

٢٤٥٠. مێرێ ماقوول (ئاغا، بەگ) ئوسا نە، یەکی دگرە، یەکی بەردده.

٢٤٥١. مێرێ تەڤی قەنجی - خراڤیێ نەڤە، ئەو نە تو مێرە.

٢٤٥٢. مێرێ چێ ئەوە، خراڤا دەربازکە، یا قەنج هەر کەس کارە.

٢٤٥٣. مێرێ چێ زۆرا خوە دەرتێ.

٢٤٥٤. مێرێ چێ، نە ژ دۆستا، نە ژ دژمنا.

٢٤٥٥. مێرێ چێ سەرگێرە،

مێرێ کۆتی بنگێرە.

٢٤٥٦. مێرێ چێ هەڤالێ چێرا تێ کفشێ.

٢٤٥٧. مێرێ چێ شوورێ خوە خلاس دکە.

مێرێ کۆتی شوورێ وی نیڤی دا دمینە.

٢٤٥٨. مێرێ چێ شوورێ وی کشیا، بێ خوون ناچه کالانێ خوه.

٢٤٥٩. مێرێ قەنجی پێ بڤه، خەرابی ژی پێ دڤه.

٢٤٦٠. مێرمکی سەرێ سەد مێرانه.

٢٤٦١. مێرمکی چێ کاره بەرامبەری سەد مێری دمرێ.

٢٤٦٢. مێرێ کو هەنه،
فەند و فێلا هەڤدو زێده نه.

٢٤٦٣. مێر مێرا ناس دکه،
قووش پالدما کەرا ناس دکه

٢٤٦٤. مێر مێرا ناس دکه،
قووش پالانێ کەرا ڕاست دکه.

٢٤٦٥. مێرۆ، نه ژ من به، نه ژ ته به،
مال وێ خرابه به.

٢٤٦٦. مێر تەنا دمره،
گا سەربارا دمره.

٢٤٦٧. مێر هەنه خەملا مێرانه،
گوند هەنه خەملا گوندانه.

٢٤٦٨. مێر هندکن، مێرکۆک زمعفن.

٢٤٦٩. مێر چقایی چێڤه، تەنێ ڤه، وێ بێ کوتانێ.

٢٤٧٠. مێر شەرما خوه تێنه کوشتنێ.

٢٤٧١. مێر قەدرێ مێرا زانه،
نەمەرد قەدرێ مێرا چ زانه؟

٢٤٧٢. مێشه بێ دار نابه.

٢٤٧٣. مێو نه داره،
قیز نه واره،
پرپزێل نه بهاره.

٢٤٧٤. مه گوهدرێژمک کری
قه بەر مالێ نه زری.

٢٤٧٥. مەڵە نە تو جانە،

بێ دینی، بێ ئیمانە.

٢٤٧٦. مەڵە هەنە – مەڵە نە،

مەڵە هەنە – کەلە نە.

٢٤٧٧. مەراقا ئاشڤان – ئاشە.

٢٤٧٨. مەری ئاڤێ سار ئاگردا دکە، قرشا لێ زێدە ناکە.

٢٤٧٩. مەریێ بێ بەخت، چاوا پرا قول.

٢٤٨٠. مەریێ بێ کەس، کەس ناڤێ پێشدا وەرە.

٢٤٨١. مەری بنیا رێ کەت، کەس مەریا ناڤە خایی، خێنجی جینارا.

٢٤٨٢. مەری گا رەخ گامێشا دا گرێنادە.

٢٤٨٣. مەری دەربەکی کارە گوندەکی خراڤکە،

لێ نکارە دەربەکی چێکە.

٢٤٨٤. مەری دژمنا بترسە، نکارە مالێ خوەیکە.

٢٤٨٥. مەری ژەرێ بخوە، دڤە نەمرە،

مەریێ ملەت بقەتە، وێ بمرە.

٢٤٨٦. مەریێ ئاقل دو نانا دخوە،

مەریێ بێئاقل نانەکێ دخوە.

٢٤٨٧. مەریێ ئاقل نانێ خوە دخوە.

٢٤٨٨. مەریێ بێ بیر شوخولێ خوە دو جارا دکە.

٢٤٨٩. مەریێ بێ دۆست _ دژمن، نە رێزا مەریا دا نە.

٢٤٩٠. مەریێ بێ ئەسل پاییچیە.

٢٤٩١. مەریێ بێ خایی، هەر کەس کەڤرا داڤێژێ دا.

ئا) مەریێ بەلەنگاز، هەر کەس ئالیێ خوە دا تێ ندکا لێدخە.

٢٤٩٢. مەریێ بوخدانا بکە، بوخدانێ سەر وی دا بێن.

٢٤٩٣. مەریێ گاڤانتیێ بکە، تێر ناخوە.

٢٤٩٤. مەریێ دارا ببرە، تێر ناخوە

مەریێ کەڤرا ببرە تێر ناخوە.

٢٤٩٥. مەریێ دەولەتی کەفر ژی بەر پیێ وان دا دڤنە پەنێر.

٢٤٩٦. مەریێ دەولەتی کۆدکا خوە کۆدکا کەسیڤا ناخن.

٢٤٩٧. مەریێ دەولەتی سیار دڤە، خوەدێ بیر دکە.

پەیا دڤە، هەسپێ بیر دکە.

٢٤٩٨. مەریێ دین - دینک،

چ تالاشە مال و ملک.

٢٤٩٩. مەریێ دکەڤە تەنگاسییێ، گەلە هەڤالا خوەرا چێدکە.

٢٥٠٠. مەریێ ئەسلێ خوە بیر بکە، ئەوی حەرام زادەیە.

٢٥٠١. مەریێ ئەسلزادە، وێ ئەسلزادە ژی هەرە.

٢٥٠٢. مەریێ زەعف مقەدەرا خوە دا بکەڤە، وێ ئالچاخ بکەڤە.

٢٥٠٣. مەریێ کۆر را شەڤ ژی یەکە، ڕۆژ ژی یەکە.

٢٥٠٤. مەریێ کەسیڤ بەر ژنا خوە ژی ڕوورەشە.

٢٥٠٥. مەریێ کەسیڤ کراسێ وی ژی لێ دڤە ئاگر.

٢٥٠٦. مەریێ کەسیڤ خەونا خوە دا دەعواتێ دڤینە.

٢٥٠٧. مەریێ نەڤسا برچی تێرکە، خوەدێ ژی وێ وی تێرکە.

٢٥٠٨. مەریێ نەوێرمک ڕۆژێ دەهـ جارا دمرە، دەهـ جارا ساخ دبە.

٢٥٠٩. مەریێ تما سالێ بارە نان زێدە دخوە.

٢٥١٠. مەریێ تەک، ئێل لێ ناڤە خایی.

٢٥١١. مەریێ خالیا خوە بیر کر، وێ شیرێ دییا خوە ژی بیرکە.

٢٥١٢. مەریێ خەریب وەکی پەقلەڤێ ژی بخوە لێ دڤە ژەر.

٢٥١٣. مەریێ خزان بێ مۆڤەتە.

٢٥١٤. مەریێ خراڤیێ دکە، خراڤیا وی نایێ بیرێ.

٢٥١٥. مەرییێ هەرە بێبەخت، بێ وەتانە،

جیکی تونە سەرێ خوە داینە.

٢٥١٦. مەریێ ئێلێ نەرازیڤە، ئێل قە وی نە ڕازییە.

٢٥١٧. مەری کال دڤە، دل کال ناڤە.

٢٥١٨. مەریک کارە بڤە سەڤەڤێ گوندەکی.

٢٥١٩. مەری کارە پێ پنجارا دۆرا جەوا ژی دەرکەڤە باهارێ.

٢٥٢٠. مەریک کارە شێورا حەزار مەری بکە.

حەزار مەری نکارن شێورا مەریکی بکن.

٢٥٢١. مەریکی خراڤ ناڤێ گوندەکی خراڤ دکە.

٢٥٢٢. مەری کۆ دەڤەچیرا بڤە دەستەبرا، گەرە داروازێ وی مەزن ڤە.

٢٥٢٣. مەری کۆتی ڤە ژی قەبیلا مەریا کۆتیبوونا مەریا ئوندا دکە.

٢٥٢٤. مەری ناکەڤە کەلا دۆستا.

٢٥٢٥. مەری نکارە ئێگر بەری بەرا دە.

٢٥٢٦. مەری پێ مەریا هەڤایە.

٢٥٢٧. مەری پێ خەونا دەولەتی ناڤە.

٢٥٢٨. مەری سیاری ژی بازۆ ڕسقێ خوەڕا ناگهینە.

٢٥٢٩. مەری خوونا پێ خوونا ناشۆ،

مەری خوونا پێ ئاڤێ دشۆ.

٢٥٣٠. مەری خوەخوە سەڤا خوە نەگری، کەس سەڤا مەریا ناگری.

٢٥٣١. مەری هەڤالێ باشڕا کارێ خوە باڤێژە بەرێ ژی.

٢٥٣٢. مەری هەیە دەولەتی یە

مەری ژی هەیە دەولەت دییە.

٢٥٣٣. مەری چقاسی دووری هەڤ دچە، هەڤدو خەولە دڤە.

٢٥٣٤. مەری چقاسی ژی قۆلایی ڤە، مالێ دنێ مێرا خورت دکە.

٢٥٣٥. مەرڤێ بێ ئاقل _ کەرەکی بێ دووڤە.

٢٥٣٦. مەرڤێ بێ برا،

چاوا خانییێ بێ چرا.

٢٥٣٧. مەرڤێ بێ وەتەن، چاوا کو زارەکە تەزی.

٢٥٣٨. مەرڤێ دەرەوچی، مەرڤێ تماخکار دخاپینە.

٢٥٣٩. مەرڤێ دین بێ خوەدێ یە.

٢٥٤٠. مەرڤێ تێر هەر و تم مەرڤێ برچی نە د بیرا وی دا نە.

٢٥٤١. مەرڤێ ڕاست خودێ ژی پێڕا یە.

٢٥٤٢. مەرڤێ سادق - بەرخێ خودێ یە.

٢٥٤٣. مەرڤێ سێوی گولەکە، د بن ئەور دا یە نە خویایە.

٢٥٤٤. مەرڤێ سڤک مەژوویێ وی هشکە.

٢٥٤٥. مەرڤێ هەڤسوود چەعڤێ وی بار نادە.

٢٥٤٦. مەرڤێ هەڤسوود د بەهرا گولا دا نوندا ببە.

٢٥٤٧. مەرڤێ چلەک تێر نان ناخوە.

٢٥٤٨. مەرڤێ قەدرێ خودێ گرت، قەدرێ مەزنێ خوە ژی دگرە.

٢٥٤٩. مەرڤێ قەنج خراب نابە.

٢٥٥٠. مەرڤەک کو دبینە دەرد و کولا،

ئەو دیسا بیر ناکە ئەشقا دلا.

٢٥٥١. مەرڤاتی چەمەکی ژ نوورێ یە.

٢٥٥٢. مەرڤ ژ بەر دوژمن برەڤە، ئێ حەتا مالا خوە برەڤە.

٢٥٥٣. مەرڤ نەڤتێ نادە کێلەکا ئاگر.

٢٥٥٤. مەرڤ نکارە هەڤالتیێ ب دلێ خوەرا بکە، چاوا ب خەلقێرا دکە.

٢٥٥٥. مەرڤ سەر نامووسێ تێ کوشتنێ.

٢٥٥٦. مەرڤ سێڤا بدزە، کارە ڤەشێرە،

زەڤەشا بدە بچەنگا خوە، نایێ ڤەشارتنێ.

٢٥٥٧. مەرڤ سورا خوە هەڤالێ خوە دەهەر دکە، برێ خوە دەهەر ناکە.

٢٥٥٨. مەرڤ هەرفا قورانێ دا ژی شاش دبە.

٢٥٥٩. مەرڤ جارەک ژ دیا خوەرا چێ دبە.

٢٥٦٠. مەسەلا ژنا نە

دودونە _ کاروانە،

سسێنە - بازرگانە،

چارن - ئاخر زەمانە.

٢٥٦١. مەسەلە، پێلەکانا ڕیا نە.

٢٥٦٢. مەخسەد و مراد نەگهیژێ هەڤ.

٢٥٦٣. مە جزیر ئاڤا کر،

هەسۆ سەر دا زاڤا کر

٢٥٦٤. مەر تێ کوشتنێ، ڕاست دڤە،

دژمن تێ کوشتنێ ڕاست دڤە.

٢٥٦٥. مەعر و ئینسان هەڤ دیتن، ڕۆ دسەکنە.

٢٥٦٦. مەعسی نە د بەهرا دا بێ، نابێ هووت.

٢٥٦٧. مەعسووفە - برابرە.

٢٥٦٨. میر گۆتی میر ڤە،

جمعەتا وی نە هێسیر ڤە.

٢٥٦٩. میر ل جی، قەدا ل جی.

٢٥٧٠. میر و فەقیر؟

٢٥٧١. موحبەت مەرهەما دلا یە.

٢٥٧٢. موویووک ژ بارێز بکێشی، خێرە.

٢٥٧٣. مووش خاش مووشە،

پشتا وی ئالقووشە.

٢٥٧٤. مزگەفتا بێ هەسیر، وەکە تاسا بێ هەمام.

٢٥٧٥. منێ، منێ،

ڕووڤی ناچە کونێ.

٢٥٧٦. مریێ ک تو ڤەشێری، چۆکێ وییا ژ دەڤرانن.

٢٥٧٧. مری نە ئانگۆری شینێ یە.

٢٥٧٨. مری نە مەلون بە، گۆر لێ تەنگ نابە.

٢٥٧٩. مریشکا دەولەتیا هێک دکە، دیکێ وانا ژی دکە قرتەقرت.

٢٥٨٠. مریشکا زەر هێکا سپی دکە.

٢٥٨١. مریشکا سپی دەردخە ئەلۆک.

٢٥٨٢. مریشکا هێکا ناکە، قرتەقرتا وی دنێ هلتینە.

٢٥٨٣. مریشکێ دل کر، مێڤان ڕێ کر.

٢٥٨٤. مرشیکەکە خێر ژنەکە بێخێر چیترە.

٢٤٨٥. مرن - عەزابە.

٢٥٨٦. مرن ناڤێ مەریا گشکا دکە یەک.

٢٥٨٧. مرن نە ژ کالبوونێ یە، نە ژ پیربوونێ یە.

٢٥٨٨. مرن هەیە ژ ژینێ چێترە.

عەمر هەیە مرن ژ ویا چێترە.

٢٥٨٩. م چ کر گا و جلا،

چ بکم مال و ملکا.

٢٥٩٠. مشکەک حەفت کوویا دحەرمینە.

ن

٢٥٩١. ناڤا سالەکێ دە دو هاڤین نابن.

٢٥٩٢. ناڤا چەرا دا زێرا بەلا ناکن.

ئا) شێر دا پلاوێ پاراڤە ناکن.

٢٥٩٣. ناڤدان ژ لێدانێ چێترە.

٢٥٩٤. ناڤێ گور دەرکەتییە، ڕووڤی دنێ خرا کر.

ئا) ناڤێ گور دەرکەتییە، لێ ڕووڤی مالێ خەلقێ خراڤ کرییە.

٢٥٩٥. ناڤێ دنێ ژ ئەزاڤێ گورا مەزترە.

٢٥٩٦. ناڤێ ژنێ دینانۆک،

مال دا تونە ئارڤانۆک.

ئا) ناڤێ یارێ دیندارۆک،

مال دا تونە ئارڤانۆک.

٢٥٩٧. ناڤێ مالێ یەک بووکا مالێ خراب دکە،

یەک سایلێ بەر دێری، یەک ژی خولامێ مالێ ،

هەرسێک ژی ناڤنۆنە.

٢٥٩٨. ناڤێ مێرا ببیزە، لێ ڕەنگێ مێرا نەڤینە.

٢٥٩٩. ناڤێ مێرا مێرا زێدە یە (زێدەترە).

٢٦٠٠. ناڤێ من ناڤێ تە،

قۆتکێ من سەرێ تە،

تو ڕەقی، م دا پەی تە.

٢٦٠١. نافێ خوەدێ هەیە، لێ خوە تونەیە.

٢٦٠٢. نافی گرانە، شەهەری وێرانە.

ئا) نافێ گران، مەزەلێ وێران.

ب) نافی گەورەیی دێی وێران.

(نافی مەزنە، گوندی وێران).

٢٦٠٣. نافی هەیە و نافکی نییە.

٢٦٠٤. نافی شات هێنا - قالی ڕاخە.

(نافێ شاهـ دا - خالیچێ ڕاخە).

٢٦٠٥. ناف ملکان - ئاش،

ناف سنەتان - سمتراش،

ناف مێران - مێرێ پێلۆپاش.

ئا) ناف ملکان - ئاش،

ژ سنەتکارا - سمتەراش،

مێر ئەوە - نەفکرە پێش یان پاش.

٢٦٠٦. ناف نقیا،

نامووس دێرادەرەنجیا.

ئا) هنەک دکن، نامووس هنەکارا دمینە.

٢٦٠٧. ناف خاچ و خردنبی ،

وەی ل وی، کو مالا خوە نەبی.

٢٦٠٨. ناف شوور کشاندن و لێخستن گەلە زەمان هەیە.

٢٦٠٩. نا بای دیوە و نە باران.

(نە با دیتیە و نە باران)

٢٦١٠. ناباری، ناباری _ بارێ بکە گورینی.

٢٦١١. نامووس چەکرن (ئاڤێتن بەر) کووچکا، کووچکا نەخار.

٢٦١٢. نامووس و خیرەت نە شانا هەر کەسی یە.

٢٦١٣. نامووس خیرەت نە پەرەتییە.

٢٦١٤. نامرم تیرا پێرا،
دمرن خەبەرا ڤێرا.

٢٦١٥. نان بۆ نانەوە، گۆشت بۆ قەساب.
(نان بۆی نان هەوجا یە، گۆشت بۆی قەسابا یە.)

٢٦١٦. نان بۆی حەموو نەفسی یە،
چەک نە یا حەموو کەسی یە،
ئا) چەک نە یا حەموو بەژنانە،
نەفس یا حەموو بەندانە.

٢٦١٧. نان بوخە گورانی،
شوخول بکە مێرانی.

٢٦١٨. نان بدە بە سەگ، مەیدە بە سپلە.
(نان بدە سێ، نەدە تماکار).

٢٦١٩. نان بدە نانپێژا، نانەکی ژی زێدە بدە.
ئا) نان زێدە بدە نانپێژان، بلا نانەک زێدە بە.
ب) نانێ خوە بدە نانداپا، ئاڤێ خوە بدە ئاڤدایا.

٢٦٢٠. نان ب خۆی، خۆی ب مەعنە.

٢٦٢١. نان، گاک جەم مەریێ مەرد یەکە.

٢٦٢٢. نان دشکێ دبە دو کەری،
وارس دقەتە دڤە چار سەری.

٢٦٢٣. نانێ بێ منەت ژ قاورمێ خەلقێ چێترە.
ئا) نانێ خومیی هشک بخوە، ژ قاورمێ خەلکێ چێترە.

٢٦٢٤. نانێ ب منەت نایێ خارنێ.

٢٦٢٥. نانێ گەنم ل سێویا حەرامە.
ئا) نانێ گەنم ژ فەقیررا چێنابە.

٢٦٢٦. نانێ گەنم، ئاڤا سار ناگهیژە هەڤ.

٢٦٢٧. نانێ گەنم زکێ مەریا قول دکە.

٢٦٢٨. نانێ گەرم، زکێ چەرم، مێڤانێ بێ شەرم.

٢٦٢٩. نانێ كێم ئاقلا تم زكێ ئاقلا دا نه.

٢٦٣٠. نانێ كو سەر سێلێ شكەست، هەڤ ناگره.

ئا) نان كەر ئیدی ناگهێژه هەڤدو.

٢٦٣١. نانێ مێرا ل سەر مێرا دەینه.

ئا) نانی مێردان له مێردان قەرزه.

ب) نانێ مێرا سەر مێرا نه منەته، دەینه.

٢٦٣٢. نانێ مێرا ل قەلسەمێرا حەرامه.

٢٦٣٣. نانێ مەریێ بێبەخت، سەر چۆكێ وی یه.

٢٦٣٤. نانێ مەریا، ڕوویێ مەریا تێ خوەرنێ.

٢٦٣٥. نانێ من قەساسێ سەرێ منه.

٢٦٣٦. نانێ ڕاستا، چەعڤێ خارا.

٢٦٣٧. نانێ تەنێ گەوریا مەریا دا ناچه.

٢٦٣٨. نانێ خوه بێهێله سبێ،

شوخولێ خوه مەهێله سبێ

ئا) نانێ ئێڤارێ بهێله سبێ.

شوخولێ ئێڤارێ نەهێله سبێ

٢٦٣٩. نانێ خوه ب خیا عەنیا خوه بخوه.

٢٦٤٠. نانێ خوه بخوه ب ئاڤێ،

منەتێ خەلقێ مه ڤێ.

ئا) نانێ خوه دخوم ب ئاڤێ

من منەتی كەسی نایێ

٢٦٤١. نانێ خوه ژ شكەڤا خوه هلده،

هەڤالێ خوه ژ گوندێ خوه هلده.

٢٦٤٢. نانێ حەڤتێ و یەک ملەتی تەعم كریه.

٢٦٤٣. نانێ جه دەوسا نانێ گەنم ناگره،

نانێ گەنم دەوسا نانێ جه ناگره.

٢٦٤٤. نانەک گەرم و تاسەک دەو نه تو تشته،

لێ نە کارێ هەر کەسی یە.

٢٦٤٥. نانەک ژی ل شکەڤێدا ڤە، هەڤالێ خوەرا نیڤیکە.

٢٦٤٦. نانەکی ددی دەستێ سێوییێ، تلیا خوە ژی نەکە چەعڤا.

٢٦٤٧. نانەکی هازری پەتی هێژمیی دمەـ گرکە هەڤیرە.

٢٦٤٨. نانەکی هەڤالێ خوەرا نیڤی دکی، پارا گەلە بدە هەڤالێ خوە.

٢٦٤٩. نان ئەو نانە، ئەمرۆ لە خوانە.

نان ئەو نانە، کو ئیرۆ دیهارە.

٢٦٥٠. نان ژ قورانێ نەزنترە.

ئا) نان ژ قورانێ پێشداترە.

٢٦٥١. نانی خۆی لە سەر سفرەی خەلق ئەخوات.

نانێ خوە سەر سفرا خەلقێ دخوە.

٢٦٥٢. نان کو تونە بە، مەری بێ دین، بێ ئیمانە.

٢٦٥٣. نان – نانێ لێژا،

گۆشت – گۆشتێ کێشا.

٢٦٥٤. نان نینە، کەلەپارچێ دخوازە.

٢٦٥٥. نان و دەو،

حەموو دەرمو.

٢٦٥٦. نانی ب نینە،

منەت تێ تونینە.

٢٦٥٧. نانخورۆ، جەو درۆ.

٢٦٥٨. نان ئوسا بها بوویە، بەرامبەری سەریا بوویە.

٢٦٥٩. نان سەر سفرێ تێ خارنێ.

ئا) نانێ بێ سفرە، سێنی، تەعما وی تونە.

٢٦٦٠. نان و دەو،

قەوات – هەو.

٢٦٦١. نان و ماست،

خەڤاتا ڕاست.

٢٦٦٢. نان ئوندا ناڤه.

٢٦٦٣. ناخازم ئەو جنەتا ب منەت.

٢٦٦٤. نێزه له پێشا ئەبێ جێی بکەیتەوه ئینجا بیدزیت.

پێشیێ جیێ نزێ بکه، پاشێ وێ بدزه.

٢٦٦٥. نێینووک تونه خوه پێ بوخورینه.

٢٦٦٦. نێر بێ و مێ بێ بۆ دۆی ئەوێ.

نێر به، مێ به، دخوەزه بدۆشه

٢٦٦٧. نێریێ بێ پەز،

مرتڤێ بێ ساز،

ژەژیا بێ پیڤاز،

هەرسک ژی یەکن.

٢٦٦٨. نێتا دو دلا ناڤه یەک.

٢٦٦٩. نێتا دلا، قەده ل سەریا.

ئا) نێتا دل -قەدا سەری.

٢٦٧٠. نێتا من، نێتا ل هەوا،

سبێ رادبم چەعف ل خەوا،

هەرکێ خەلق گرت، ئەم ژی پێرا،

هەرکێ نەگرت، چوو بادلهەوا.

٢٦٧١. نێچیرا مەسیا نەجەدینه،

سالێ جارەکێ گۆشتێ وی بتەعمینه.

٢٦٧٢. نێچیرڤان ناڤ خەونا خوه نێچیرێ دبینه.

٢٦٧٣. نەبێ - نەبهێ.

٢٦٧٤. نه به بەرخی تێر شیرم خوارد، نه به کائووری تێر گیا.

٢٦٧٥. نه بەر ڕابوونا خوه دکەڤه، نه بەر ڕوونشتاندنا خوه دکەڤه.

٢٦٧٦. نەبینم بەرفا سبه دا،

نەبینم جەردا ئێڤار دا.

٢٦٧٧. نەبینم بەرا بێ گەمی،

نەبینم ئیسانا دەم ـ دەمی.

٢٦٧٨. نەبینم پەیایێ سیاررا،

نەبینم دەنگبێژێ زورنێرا.

نەبینم رەختا رەخ گۆڤێندێ.

٢٦٧٩. نەبینم جانکا با و بەز،

نەبینم خۆرتێ هەرگاف بێ: "ئەز"،

نەبینم پیرا ب خرخال،

نەبینم کالێ بێ گۆپال.

٢٦٨٠. نە بۆنا زکێ منە، بۆنا قەدرێ منە.

٢٦٨١. نە ب لەزێ، نە ب بەزێ،

کەس ناگهێژە تو مرازێ.

٢٦٨٢. نە بنهێرە کەسێ ـ کەسا،

نە بنهێرە باڤی پسا.

٢٦٨٣. نە ب نمێژێ نە ب تاعەتێ تو ناچی جنەتێ.

٢٦٨٤. نەڤینم دلێ خەم تێدا،

نەڤینم مالا شەر تێ دا،

ناڤینم شەهەرێ ئەو تێدا

٢٦٨٥. نەڤینم پیرا بەلە هەرە شینا،

کالێ ژ خۆرت بستینە هەسپ ـ زینا.

٢٦٨٧. نەڤینم هەسپا لۆق ـ لۆقۆ،

نەڤینم قیزێ لیق ـ لیقۆ،

نەڤینم کولفەتا تیر ـ تیرقۆ.

٢٦٨٨. نەڤینم ئێلا بێ سەری،

نەڤینم چیایێ بێ کەری.

٢٦٨٩. نەڤرۆزە ـ هەسپێ بۆزە.

گێدووکا دکە دەو و دۆزە.

٢٦٩٠. نەڤرۆز، چ شەڤ، چ رۆژ،

چ زنێر، چ بەرۆژ.

٢٦٩١. نەفسا پیرا و زارا یەکە.

٢٦٩٢. نەگەرە ل کاش

نەڤینە خەونێ شاش

٢٦٩٣. نە گۆلکا بمژە،

نە خوەسیا بکوژە.

٢٦٩٤. نە گوندێ بێ ڕەز،

نە کۆنێ بێ پەز،

نە مێرێ ببێژە: "ئەز و ئەز".

٢٦٩٥. نە گورگورا عەزمانا،

نە هرهرا مەریانە.

٢٦٩٦. نەدە سەر بەعرێ بێ بنی،

نەچە پێشیا مەریێ دەم - دەمی.

٢٦٩٧. نەدە سەر سەبرێ، سەبر مە نایێ.

٢٦٩٨. نەدە، وەختێ ددی لێ نەبە خایی.

٢٦٩٩. نە دیتی ڤا، گلیا نەکە.

٢٧٠٠. نە دوعا بوومە، نە نفرا بمرم.

٢٧٠١. نە دوخوم ڤریکا تە،

نە داژۆم هۆریکا تە.

٢٧٠٢. نە دگری، کو مرۆڤ پێڕا بگری،

نە دکەنە، کو مرۆڤ پێڕا بکەنە.

٢٧٠٣. نە دخوم گێلازا،

نە ددم هەڤرازا.

٢٧٠٤. نە دخوم ساڤارێ،

نە دچم هەوارێ.

٢٧٠٥. نە دل ددی دبووری، نە د گورچکا.

٢٧٠٦. نە دخوە، نە ددە هەڤالا،

گەنی دکە و داڤێ نەوالا.

٢٧٠٧. نە ئەوەندە تال بە فرێت بدەن،

نە ئەوەندە شیرن بە قوورت بدەن.

(نە ئەوقاس تەعل بە، کۆ تە باڤێژن،

نە ئەوقاس شیرن بە، کو تە داقورتینن).

٢٧٠٨. نە ئەوەندە ئووشک بە بشکەیت،

نە ئەواندەش تەر بە بگوشرێیت.

(نە ئەوقاس هشک بە تە بشکینن،

نە ئەوقاس تەر بەر تە بگوڤێشن).

٢٧٠٩. نە ژ مێرێ چێ، ئیخبارێ چێ.

٢٧١٠. نە ژنا بەلاش،

نە خولامێ بێ ماعاش،

نە عەردێ کاش.

٢٧١١. نە ژنی نزیک باوان،

نە گوێرەکی نزیک ئاڤەدان.

٢٧١٢. نە ژ خەونێ شەڤا، نە ژ نێتێ دلا.

٢٧١٣. نە ژ فەسادا بە ڕۆڤی ئێ هەرە سووکێ.

٢٧١٤. نەزەرێ چەعڤا دکەڤە ناڤا هەستوویێ مەرڤ، هەستو دهەلە.

٢٧١٥. نە یا دەفێ، نە یا ڕەفێ.

ئا) نە یێ دەفێی، نە یێ ڕڤاڤێی

٢٧١٦. نەیارێ باڤان،

نابن دۆستێ کوران.

٢٧١٧. نەیارێ ب ئەشکەرە و دۆستێ خاین.

٢٧١٨. نەیارێ خوە ب دۆستی ئونداکە.

٢٧١٩. نەیار ل حاڤا نەیار، کێلەک خوە دوخوە.

ئا) نەیار قاری نەیار خوە دکارە عەلبە خوە بوخوە.

٢٧٢٠. نەیار حالێ نەیارا نزانە.

٢٧٢١. نەینیک وەلدگەرە، گەمی وەلدگەرە.

٢٧٢٢. نەینووکی دوژمن ب سەر گۆشت نەکەڤن.

٢٧٢٣. نەینکا هەڤ دخی.

٢٧٢٤. نەینک عەیبا مەریا نیشان ددە.

٢٧٢٥. نە کالا بە پۆست،

نە دوژمن بە دۆست.

٢٧٢٦. نەکە، نەبینە.

٢٧٢٧. نەکە سەرێ کەسێ _ کەسا،

وێ بێ سەرێ پسێ _ پسا.

٢٧٢٨. نە کەسی ل کەسانە،

نە باڤی پسانە.

٢٧٢٩. نەکەڤا مالا بێ مەرڤ.

٢٧٣٠. نە کەدێ دکە، هە – هەدێ دکە، موفتە ڕوودنێ و دوخوە.

٢٧٣١. نە کەر کەت، نە هیز دری.

٢٧٣٢. نە ل بەختێ ئاڤێ ئامل بە،

نە ل بەختێ هەسپێ ئامل بە،

نە ژی ل بەختێ ژنێ ئامل بە.

٢٧٣٣. نە ل عەردە، نە ل عەزمانە،

هەوسار دەستێ ئنسانە.

٢٧٣٤. نە ل ڕەنگێ تتوونێ بنهێرە، نە ل ڕەنگێ مێرا.

٢٧٣٥. نە مالێ پر، نە گەردەنا ستوور،

مالێ پر زوو زیا دبە،

گەردەنا ستوور زوو زراڤ دبە.

ئا) نە مالێ پر نە گەردەن ستوور.

ب) نە مالێ پر بفرە، نە ژی گەردەنا ستوور.

٢٧٣٦. نە مال کورێ قەنجرا (چێکە)،

نە ژی کورێ خرابرا (چێکە).

٢٧٣٧. نه مار بەختێ خۆ ل هینسان تینه،

نه مەرڤ بەختێ خۆ ل مار تینه.

٢٧٣٨. نه مێرێ چێ، بەختی چێ.

٢٧٣٩. نه مێرێ شەرۆمکه،

نه ژنێ کەنۆکه.

٢٧٤٠. نه مه چوو ل مالا سلێمانێ نانخوار،

نه مه شوخول کارەک کر.

٢٧٤١. نه میر بم، نه حاکم بم،

یان پیر بم، یان شێخ بم.

٢٧٤٢. نه من ژ ته سارە، نه ژ ته گەرمه.

٢٧٤٣. نەمری کەس تونه.

٢٧٤٤. نه نانەکی ناندار دبی،

نه دەنگەکی دەنگبێژ دبی.

ئا) نه نانەکی ناندار دبی،

نه ڕمەکی ڕمدار دبی.

٢٧٤٥. نه نیعمەت بۆ تێر،

نه لباس بۆ کوێر.

(نه نەعمەت بۆنا تێر،

نه لباس بۆنا کۆر).

٢٧٤٦. نه پێلاوی تەنگ،

نه خانەک به جەنگ.

(نه سۆلێ تەنگ،

نه مالا ب جەنگ).

٢٧٤٧. نه پیرێ باشکر سەر گونی ڕوونشت.

نه ژی گونی باشکر پیرێرا چوو.

٢٧٤٨. نه سۆرێ بەر ئاگرا،

نه ڕندێ بەر چرا.

٢٧٤٩. نه ته دەنگ، نه ژی من حس.

٢٧٥٠. نەفەرێ جینارا هەڤرا عەدلی ڤن، جینار ژی پێرا عەدلینه.

٢٧٥١. نەڤسا برچی خوه داڤێ سەر سێلا سۆر.

٢٧٥٢. نه خازی وی شەری، کو دو رووڤی هەرنێ.

٢٧٥٣. نه خازل رۆژا پەسناندنێ.

٢٧٥٤. نەخاشی ژ مرنێ چێتره.

٢٧٥٥. نه خەڤاته، نه تەڤاته.

٢٧٥٦. نه خەما منه، نه دەما منه،

قرچه _ قرچا بەنووشتێ منه.

٢٧٥٧. نه خەم هەیه دلدا،

نه مری هەیه گۆرێدا.

٢٧٥٨. نەخوەشه _ پاری شەشه.

ئا) نەخوەشه پاری خاشه.

٢٧٥٩. نەخوەشۆ و نه ل مالۆ،

چ کری خەریبیان بمری، بریندارۆ.

٢٧٦٠. نه هیووش کر، نه چیووش کر،

هات هازر ل بەر چیووچ کر.

٢٧٦١. نه شا بم، نه پادشا بم،

هەرۆ شێخ و پیر بم.

٢٧٦٢. نه شەیتان دبینم، نه لەپێن ته تینم.

٢٧٦٣. نه شیرن به خەلق ته بخون، نه تەعل به خەلق ته باڤێژن.

٢٧٦٤. نه شیش بسووتێ، نه کەڤاف.

٢٧٦٥. نەقەبا مێرانیێ و قەلسەمێرانیێ موویەکه.

٢٧٦٦. نەقەبا تەمووز و تەڤاخێ،

ئاگر گره ئاخێ.

نەقەبا هەبلەر و شاخێ.

٢٧٦٧. نیڤی، لێ ناکه هێڤی.

٢٧٦٨. نيڤ مەڵە _ دين ب دمردا،

نيڤ حەكيم _ جان ب دمردا.

٢٧٦٩. نير ئالييێ گايێ قەلپدا خار دبە.

٢٧٧٠. نيسان،

عەرد خەملی ديسان،

كەو فرين ژ مەجليسان.

٢٧٧١. نيشانێ باهارێ – با نە، ئێ مرنێ تا نە.

٢٧٧٢. نۆكێك بە نە پاروو ئەخوات.

(نۆكەكێ دكە نەهـ پەری، هێژا دخوە).

٢٧٧٣. نوهـ هاتن، كەڤن خەلاتن (هەلاتن).

٢٧٧٤. نوورا مەرڤ _ چەعڤێ مەرڤە.

٢٧٧٥. نڤشت _ بێ تشت؟

٢٧٧٦. نگێ گەرێ، ناكەڤە بن بەرێ.

٢٧٧٧. نگێ چەپێ پەی يێ راستێ دچە،

يێ راست پەی يێ چەپێ ناچە.

٢٧٧٨. نزانە مالا دەعواتێ ل كويە، ڕاهشت كەڤچكێ خوە و چوو.

٢٧٧٩. نزانيی، ڕەحەتيا جانيی.

ئا) نزانی، خوەشە جانی.

٢٧٨٠. نزانی، لەما خزانی.

٢٧٨١. نمێژا مە مێژينە،

ئەو هەوجێ ئاڤێ نينە.

٢٧٨٢. نفت زێرێ ڕەشە.

٢٧٨٣. نفرێ دێ ژ كور ناگرە.

٢٧٨٤. نختا خالس حەرام نابە.

### ئۆ

٢٧٨٥. ئۆدارا لازمە نان و ڕوون،

خانیارا لازمه ستوون،

شوخولرا لازمه حجووم.

٢٧٨٦. ئۆزمر له قەباحەت خرابتره.

٢٧٨٧. ئۆمری درێژ شەرمی له کەس نییه.

٢٧٨٨. ئۆلام ب ئۆلام، میر ب خولام.

٢٧٨٩. ئۆمری خاینان کورته.

٢٧٩٠. ئۆرتا دو برا ژی ل هەڤدو دکەڤه.

٢٧٩١. ئۆرتا ژن و مێرا دا بیرا چلهەرینه.

٢٧٩٢. ئۆرتا من و عەزمین بوهوستەک ما.

٢٧٩٣. ئۆرتا سۆل و بزمارێ هەسپێدا به وێ خوه مرا بگهینه.

٢٧٩٤. ئۆرتا خێج خردنەبی،

هەرچا نه مالا خوه بی،

عەجەلێ سەرێ خوه بی.

٢٧٩٥. ئۆرتا قەنجی و خرابی دا بوهوستەکه.

٢٧٩٦. ئۆرتێدا ڕوودنی ژ قەراخا دوخه.

٢٧٩٧. ئۆرۆ، تو هێکا چەمل دکی؟

٢٧٩٨. ئۆجاخ نابه (نابنه) پووچاخ.

## ئو

٢٧٩٩. ئولاتێ کوردا تەڤ خێر و بێره،

ئالیک مەدانه، یەک زیڤ و زێره.

٢٨٠٠. ئوندا بوون مال دارێد فند و قولۆز،

ل گوند تەشکیل بوون کۆلخۆز.

٢٨٠١. ئوندا بوون تاریێ شەڤا،

بوو ڕۆنکایی ل هەر دەرا.

٢٨٠٢. ئوندا دبه مالێ مەریا،

ئوندا دبه ڕوحێ مەریا.

٢٨٠٣. ئوسا بوويه، سه خايێ خوه ناس ناکه.

٢٨٠٤. ئوسا پرچووێ خوه کريه، وەکی مێش سوورمتێ وی کەڤە، وێ حەزار پەرچەیی بە.

٢٨٠٥. ئوسا ڕازایه، بوويه ئافرێ حەفت کەرا.

٢٨٠٦. ئوسا خەمليه، بوويه شۆربا نەخوەشا.

## پ

٢٨٠٧. پايزا دەرەنگی چيا گۆتە چيا:

– برا ڕێوی نەسەکنە سەرێ ڕیا.

٢٨٠٨. پايزا دەرەنگی،

دوەشينە حەموو ڕەنگی.

٢٨٠٩. پايزە، دەو عەزيزە.

٢٨١٠. پاريا هوور، گولا کوور.

٢٨١١. پاريا مەرا برا نڤجی بە، لێ نامووسا مەرا جيبه.

٢٨١٢. پاريێ خوەش بده مەريێ خوە،

خەبەرا خوەش بدە دژمنێ خوە.

٢٨١٣. پار کوشتی، ئيسال شووشتی.

٢٨١٤. پاشييا دەرەوا زوو تێ.

٢٨١٥. پاشيا دەرەوا ڕووتە.

٢٨١٦. پاشی دلماينێ، دلکرين ژی هەيه.

٢٨١٧. پاشی کرنێ پۆشمانبوون نە لازمە.

٢٨١٨. پاشی مريا کەسی چەعفێ خوە دەرناخە.

ئا) پەی مرياڕا کەسی خوە نەکوشتييە، وەی ل جانێ چوويی.

٢٨١٩. پاشی تەنگيا فرالقييە.

ئا) پەی چەتنياڕا فرميی هەنە.

٢٨٢٠. پێ دەستەکی دو زەبەشا نەگرە.

٢٨٢١. پێز بەری جيێ بێ بناڤ نەدە.

٢٨٢٢. پێکەنینی زۆر گریانی لە پیایە.
(پاشێ کەنێ پر، گری ل دوو یە).
٢٨٢٣. پێنج پەین گورا باڤێ خوە خستیە.
٢٨٢٤. پێشیا ئاڤێ (ئێگر) تێ گرتنێ،
پێشیا جمعەتێ نایێ گرتنێ.
٢٨٢٥. پێشیا، گلی نەهشتنە پاشیارا.
٢٨٢٦. پێشیێ بشێورە، پاشیێ ب ئاقل بکە.
٢٨٢٧. پێشیێ هەسپێ بکرە، پاشێ ئافر چێکە.
٢٨٢٨. پێشیێ قیزە _ بەخت دلیزە.
٢٨٢٩. پەزا بەر دەعڤێ، ئاگرێ بەر بایێ، هەردو ژی یەکن.
٢٨٣٠. پەزا تەنێ (تەک) گورا خاریە.
ئا) پەزا بێ خوەیی گورا خاریە.
ب) پەزە تەکە خوە خوەریە.
٢٨٣١. پەزێ بێ شڤان، شڤانێ بێ سە، ئەو دبە مال وێرانی.
٢٨٣٢. پەزێ ژ کەریێ خوە بقەتە، پارا گورانە.
٢٨٣٣. پەزێ نێری، بۆ کێری.
٢٨٣٤. پەزێ ستەور نەدۆشە،
جاواهرێ خوە ئەرزان نەفرۆشە.
٢٨٣٥. پەز، ئەو ژی مینا ڕەز.
٢٨٣٦. پەز – مەرەز.
٢٨٣٧. پەز تونە، ڕوون دفرۆشە.
٢٨٣٨. پەسنێ مێرا پش (ت) مەریا دا ددن.
٢٨٣٩. پەریێ زێدە گەوری قەلێشە.
٢٨٤٠. پەریێ حەلال مەریا ڕوودنن،
پەریێ حەرام مەریا دڤە کول و ژمر.
٢٨٤١. پەریێ هێوشاندی نە یێ خوایا یە.
٢٨٤٢. پیڤازا نەخوە، بێن ژ (دەڤێ) تە نایێ.

٢٨٤٣. پیڤاز پیڤازە، چ سۆرە، چ سپی یە؟

٢٨٤٤. پیرا زەمانا بەر تەندووریّ چوو بەر کولفکیّ گۆ:

– خودیّ خراب کە، ئەز چقا عەرد گەریام.

٢٨٤٥. پیرا تەڤ دنیّ، دار ل کونیّ.

٢٨٤٦. پیرا شام، تاباییّ ئام.

٢٨٤٧. پیریّ باوار نەکر مێر بکە، گاڤا مێر کر، دەعوا مێر و حەیشتکا کر.

ئا) پیریّ باوار نەکر مێر بکە، مێر کرییە دەوا مالحەشتەکا دکە.

٢٨٤٨. پیریّ برا نمێژدار بە، ئینی، چارشەم ویّ زەعف هەبە.

٢٨٤٩. پیریّ گۆت: "کەچا من نەچە ناڤ کورکان"، کەچیّ گۆت: "یادیّ ئەڤا تو دبێژی قەدیایە".

٢٨٥٠. پیریّ گۆت: "هنگیّ ئاڤێتیک ناڤ مەهانە، زۆزان ل پیریّ حەرەمە".

٢٨٥١. پیریّ کووپ سەر یەمانن.

٢٨٥٢. پیریّ، نەچوو گۆڤەندیّ، کو دچیی، ئیدی دەرنەکەڤە.

ئا) پیریّ نەچوو دیلانیّ، کو چوو دیلانیّ، ئیدی دیلان بەتال نەکر.

ب) پیریّ فەدی کر بهاتا گۆڤەندیّ، گاڤا کەتە گۆڤەندیّ، ئیدی گۆڤەند بەرنەدا.

٢٨٥٣. پیریّ سێر، تمیّ سەر ناڤیّ حەجیا دەرباز دڤن، کرا دکن.

٢٨٥٤. پیریّ قەبحەت کریە، پیریّ ئەو نەکریە.

٢٨٥٥. پیرەک باڤێژە خومشیا،

جانک باڤێژە ڕەشیا.

ئا) پێرەکیّ تێخە خاشیا،

جاهلەکیّ تێخە ڕەشیا.

٢٨٥٦. پیرەک بوو، سیرەک بوو،

ئەو ژی یەک وا بوو.

٢٨٥٧. پیر کر، ژ بیر نەکر.

٢٨٥٨. پیر هین بوویە، حەتا نانیّ پارسیّ نەخوە، بینا ویّ دەرناکەڤە.

٢٨٥٩. پۆچا ویّ کولفکێدا شووشتیە.

٢٨٦٠. پندکا کووسیا عەردێرا،

دگەرە خەزالا سەرێ چیێرا.

٢٨٦١. پرسا بکە ژ خۆرتێ گەریایی و ژ کالێ زەمانان.

٢٨٦٢. پرسا پووچ یا خایانە.

٢٨٦٣. پرسا ڕاست بێژە، پرچ ئەولەدێ تە بە.

٢٨٦٤. پرسێ نەپاک زوو دگێژن جی.

٢٨٦٥. پرسێ تو خوەش پرسی، لێ پیرا خالا تو گۆتی.

٢٨٦٦. پرسێ خراب پێ سێ پووت هنگڤ نایێ خارنێ.

٢٨٦٧. پرس کو هەیە، شوورێ دو دەڤە.

٢٨٦٨. پرس پرسێ تە یە.

٢٨٦٩. پرس خوەستنا دلانە،

نەزانتی شەرما مێرانە.

٢٨٧٠. پرس جابا دخازە.

٢٨٧١. پچک، پچک،

چوو سەرێ کوچک.

٢٨٧٢. پشکول چوونە بازێر بوونە لەبلەبۆک.

٢٨٧٣. پشتا خوە بدە چیایێ ئاسێ، مێرێ چێ.

٢٨٧٤. پشتا خوە مەیێلمینە دو پشتا،

زکێ خوە مەیێلمینە دو تشتا.

٢٨٧٥. پشت پادشێ باڤێ پادشێ ژی دبێژن.

٢٨٧٦. پادار بگرە، بێ پێ مالو ئێمانە.

(ئێ ب پێ بگرە، ئێ بێ پێ مال مە یە).

٢٨٧٧. پاکی کو هەیە، پر دمینە،

بەندە تمێ تە بیر بینە.

٢٨٧٨. پاکی هەیە، تشتەکی باشە،

٢٨٧٩. پارە بدیت مەلا، لە مزگەوت دەر ئەکەیت.

(پەرا بدی، دکاری مەلە ژ مزگەفتێ دەرخی).

٢٨٨٠. پارەی خەلق کیسە ئەدڕێنێ.

(پەرێ خەلقێ کیسە دقەلێشە).

٢٨٨١. پارە – پارە ئەهێنێ.

(پەرە – پەرا تینە).

٢٨٨٢. پارسەکە و ب دار قەتەکە.

٢٨٨٣. پارسیا ژنێ کێمە، لۆما ئیتبارا وێ تونە.

ئا) پارخانەکە ژنا کێمە، ئیتبار بۆی ژنا تونە.

٢٨٨٤. پارس هەیە، دەردان تونە یە.

٢٨٨٥. پارۆ لە دەم بکەوە بۆ کۆش باشە.

(پەری ژ دەڤ بکەڤە، بۆنا پێشێ باشە).

٢٨٨٦. پاروو حەتا نەجووریێ قووت نادرێ.

(پەری حەتا نی نەیێ جووتنێ، ناچە خارێ).

٢٨٨٧. پاخاڤا ژ چەمێ کوور.

٢٨٨٨. پاخر زەرە، لێ زێر نینە.

٢٨٨٩. پاچوو کرن ڕەسوولێ حزکرنێ یە.

٢٨٩٠. پێ بە قەت بەرەی خۆت ڕاکێشە.

(لنگێ خوە وەکە بەرا خوە درێژکە).

٢٨٩١. پێ بی _ گۆرێ بی.

٢٨٩٢. پێلا ئەز برم، پێلێ شێلوو ژی م بڤن؟

٢٨٩٣. پێلا چووی، چوویە، پەی نەکەڤە.

ئا) پێلا کو چوو، ئیدی مەدە دوو.

٢٨٩٤. پێلێ ئاڤێ نایێنە هژمارێ.

٢٨٩٥. پێخەمبەرا پێشیێ دا خوە کریە، پاشێ مەریێ ماین.

ئا) پێخەمبەر بۆنا جانێ خوە دوعا دکە.

ب) پێخەمبەرا پێشیێ دارا بەر خوە ئاڤ دایە.

٢٨٩٦. پەیێ چاییرا خوە نەدە.

پەیێ گیهایێ خومیی لۆدکری بدە.

٢٨٩٧. پەلا مەینا بیرا دزا.

٢٨٩٨. پەلا من مەخە،

گليا ژ من دەرنەخە.

٢٨٩٩. پەلێ حالێ کەڤردا گريا.

٢٩٠٠. پەلکێ پێخاسا دەر مالا سۆلبەندانە.

ئا) پيێ پێخاس هەر وەخت بەر دەرێ سۆلدروو يە.

٢٩٠١. پەرێ مەڵە برا دەرێن، مرى برا گۆر ب گۆر بە.

٢٩٠٢. پەرێ سپى بۆ ڕۆژا ڕەشە.

٢٩٠٣. پەرە بدە، قەدە بکرە.

٢٩٠٤. پەرە دچن جيێ پەرە.

٢٩٠٥. پەرە هەيە، گووزا ژمارە.

٢٩٠٦. پەرە ڕۆنکايێ ددنە جيێ تەعرى.

٢٩٠٧. پەتێخە _ دەندک ڕێخە.

٢٩٠٨. پيادە ئەزانێ سووارە تەنگەی بەر بووە.

(پەيا زانە تەنگ و بەرێ سيار ڤەبوونە).

٢٩٠٩. پياو بە گەورەی فێری پلاوخواردن بێ، دەست بۆ لووتی ئەبات.

(مەری وەکی مەزنايا خوەدا هينی پێلاوخارنێ بە، وێ دەستێ خوە بڤە بەر پۆزێ خوە).

٢٩١٠. پياو بە تەمای دراوسێ بێ، بێ شەوسەر ئەنێتەوە.

(مەری وەکی چەعڤنهێريا جينارا خوە بە، وێ ب شەڤ ڕازێ.)

٢٩١١. پياوەتی بە سەر ئاوی حەمامەوە ئەکات.

(مەرڤايا خوە سەر ئاڤا حەمامێ نيشان ددە).

٢٩١٢. پياوی نابووت خزمی دوور و قەرزی کۆن بە ياد ئەکات.

(مەرێ کەسيف خزمێ خوە يێ دوور و دەينێ کەڤن بير تينە).

٢٩١٣. پينە سەر پينا خستيە.

٢٩١٤. پيس بوويە، بوويە کووچکێ ب دەرزيێ کەتييە.

٢٩١٥. پيسييا سالا، سالا دمينە.

٢٩١٦. پيس - پيسا دستينە، پارسەکچی ژێ دکەڤە.

٢٩١٧. پۆرێ کەچێ – جەمالا کەچێ.

٢٩١٨. پۆستێ دەڤێ بارێ گێ یە.

ئا) پۆستێ دەڤێ بارێ هێستری یە.

٢٩١٩. پۆستێ جاناگا سەر پشتا گا یە،

پۆستێ گا جاناگا نکارە بگەرینە.

٢٩٢٠. پۆر درێژە، ئاقلی کنە.

٢٩٢١. پووشا سالێ ب سالێدا دچە.

ئا) پووشێ سالێ سالێدا دمینە.

٢٩٢٢. پووشمان بوونا پاشێ ل بەر تووشتەکی ناگرە.

٢٩٢٣. پف دکی چرێ، چرا ڤێدسە.

٢٩٢٤. پرا نەمەردارا دەرباز نەبە برا ئاڤ تە ببە.

٢٩٢٥. پرا سەرەتێ وەکە دەرزی ،

خومێ خێرا سەررا بەزی،

هەرچی بێخێر، چۆک لەرزی.

٢٩٢٦. پرا سەرەتێ وەکە موو یە،

خوایێ خێرا سەررا چوویە،

هەرچی بێخێر، ورا مایە.

٢٩٢٧. پرانی مێرانیێ بەتال دکە.

٢٩٢٨. پر گەپکرن – گومش ب،

هندک گەپکرن ـ زەر دەب.

٢٩٢٩. پر گۆتن، جەگەر سۆتنە.

٢٩٣٠. پرن ـ بێ سورن.

٢٩٣١. پسێ، پسێ،

مێڤانی خومشە، شەڤەک، دودو و سسێ.

٢٩٣٢. پشیک دەزمالا پێخەمبەرا.

٢٩٣٣. پشیکێ ئوسا دگرن کو مەریا پەنجەروو (چەنگەروو) نەکە.

٢٩٣٤. پشیکێ چڤا باڤێژی، سەر لنگا دکەڤە.

٢٩٣٥. پشیکۆ، چەعف خەزالۆ،

سەر نەخشۆ، پێ بچووکۆ،

خازل ل وی مالی، کو دبە بووکۆ.

٢٩٣٦. پشیک هەولا ڕوحێ خوە دا شبێرە.

٢٩٣٧. پشیلە دەمی نە ئەگەیشتە دووگ ئەیووت: "سوێرە".

دەڤێ پشیکێ نەگهیشتە دووڤ، دگۆت: "شۆرە".

٢٩٣٨. پشتم سەڤین بە، تف ل ئاسنیش ئەکەم.

(پشتا من چیایێ سەڤین بە، دکارم تووی سەر هەسن ژی بکم).

٢٩٣٩. پشرووکا مەرییا ژ پەلاوا خەلقێ چێترە.

ر

٢٩٤٠. رابن ئاگر کەتییە بەحرێ.

٢٩٤١. رازت لای یەکێک دانێ و پرست لای حەزار.

(سورا خوە جەم یەکی بهێلە، لێ پرسا ژ حەزارا بکە).

٢٩٤٢. پا ل زێدە زمانا ناڤە.

٢٩٤٣. رانەزێ عەردێ ڕەش، نابینی خەونێ فەش.

٢٩٤٤. راستان زەوال تونە،

خاران کەمال تونە.

٢٩٤٥. راست بێژە پرچ ئەولادێ تە بە.

٢٩٤٦. راست بە و بە لای شێرا برۆ.

(راست بە و کێلەکا شێرڕا دەربازبە).

٢٩٤٧. راستە بەرفە سپی یە، هاشا، کووچک ژی سەر دا پیس دڤن.

٢٩٤٨. راستە مە دەڤە نەدیتیە، لێ پشکولێ دەڤێ دیتیە.

٢٩٤٩. راستە، ڕاستە،

دەو برایێ ماستە.

٢٩٥٠. راستە شیرێ شێرە، لێ عەیارێ بزنێدا یە.

٢٩٥١. راستە جەم وی نانخەلای یە، لێ ئاقلێ وی نە خەلای یە.

٢٩٥٢. راستيا دهڤێ دەعسێ چقاسە، ڕاستيا دژمنا مەريارا ئەوقاسە.

٢٩٥٣. راستى بڤە دمزى، ناقەتە.

٢٩٥٤. راستى - ڕەفتى، چافتى - كەفتى.

٢٩٥٥. راستى ڕەحمەتى لە ئەبارێ.

(ژ ڕاستيێ ڕەحمەت دبارە).

٢٩٥٦. راستى هەيە مالا خودێ يە.

٢٩٥٧. راستۆ ب ڕاستيێ ڤا،

خارۆ ب شكەستيێ ڤا.

٢٩٥٨. راست ڕابە، ڕاست ژى ڕوهـ بدە.

٢٩٥٩. ڕێبووار ئەرووا و سەگ ئەوەرێ.

(ڕێوى دەرباز دبە و سە دعەوتە).

٢٩٦٠. رێ برا، كور پڕا.

٢٩٦١. ڕێگەى درۆ نزيكە.

(ريا دەرەوا كنە).

٢٩٦٢. رێ د ناڤا دو دلاندا هەيە.

٢٩٦٣. ڕێزێ، حەتا فێزێ.

٢٩٦٤. رێ يەک پێ يە.

٢٩٦٥. رێ ل بەر تە.

خودێ ل سەر تە.

٢٩٦٦. رێ ل دلا تەنگە.

٢٩٦٧، ڕێسى كر ب خورى.

٢٩٦٨. ڕێوى بە فێل ناوييستێ،

مەگەر تەلە پێى بەستێ.

(رووڤى ژ فێلا ناوەستە، حەتا نى تەلە لنگێ وى نەگرە).

٢٩٦٩. ڕێوى دچە _ ڕێ دمينە،

شوور دچە _ دەرب دمينە.

٢٩٧٠. ڕێويێ ڕيا خوە هەرە.

٢٩٧١. رێویارا ڕێ لازمه.
٢٩٧٢. رەڤ نیڤێ مێرانیێ یه.
ئا) رەڤ هەیه مێرانیێ چێتره.
ب) رەڤ ژی هەیه مێرانی یه.
٢٩٧٣. رەڤیبا پسیێ حەیا بن قولینێ یه.
٢٩٧٤. رەزێ خوه جارەکێ ڤا نەخەرتینه.
٢٩٧٥. رەمەزانه،
خاریه شەشه نانه،
خاریه دیزه دعەنه،
هێ خورینه، زەنگا درانانه.
٢٩٧٦. رەمه ل هۆکا، ئەم خلاز کرنه گلۆکا.
٢٩٧٧. رەڤێ تەیرا تەڤ هەڤ نابن.
٢٩٧٨. رەڤی تیتیا تونه یه.
٢٩٧٩. رەخ دۆستێ خوه دکەڤی، منەت ژ دژمن نەکشینه.
٢٩٨٠. رەها تەعل بەرێ تەعل لێ شین دبه.
٢٩٨١. رەحەت دبه دەوسا خەنجەرا،
ساخ نابه دەوسا خەبەرا.
٢٩٨٢. رەحم به بەچکەی مار ناکرێ.
(رەحم چێژکێ مەرارا ژی بێ فەیده یه).
٢٩٨٣. رەشه _ تام خاشه.
٢٩٨٤. رەشه وەکه قیرا،
ڕاسته وەکه تیرا.
٢٩٨٥. رەشۆ ب لەپێ خوه.
٢٩٨٦. رەش، خو ژی ڕەنگەکه.
٢٩٨٧. رەش هەر ڕەشه.
٢٩٨٨. رەقێ بەڤێ هلگرتی.
٢٩٨٩. رەڤا ژنێ _ عەدەتا دنێ.

٢٩٩٠. رەوشا گا _ ستوروو نە.

٢٩٩١. رەوشا دارێ _ پەلێ دارێ نە.

ئا) رەوشا دارێ _ کولیلکن.

٢٩٩٢. رەوشا مالا چێ _ ژنە.

٢٩٩٣. رەوشا مالا _ قیز، خۆرتن.

٢٩٩٤. رەوشێ باهارێ _ هێشنای یە.

٢٩٩٥. رەوشێ بەرخا _ بانزدانە.

٢٩٩٦. رەوشێ بەرا _ گەمی نە.

٢٩٩٧. رەوشا بۆستان _ قاون و زەبەشە.

ئا) رەوشێ بۆستان _ قرای و زەبەشە.

٢٩٩٨. رەوشێ کامێشا قەلەوبوونە.

٢٩٩٩. رەوشێ گەلیا _ دارا بینە.

٣٠٠٠. رەوشێ گەلیا _ چەم، کانی نە.

٣٠٠١. رەوشێ گوندا _ ئیسانە.

٣٠٠٢. رەوشا گوران _ نێچیرە.

٣٠٠٣. رەوشێ قازان _ مێشە.

٣٠٠٤. رەوشێ داران _ ئێمیشە.

٣٠٠٥. رەوشێ دێلا _ ڕایی نە.

٣٠٠٦. رەوشێ دێرا _ ژامخێرە.

٣٠٠٧. رەوشێ دەست و ڕوو _ شووشتنە.

٣٠٠٨. رەوشێ دەولەت _ ئاقلە.

٣٠٠٩. رەوشێ دیکا _ کاتارە.

٣٠١٠. رەوشێ ژنان _ کلۆفی نە.

٣٠١١. رەوشێ زەفییان _ کەنمە.

٣٠١٢. رەوشێ زفستانێ _ بەرفە.

٣٠١٣. رەوشێ ئیسانا _ کنجە.

٣٠١٤. رەوشێ کالا _ تزبی نە.

۳۰۱۵. ڕەوشێ کال و پیران _ مرنە.

۳۰۱٦. ڕەوشێ کۆنا _ چیت و پەردە نە.

۳۰۱۷. ڕەوشێ کووچکان _ کەریا پێزە.

۳۰۱۸. ڕەوشێ کێورووشکان _ ڕەڤینە.

۳۰۱۹. ڕەوشێ کەران _ هەردو گوهە.

۳۰۲۰. ڕەوشێ کووسیان _ تونە.

۳۰۲۱. ڕەوشێ مالێ - کەڤانی یە.

۳۰۲۲. ڕەوشێ ماران - پۆچکە.

۳۰۲۳. ڕەوشێ مێران - شەل، کومە.

۳۰۲٤. ڕەوشێ مەیموونێ - لەییستنە.

۳۰۲٥. ڕەوشێ مەلا - شەشکە.

۳۰۲٦. ڕەوشێ مریشکان - هێکە.

۳۰۲۷. ڕەوشێ مرتبان - روورەشی یە.

۳۰۲۸. ڕەوشێ مهینان - جەنی نە.

۳۰۲۹. ڕەوشێ مشکان - تونە.

۳۰۳۰. ڕەوشێ پەزان - نێری یە.

۳۰۳۱. ڕەوشێ پیرا - تەڤن، تەشی نە.

۳۰۳۲. ڕەوشێ پیرا - قوتی، برنۆتی نە

۳۰۳۳. ڕەوشێ پییان - گۆرە و سۆلە.

۳۰۳٤. ڕەوشێ پشیکان - مشک گرتنە.

۳۰۳٥. ڕەوشێ ڕەزێ - ڕەزڤانە.

۳۰۳٦. ڕەوشێ رووڤییان - پۆچە.

۳۰۳۷. ڕەوشێ سەری - کومە.

۳۰۳۸. ڕەوشێ تەیران - هەردو ملە.

۳۰۳۹. ڕەوشێ فەقیان - خوەندنە.

۳۰٤۰. ڕەوشێ فەقیران - ئار و پیرە.

۳۰٤۱. ڕەوشا خۆزانا - کۆتانە.

٣٠٤٢. ڕەوشێ خۆرتا - توونجک - تەمۆری نە.

٣٠٤٣. رەوشێ هەسپان - زینە.

٣٠٤٤. رەوشێ هرچێ - سەری یە.

٣٠٤٥. رەوشێ چیا - بەلەکی نە.

٣٠٤٦. رەوشێ چیا - بلندای یە.

٣٠٤٧. رەوشێ شۆڤێ - تۆخمە.

٣٠٤٨. رەوشێ جاهلان - سمبێل، ڕوو یە.

٣٠٤٩. رەوشێ جانێ تەعزی - گۆشتە.

٣٠٥٠. رەوشێ قیزان - کەزی نە.

ئا) رەوشێ قیزا - رەش گولی نە.

٣٠٥١. رەوشێ قوتسێ - مۆخسی یە.

٣٠٥٢. ریا عەزمانا بەروارە، نە کاشە، نە کەندالە، هەما هەر وێ بێژە.

٣٠٥٣. ریا کۆ باڤ ناچە، کور دچە.

٣٠٥٣. ریا مالا، مالخوێ مالا زانن.

٣٠٥٤. ریا ڕاسترا چووین ناوەستە.

٣٠٥٦. ریا قەلپا ڕاست نابە.

٣٠٥٧. ریشیشی ئەتاشێ و ئەوێنەشی ئەداتە دەست.

(روو کور دکە، هەلا سەر دا ژی ئەینکێ ددە دێست).

٣٠٥٨. ریش نەبێ بە توشەوە، کە بوو ئەبێ شانەیی بۆ هەلگریت.

(روویێ خوە بەرنەدە، کاڤا بەرددی، گۆتی شەیێ تە هەبە).

٣٠٥٩. رۆ داگەریا، فەیدا ناکە.

٣٠٦٠. رۆ دەرباز دبە، قەدا ڕۆژێ دەرباز نابە.

ئا) رۆژ دچە، قەدا ناچە.

ب) رۆژ دەرن، قەزا نارن.

٣٠٦١. رۆ دەرباز دبە، قەدە ژی پێرا.

٣٠٦٢. رۆژا بوهوری، ڤەناگەرە.

٣٠٦٣. رۆژە دوومانە،

کێفا گورانە.

٢٠٦٤. ڕۆژاکی خۆشی خۆم، بە ڕۆژی ڕەش نە گۆڕمەوە.

٢٠٦٥. ڕۆژان ڕۆژی لە دووایە.

(ڕۆ پەی ڕۆژایە).

٢٠٦٦. ڕۆژا تاری د هنگۆڕتڕا کڤشە.

٢٠٦٧. ڕۆژا تەنگییێ مەری بەرێ خوە ددە یان چیاکی بلند، یان ژی مێرەکی چێ.

٢٠٦٨. ڕۆژا خوەش د سبێڕا بەلییە.

ئا) ڕۆژا خوەش، سبێ دا خوەشە.

٢٠٦٩. ڕۆژا خوەش، نەدە یا ڕەش.

٢٠٧٠. ڕۆژ بوونە سال،

زک بوونە چەعل،

کەڤانی بوونە بەقال.

ئا) ڕۆژ بوونە سال،

زک بوونە چەعل.

٢٠٧١. ڕۆژ بِ دەستا نێ گرتن.

٢٠٧٢. ڕۆژ دیارە، پەنجەی ناوێ.

(تەعف دیهارە، حەوجێ نیشاندایینا تلیێ نینە).

٢٠٧٣. ڕۆژێ دێرێ یە، لێ شەڤێ ل مێچێتێ یە.

٢٠٧٤. ڕۆژێک بە کەلەشێری، حەزار ڕۆژ بە مریشکی مەژی.

(ڕۆژەکێ مینا دیکا بژی، نە حەزار ڕۆژی مینا مریشکا).

٢٠٧٥. ڕۆژێ ڕەش ژ تەنگایێڕا نە.

٢٠٧٦. ڕۆژێ تەنگاسیێ مەرێ مەریا کێری مەریا تێ.

٢٠٧٧. ڕۆژەک بە مل بەرزی، نەک سەد سال بە مل هێزی.

(ڕۆژەکێ ب سەر بلندی بژی، نە سەد سالا ب سەرژێری).

٢٠٧٨. ڕۆژا پاک بۆ تەمەل شەڤەزەنگە.

(ڕۆژا گەش بۆنا تەمبەل شەڤەرەشە).

٢٠٧٩. ڕۆژ ڕەشبوو، تو ژ ڕۆژێ ڕەشتر ببە.

٢٠٨٠. رۆژ و هیڤ پادشێ دنێ نه.

٢٠٨١. رۆ کو چوو ئاڤا، ورا (وێدەرێ) دەرنایێ.

٢٠٨٢. رۆ ل کیدەرێ ل ته چوو ئاڤا، وێدەرێ ژی بسەکنه.

٢٠٨٣. رۆنی ڕژاو ئەکات به خێری باڤکی.

(روونێ ڕژیایی دکه خێرا باڤێ خوه).

٢٠٨٤. رۆنی خۆم ئەدا له سەری خۆم.

(روونێ من سەرێ من دده).

٢٠٨٥. رۆنکایێ دده دنیایێ، مالا خوەدا ژی تەعریه.

٢٠٨٦. روحێ سەلەفخورا ئانیزاز دبه.

٢٠٨٧. روح ڕاستی دچه گۆرێ.

٢٠٨٨. روح شیرنه.

٢٠٨٩. روو به ڕوو – دەم چەور،

پاشمله – دەم تەور.

(روو ب ڕوو – زار شیرنه، لێ پشت وی – تەورکۆله).

٢٠٩٠. روو – ب ڕوو، کونه_ئافوو.

٢٠٩١. رووڤیێ زانه حەرد نگا تەلێدانه.

ئا) رووڤیێ ژیر حەرد دەستا دکەڤه تەلێ.

ب) رووڤیێ فێلباز حەردو لنگا دکەڤه تەلێ.

ڤ) رووڤییێ شەرمزه هەرد لنگا دکەڤه تەلکێ.

گ) رووڤییێ خاسووک ب هەردو لنگا دکەڤه دەفکێ.

٢٠٩٢. رووڤی ژ بارانێ بترسییا، وێ خوەرا کورکەک چێکرا.

٢٠٩٣. رووڤی ژ ڕێ درەڤیا، ڕێ ژ رووڤی درەڤیا.

٢٠٩٤. رووڤیەکی گەریای، شێرەکی نەگەریای چێتره.

ئا) ڕووڤیکی گەریای، شێرەکی کەتی (روونشتی) چێتره.

ب) ڕووڤیکی بەردای ژ شێرەکی گرێدای چێتره.

٢٠٩٥. رووڤی کو شل بوو، ژ بارانێ ناترسه.

٢٠٩٦. رووڤی نەدچوو قولێ، هەژمک ژی خوا ڤا دادانی.

ئا) رووڤی نەدچوو تۆلانا خوە، گێزیک ژی پۆچا خوە ڤا گرێددا.

ب) رووڤیک نەچوو قولێ، حەژمک ب دووڤێ خوە دا گرێدا.

ڤ) رووڤی خوە نە دچوو رێ ڤا، حەژمک ژی دێلێ ڤا.

٣٠٩٧. رووڤی تێر بێ، تری ترشە.

٣٠٩٨. رووڤی هاتە دیوانخانێ وێ پۆستێ وێ ستوودا بیننە خارێ.

٣٠٩٩. رووڤی حەتا ڕاستیا خوە ئیزبات بکە، وێ پۆستێ وێ ستوودا بیننە خارێ.

٣١٠٠. رووڤی و سوخرە؟

٣١٠١. رووڤی و سووک؟

٣١٠٢. رووڤی چقاس بگەرە، داوی تێ دکانا کورکچی.

٣١٠٣. رووڤی وەستی، دووڤ گران دبە.

٣١٠٤. روو دا - جی دا.

٣١٠٥. روو دبن بوهوست، نەیار نابن دۆست.

ئا) روو دبنە بوهوست، دژمن نابە دۆست.

ب) روو بڤە بهوست، دژمن نابە دۆست.

مەعری ب ژەرە، گۆر دکە پۆست.

٣١٠٦. روودنی، ڕوودنی نشکێ ڤا دڤێ: "دمڤە"

٣١٠٧. رووێ ڕەش نە حەوجەیی تەنییە.

ئا) ڕوێد ڕەشکێ، ب تەنییێ چکن؟

٣١٠٨. رووێ تماخکارا، خوونێ مفلیسان.

٣١٠٩. روو ژ ڕوو شەرم دکە،

بەرتیل کەڤرا نەرم دکە.

ئا) ڕوشەت بەرێ کەڤرا نەرم دکە.

٣١١٠. روویێ کەسیبا کەس نانهێرە.

٣١١١. ڕوومەتا مەریا ئەهلییێ گوند بلند دکە.

٣١١٢. ڕوومەتا سا هەیە، یا مەرڤێ بێئار تونەیە.

٣١١٣. روورەشی عەیبا گرانە.

درانێ شێرا کێش دەرمانە.

٣١١٤. رووته شا نه، ڕۆژا شلی دەستپێ وانه زەهانه.

٣١١٥. رووتو، چ ل ڤی ئالی ئاڤێ، چ ل وی ئالی ئاڤێ؟

٣١١٦. روونێ سەرەکی داینه دەرەکی،
بڤه بارێ کەرەکی.

٣١١٧. روونشت ل گەرما،
ڕابوو ل سەرما.

٣١١٨. رم کووار دا نایێ ڤەشارتن.

٣١١٩. رم ڕەباز داڤێژه.

٣١٢٠. رندی - رندی،
گەرۆکا ناڤا گوندی.

٣١٢١. رسقێ گورا ل سەر پیانه.

٣١٢٢. رسقێ گورێ کۆر خوەدێ دگهینه.

٣١٢٣. رسقێ دینا ل دزایه.

٣١٢٤. رسقێ سان ل دنیایه، یێ ترکان ل کوردایه.

٣١٢٥. رسقی وێران، باری خودان.

٣١٢٦. رسق خاییب، بەخت خاییب،
ڕەجال خاییب، عەجەل خاییب.

٣١٢٧. رهێ مەرڤ وەکه دارکێ نفتکێیه.

## س

٣١٢٨. سا گۆشتێ سا ناخوێ.

٣١٢٩. سایێ ڕەش سپی نابێ.

٣١٣٠. سازبەندێ باش سازڕا کڤشه.

٣١٣١. سان دچه ل ماک.

٣١٣٢. ساله مژه، کۆدکه تژه.

٣١٣٣. سالا سەکنیی، مەها ژی بسەکنه.

٣١٣٤. سال ب سال، خوەزل (خازی) سالا پار.

ئا) سال بە سال، خۆزگە بە پار.

٣١٣٥. سالێ دو جار جەژن دبە، د وێ گاڤێدا ژی زكێن سێوییان دێشە.

٣١٣٦. سالەكێ تەمامكی، سەد سالی تەمامكی،

میرتیا شەرق و شامێكی،

ئاخر - ئۆخر تێ كاسا مرنێ تەعمكی.

٣١٣٧. سالەكی دنێ ڤی، سەد سالی دنێ ڤی،

ناڤا زێر و زیڤ دا خنێ ڤی،

ئاخر - ئۆخر تێ ڕۆژەكی مێڤانێ مرنێ ڤی.

٣١٣٨. سالكان پیر، بەژنا فەقیر.

٣١٣٩. سال مینا باویشكا تێن و دچن.

٣١٤٠. سال - سالا، مال - مالا.

٣١٤١. سارە، جلك ستارە،

گەرمە، جلك شەرمە.

٣١٤٢. سارا چارخا نادروون.

٣١٤٣. ساخۆ ڕێدا،

قەلپۆ زەرێدا.

ئا) ساخۆ ڕێدا،

قەلپۆ دەرەدێدا.

٣١٤٤. ساخا زەوال (زیانا) تونە،

قەلپا مكان (گۆمان) تونە.

٣١٤٥. ساخێ هەرنە سەر ساخیا خوە،

قەلبێ هەرنە سەر قەلپیا خوە.

٣١٤٦. ساق - ساقە، گۆرە - لاقە.

٣١٤٧. سێڤ دەڤرا ڤا سۆرە - بەدەوە، لێ هوندور دا دڤە كورم هەبە.

٣١٤٨. سێڤەكە دارێیە،

هەر كەس دەستێ خوە داڤێیە.

٣١٤٩. سێ دین هەیە ل دنێ.

یەک ئەوە کو می ددە بزنێ،

یەک ئەوە کو ڕێدا دچە تەنێ،

یەک ژی ئەوە کو دکە خەبەرا ژنێ.

٣١٥٠. سێ کەڤرا بدی هەڤ، سێل پێ دسەکنە.

٣١٥١. سێلا نەهقا نین ناپێژە.

٣١٥٢. سێ مالێ فەقیر مێڤانکی تێر ناکن.

٣١٥٣. سێ تشت هەنە ب دلێش.

مترب، مریشک و مێش.

٣١٥٤. سێ تشت هەنە ئەهمەق ل دنێ:

یێ کو ئەرڤازیا ڤەخو تتوونێ،

ل ڕیا بچێ ب تەنێ،

و ئێ مالا خوە دانێ ل ڕەخ مالبابا ژنێ.

ئا) سێ هەمەق هاتنە ڕوو دنێ:

یێ بدە هەڤرازا بکشینە قەلنێ،

یێ شەڤ تەنێ بدە سەر ڕێ،

یێ ژ مالا باڤێ خوە جهێ بە، بگهیژە مالا باڤێ ژنێ.

٣١٥٥. سێ تشت هەنە خاشن ب ساری.

ترشک، مەهیر و کاری.

٣١٥٦. سێویا نە خایکە، نە ژی بوکوتە.

٣١٥٧. سە بن سیا عەرەبێدا دکەت دکۆت سیا منە.

٣١٥٨. سە بن سیا زنێردا ڕازایە، ئەوی ترێ سیێ پۆچکا وی یە.

٣١٥٩. سەبر بکە، سەبرێ ئاشان بکە،

یا خوە بکە، یا هەڤال نەکە.

٣١٦٠. سەبر نەکی، سەبرێ ئاشان نەکی،

توێ خوە ڕەزیلی دنێ ئالەمێکی.

٣١٦١. سەبر دڤێ: "سەبرکە".

٣١٦٢، سەبر ئۆخرا مێرانە.

٣١٦٣. سەبر سکانا مەریانە (مێرانە).

٣١٦٤. سەبر سکانا چێیە،

کی نەدە سەر سەبرێیە،

بڤە میرێ مسرێیە.

ئا) سەبر میرێ مسرێیە.

ب) خومیێ سەبرێ – مەلەکێ مسرێ.

٣١٦٥. سەبر سکانا چێیە،

خۆف سلامەتیا ڕێیە.

ئا) سەبر سکانە،

خۆف سلامەتیا ڕیانە.

٣١٦٦. سە ب سە بدنە خەنقاندنێ.

٣١٦٧. سەڤا کەرا خوە دەڤا خەلقێ مرار نەکە.

٣١٦٨. سەڤا مێرا دنیالکێدا مرن ژ کەسیفیێ چێترە.

٣١٦٩. سەڤا مێرێ چێ برا کۆتیبوون هەڤیا، کەسیفی تونەڤیا.

٣١٧٠. سەڤا ملەتیێ نیڤە، گەرە مەزەلێ خراڤا باشقە ڤە.

٣١٧١. سەڤا نەڤسێ، خوە ئاڤیتە هەڤسێ.

٣١٧٢. سەڤا خەریبا ڕۆژ گەلەکی دەرمنگ دەرباز دڤە.

٣١٧٣. سەگ ئەڤان بە زەبری کلکی ئەشکێنێ.

(سە هەستو زەریا پۆچا خوە دشکێنە).

٣١٧٤. سەگی تێر ڕاو ناکات.

٣١٧٥. سەگی هار چل شەڤی ئۆمرە.

٣١٧٦. سەگی هەلوەر دز ئەهێنێتە سەر خاشەنی.

(سەیێ در دز تینە سەر خایێ خوە).

٣١٧٧. سەگ لە بەر مالی خاوەنیا ئەزایە.

(سە بەر مالا خومیێ خوە درە).

٣١٧٨. سەگ لە نان ڕاناکات.

(سە ژ نێن نارەڤە).

٣١٧٩. سەگ لە قەسابخانە نەمریٚ ئۆمری بەزایە ئەچیٚ.

(سە ل قەسابخانیٚ نەمرە، عەمریٚ وی بادلهەوا دچە).

٣١٨٠. سە گۆشتیٚ سە (سیٚ) ناخوە.

٣١٨١. سەد بەرتیل قەرزێک نابژێریٚ.

٣١٨٢. سەد پەز ل بەر سیها (سیا) دارەکیٚ مەخەل تێن.

٣١٨٣. سەد ڕاستیٚ کەسیبا، وەکە دەرەوەکە دەولەتیا ناڤە.

٣١٨٤. سەد سال تو بێژی، ئاف ناگیهە (نادە) چۆکیٚ من.

٣١٨٥. سەد خەبەر ب خەبەرەکی دسەکنە.

٣١٨٦. سەد خوونکاریٚ متالەییٚ، پێنج پەرە خەسەر ژ عەردیٚ هلنداینە.

٣١٨٧. سەد حاکیم ب قەت دەردەدارەک نازانە.

٣١٨٨. سەد هەڤالیڕا دچی چۆلیٚ، دژمنیٚ خوە بیر مەکە.

٣١٨٩. سەد - حالە، دوسود - مالە، سێسد - دالە.

٣١٩٠. سەد جەردە لاتێک ڕووت ناکات.

(سەد جەردباشی نکارن ڕووتەکی بشێلینن).

٣١٩١. سە درەییٚ، کارڤان دوبهورە.

ئا) سە درەت، کارڤان دبوهورە.

ب) سە درەییٚ، کەروان دبووریٚ.

٣١٩٢. سەد قەل و بەردەک.

(سەد قارقار ب کەڤرەکیٚ).

٣١٩٣. سەییٚ بیٚ تیمار، قارا مالایە.

٣١٩٤. سەییٚ گورێخ تولەتییدا گورێخە.

٣١٩٥. سەییٚ گورخەنق سەریٚ وی زکیٚ گورا دا یە.

٣١٩٦. سەییٚ دزییٚ، ویٚ دزییٚ ڤا هەرە.

٣١٩٧. سەییٚ کەتی مەری هشیار ناکە.

٣١٩٨. سەییٚ منە بەر دەریٚ خەلقیٚ دعەوتە.

٣١٩٩. سەییٚ ڕەش سپی نابە،

مەرڤیٚ پیس پاک نابە.

٣٢٠٠. سەیێ رۆ درەیێ ترسا شەڤێیە.

٣٢٠١. سەیێ سانۆ،

چی تە ناڤا چیبانۆ؟

٣٢٠٢. سە ژ کوتان نارەڤە.

٣٢٠٣. سەیدێ سەیدا وێ دەستێ تە بڤە هەردو عەیدا.

٣٢٠٤. سەلەف بازۆ، سەلەف بازۆ.

گۆ: "ئەز و تونە، کی هەیە؟"

٣٢٠٥. سەنەت - بازیێ (بازنا) زێرینە.

٣٢٠٦. سەنەت (سنەت) بۆنا ئینسین خەزینەیە.

٣٢٠٧. سەربارا سەردا، تو ژی ل من خە.

٣٢٠٨. سەر بارێ دەرد - کولارا.

٣٢٠٩. سەر بێژنگێ کفش دکە.

٣٢١٠. سەر بۆ سەربرین، نەک بۆ سەر زەنشت.

(سەری برا بێ برینێ، نەک بکەڤە بەر شیرەتا).

٣٢١١. سەر بووزێ هیم دانایێن.

٣٢١٢. سەر بچووک، پێ مەزن،

نە خوەزل ل مالی، کو دبە ژن.

ئا) سەری مەزن، لنگ پچووک،

خوەزی وێ مالێ، کو دبە بووک.

٣٢١٣. سەر دارەکی دو ئێمیش نابە.

٣٢١٤. سەردەڤی هەلا - هەلا،

بندەڤی نەئوز و بلا،

من ژی تە تۆڤە.

٣٢١٥. سەرێ ئاشقا پەی ماشۆقێ چوویە.

٣٢١٦. سەرێ بێمال ژ چرایە؟

٣٢١٧. سەرێ بێ نامووس ناچە جنەتێ.

٣٢١٨. سەرێ بەلەنگازا هەرۆ دشکێ.

٣٢١٩. سەرێ برى_نايێ كرى.

ئا) سەرێ هات (تێ) برين نايێ كرين.

ب) سەرى كو هات برينێ، ب مالێ دنيايێ نايێ كرينێ.

ڤ) سەرى كو هات برين ئيدى نايێ كرين.

گ) سەرەكى برين_نايێ كرين.

٣٢٢٠. سەرێ دو بەرانا بەرۆشەكێدا (سيتلەكيدا) ناكەلن.

ئا) سەرێ دو بەرانان د بەرۆشى دا نايێ كەلاندن.

٣٢٢١. سەرێ كو ژ دێ دەركەت ناچە دەوسێ.

٣٢٢٢. سەرێ كێرێ، زكێ زەبەشە.

٣٢٢٣. سەرێ كەتە بەر شيرەتا، كنجا كەتە بەر كێلا، خێرا وانا خاياڕا تونە.

ئا) سەرێ كەتە بەر شيرەتا، ئەو ژى نابە تشت.

٣٢٢٤. سەرێ كەچەل بن كومدا خوەشە.

٣٢٢٥. سەرێ لۆدێ ب گۆرزەكى تێ گرتنێ.

ئا) سەرێ لۆدێ گۆرزە گيها گرت.

٣٢٢٦. سەرێ مێرا يەك دەريە.

٣٢٢٧. سەرێ مێرێ چێ ناڤا مژ و دوومانە.

٣٢٢٨. سەرێ من بزر مەكە.

٣٢٢٩. سەرێ من سەرێ خێرنەديا،

قرشا هاتم چووم گورنيا.

٣٢٣٠. سەرێ ناڤچيتى، هەر وەخت دشكێ.

٣٢٣١. سەرێ نەيێشە، نە حەوجێ گرێدانێيە (بەنكانە).

ئا) سەرێ من نەيێشە، نە هەوجێيە كەفيێ لێ گرێدم.

ب) سەرێ تە نايێشە، گرێنەدە.

٣٢٣٢. سەرێ پيران، عەجێبێ گران.

٣٢٣٣. سەرێ ساخ بەعلگى ناخازە.

٣٢٣٤. سەرێ سەد خەبەران – خەبەرەك،

سەرێ سەد نەوالان – نەشالەك،

سەرێ – هەزار شاخی – شاخەک،

ئا) سەرێ سەد خەبەرا – خەبەرەک،

سەرێ سەد نەوالا – نەوالەک.

٣٢٣٥. سەرێ سەردا، بەرێ بەردا.

٣٢٣٦. سەرێ خوە ب دەستێ خوە بخورینە.

٣٢٣٧. سەرێ خوە ڤەکە، بەختێ خوە مێزەکە.

٣٢٣٨. سەرێ هەردو برا ناچە گۆرەکێ.

٣٢٣٩. سەرێ هەفت کەچەلا گرێدن، باران ئێدی نابارە.

٣٢٤٠. سەرێ هرچێ پرچێ ڤا دخون.

٣٢٤١. سەرێ چێ لاقێ پەسنانە.

٣٢٤٢. سەرێ چیا بوویە سور و سەرما،

خوەکرییا لێ ناڤە دەرمان.

٣٢٤٣. سەرێ چیا دوومان خالی نابە.

٣٢٤٤. سەرێ چیایێ بلند تمێ دوومانە.

٣٢٤٥. سەرێ چڤیکێ چییە، قەلیا وێ چ بە؟

ئا) سەرێ چڤیکێ چاورمە چێ ناڤە

ب) سەرێ قژکێ قەلی چێ نابە.

٣٢٤٦. سەرێ جامێرا هەیە، کەلایە.

٣٢٤٧. سەرێ وارس کن بوو، نەگهیشتە تە.

٣٢٤٨. سەر ئەدە – و سر نادات.

(سەرێ خوە ددە، سورا خوە دیهار ناکە).

٣٢٤٩. سەر زارێ وی هەیە،

هونرێ ویدا تشت تونەیە.

٣٢٥٠. سەری بێ عەجەل ناچە گۆرێ.

٣٢٥١. سەری بێ دەلەک ئەتاشێ.

(سەری بێ دووزان کوردکە).

٣٢٥٢. سەری بەعلگیێ پێشنە.

٣٢٥٣. سەریکی هەیە حەزار سەودا.

٣٢٥٤. سەریک لە ناڤ سەرانا نەبیّ، بۆ برین باشە.

(سەریکی کو ناڤ سەریا دا نیبە، برا ئەو سەری بیّ برینیّ).

٣٢٥٥. سەریک نەییشیّ - کوندورەک لیّ چێترە.

٣٢٥٦. سەریا لەق - لەقۆ،

زمانۆ چەق - چەقۆ.

٣٢٥٧. سەری ها بکە جەعدە، ها بکە جەعدە،

وەکی خودیّ نەدە، نادە.

٣٢٥٨. سەری هەڤن، سەرپێچ زەعفن.

ئا) سەری هەبن، کوم زەعفن.

٣٢٥٩. سەری - قیزە، بنی - دیزە.

٣٢٦٠. سەری - قووچە، بنی - پووچە.

٣٢٦١. سەرکانی شێخ - پیرادا خراب دبە.

٣٢٦٢. سەر کەڤرا قاخ چێدڤە.

٣٢٦٣. سەرما تیّ، تەیرۆک پێرا.

٣٢٦٤. سەر پرا نەمەرداڕا دەرباز نەبە، برا سێلاڤ تە ببە.

٣٢٦٥. سەر سەریّ گور قوران خوەندن، وەکی پەزیّ خەلقیّ نەخوە، گور گۆ: "زوو بکن پاشیا پێز چوو".

٣٢٦٦. سەر و پیّ لیّ بوون سسیّ، باڤێن بەر سیّ.

٣٢٦٧. سەر ئوتی بە زبانی. "حەتا تۆم جیرانی ج ڕاحەتیم نین لە گیانی".

٣٢٦٨. سەرچۆپی بدێیتە دەست سەگ، بۆ لای سەبەتەی نانی ڕائەکێشیّ.

(وەکی سەرگۆڤەندی سە بە، ویّ بەر ب شکەڤا نێن بکشینە).

٣٢٦٩. سەرقۆتۆ بەر بارانیّ، پێخاسۆ سەر گارانیّ.

٣٢٧٠. سە سەیی ناخوە.

٣٢٧١. سەڤا - بیّ جەڤا؟

٣٢٧٢. سەفەر بەردی مەهەکە.

٣٢٧٣. سەفەریّ تە چوو سەفەریّ، ڤەگەریا هات، پرسا ساخی - سلامەتیا وی بکە،

عەمەل دیسا عەمەلێ بەرێ.

ئا). سەفەرێ تە چوونە سەفەرێ،

ڤەگەریا هات دیسا عەمەلێ بەرێ.

٣٢٧٤. سە خوایێ خوە ناس دکە.

٣٢٧٥. سە چییە، دەعواتا سە چییە؟

٣٢٧٦. سە چقاس تەڕا ناس بە، دار ژ دەستێ خوە ناڤێژە.

٤٢٧٧. سە چەعف خایێ خوە دکەڤە، در دبە.

٣٢٧٨. سیا مەرف، خاریا مەرف ددە دیتن.

٣٢٧٩. سیاربوونا کەرێ عەیبەکە، پەیابوون دودو یە.

ئا) سوواربون عەیبێک، دابەزی دو عەیب.

٣٢٨٠. سیارێ سیاربە خوەدێ برا پەیا نەکە،

پەیا ژی برا سیار نەکە.

٣٢٨١. سیارێ هوور، هەسپا مەزن، خوەدێ هەڤسا مەریا ژێ بکە.

٣٢٨٢. سیار ژ مە - قەدا ژ خوەدێ.

٣٢٨٣. سیاری ژ دارێ دکەت گۆ: "قەنتەرەک گۆشت ژ من چوو."

٣٢٨٤. سیار نەبن هەسپێ ئاغا،

خوەش نابن دەوسا داغا.

٣٢٨٥. سیارتی مرازێ دنیاییێیە.

٣٢٨٦. سیلها مێرانیێ خیرمتە.

٣٢٨٧. سیلهێ مەرۆڤ، دەستێ مەرۆڤە.

٣٢٨٨. سیرا نەخوە بێن (ژ) تە نەیێ.

٣٢٨٩. سیسکێ نەسرینە،

لاوێ سێرتی نەترسینە.

٣٢٩٠. سیتلێ میرا تەرا بوو، دبێ شکەست یان نەشکەست، دبێ - دەنگ ژێ هات.

٣٢٩١. سۆزێ مالدا، بازارێ دەرباز نابە.

٣٢٩٢. سۆزێ مێرا درە.

٣٢٩٣. سۆز یەک، قرار یەک، خوەدێ یەک، هەق و هەقە.

٣٢٩٤. سۆز ل جەم مەرڤێ هورە.

٣٢٩٥. سۆلبەندێ باش هێکا ژی سۆل دکە.

٣٢٩٦. سۆلبەند هەڤە تونەڤە، خەما خوایێ دەڤێ نینە.

٣٢٩٧. سۆلکەر پێخاسن، چوومکەر بێ کراسن.

٣٢٩٨. سۆند نەخوە سەرێ مێرا، سەرێ مێرا زیارەتە.

٣٢٩٩. سۆند - شوورێ دو دەڤە.

٣٣٠٠. سۆر دکێ و کەسک دکێ و دلێ خوەیی خوەش دکێ.

٣٣٠١. سۆرە، گرە، بارنەبرە.

٣٣٠٢. سۆرە، گرە، بێ هونورە (هنرە).

٣٣٠٣. سۆفیێ ڕەمەزانێ،

وەکە کەرێ ناڤ گارانێ.

٣٣٠٤. سۆڤی مەردانە،

گا و گۆلک تەڤی دەر دانە،

ئەو مایە، ئەڤ خەبەردانە.

٣٣٠٥. سۆفیتی نە ب شاش و ڕهانە، لێ ب قەلپانە.

٣٣٠٦. سوالکەر توورەکەی پر و ڕووی ڕەشە.

(توورکێ پارسەکچیا تژییە، ڕووێ وان ژی ڕەشە).

٣٣٠٧. سوار ئاگای لە پیادە نییە.

(سیار هاش پەیا نینە).

٣٣٠٨. سوارێ بە تەنها تۆز ناکات.

(سیارێ تەنێ ناکە تۆز).

٣٣٠٩. سواری ئەسپی خالقبیت هەر پیادەیت.

(سیارێ هەسپێ خەلقێ بی، هەرتم پەیایی)

٣٣١٠. سوار تا نەگلێ، نابێ بە سوار.

(سیار حەتا نەلکومە، نابە سیار).

٣٣١١. سوندقێ سلێمانی،

خێن ژ خودێ کەس لێ نزانی.

٢٣١٢. سورەکێ بکە ستار،

منەتا خوە بکە یەکێ جەبار.

٢٣١٣. ستووری ژ گایێ جۆترا نامینە.

٢٣١٤. سووژنەک بۆ کەری وێستاو زۆرە.

٢٣١٥. سووک تژە قوماشە، لێ مەڵە بێ شەشە.

٢٣١٦. سوورەتە، نە خەیبەتە.

٢٣١٧. سبێ - پاری،

نیڤرۆ - حەتا دکاریی،

ئێڤارێ دخویی، ناخوی تو زانیی.

٢٣١٨. سبێ چەعڤێ برێ خوە نابینی، تو چەعڤێ جیناریێ خوە دبینی.

٢٣١٩. سدقێ مەرییا ساخ بە، لنگێ مەرییا کەڤرا ناکەڤە.

٢٣٢٠. سلاڤە ل میایە، نە ل ڕوویایە.

ئا) سەلام ل میا، نە ل ئریانە.

ب) سلاڤ ل مەهایە، نە ل ڕوحایە.

٢٣٢١. سلاڤ پارییێ هازرە.

٢٣٢٢. سلامەتی ژ ملامەتیێ چێترە.

٢٣٢٣. سلۆپی دووڤێ سەیینە، ڕاست نابن.

٢٣٢٤. سمبێل - رەوشا مێرانە.

٢٣٢٥. سمێل سۆری، مال مرتبی.

٢٣٢٦. سمێل تونە، ئەوی تریێ جەعنییێ تۆرە.

٢٣٢٧. سملێ گهیشتی سەریێ وی کێرە.

٢٣٢٨. سم - سمێ کەرێنە،

فێل - فێلێ پەرێنە.

٢٣٢٩. سنگ دکوتە، هەبن ستو داتینە.

٢٣٣٠. سنگ عەردێ دا ناچە حەتا تونەبە هما مێکوت.

٢٣٣١. سنگ شێری - ماکەر پشت.

٢٣٣٢. سنەت - چەکە،

بەریا خومکە،

هەوجە بووی - دەری ڤەکە.

٣٣٣٣. سپی ژ خرپالان،

خەبەر ژ چەپەلان.

٣٣٣٤. سریا خەڤاتێ خارن نە لازمە،

سریا خارنێ خەبات نە لازمە.

٣٣٣٥. سرکا بەلاش ژ هنگڤی شیرنترە.

٣٣٣٦. سرا کو ژ بۆ یاری کو یاری، خو ژ بۆ دژمنان ڤەمەکە.

٣٣٣٧. ستار هەیە بۆی (ناڤێ) خومدێیە.

٣٣٣٨. سفرا مەزن بچووک نابە.

## ت

٣٣٣٩. تایێ تەنێ، دێ ڕەبەنێ.

٣٣٤٠. تێ عەجال، نادە مەجال.

٣٣٤١. تێژکێ مەعرا بێ ژەعر ناڤە.

ئا) تەژکێ مارا ژی ب ژەحرینە.

ب) تەژکێ مارا ژ مارا پیسترن

٣٣٤٢. تە ب فندقێ ل دەرێ جیرانا خست،

ئەوێ ب گورمستێ ل ئێ تە خینە.

٣٣٤٣. تەڤشێ ل بەری خوە دکۆلە.

٣٣٤٤. - تە دنیا چاوا دیت؟

- وەکە دلێ خوە.

٣٣٤٥. تە ژی خوە ل وی بزۆتی دا.

٣٣٤٦. تەیر دفرە ب قاناتێ خوە.

٣٣٤٧. تەیر دفرە، نمووش هلددن.

٣٣٤٨. تەیر دفرە، دخازە هەفسور.

ئا) تەیر دفرە هەوسوری خوە.

ب) تەیر دفرە دڤێ هەڤسور.

ڤ) تەیر دفرە هەڤسوریێ خوە دگەرە.

گ) تەیر چقا بلند دفرە، دڤێ هەڤسور.

٣٣٤٩. تەیرێ گۆشتخور، نوکولێ وی کێرە.

ئا) تەیرێ نێچیرێ بکە، نوکولێ وی کێرە.

٣٣٥٠. تەیرێ نوکولکێر مەعسیگرە.

٣٣٥١. تەیرکێ تیتوانی،

تە وەختێ سالا نەزانی،

تە مالا خوە خراڤ کر، ئێ م ژی سەردا دانی.

٣٣٥٢. تەیرۆک جیێ لێخستی دخە.

ئا) تەیرۆکێ جیێ خک – خالی مەرییا دکوتە.

٣٣٥٣. تەیر تیرێ دخون، بەختێ ئالک ب ڕەشە.

٣٣٥٤. تەیر خوەشە ڕەفێ خوەڕا (خوەڤا).

٣٣٥٥. تەیر ب ڕەفێ خوە،

مەرڤ ب کۆما خوە.

٣٣٥٦. تەیر هەیە، کو مەرڤ ژێ گۆشت دوخوە،

تەیر هەیە، کو مەرڤ گۆشت ددێ.

ئا) تەیر هەیە مەری گۆشت ددێ،

تەیر ژی هەیە مەری گۆشت ژێ دستینە.

٣٣٥٧. تە کانیکێ ئاڤ ڤەخار، کەڤر ناڤێژێ.

٣٣٥٨. تە کو گول بین کر، بدە هەڤالێ خوە.

٣٣٥٩. تە کو سیر نەخومریە، چرا ژ تە بین تێ؟

٣٣٦٠. تە کێف کر، ئەز کەتمە بەلایێ،

ئا) تە خار، تە ڤەخار، جرمە سەرێ مدا شکەست.

٣٣٦١. تەلاقێ ژنێ سێ کەڤرن.

٣٣٦٢. تەمای دکە مال،

پر تەمای مالێ بەلا دکە.

٣٣٦٣. تەمێ یەکێ دکشینە گۆشتێ کەرێ، دڤێ: "گوهێ وێ نۆلا یێ کێڤریشکانە".

٣٣٦٤. تەندوورا بێ کولفک، خانیێ بێ کولەک پێشیا دژمنا دا بە.

٣٣٦٥. تەندوورا کەسیڤا هەیە، ئاگر تێدا ناشوخولە.

٣٣٦٦. تە ئوسا قازنج کریە، ئەز تێدا خەنقیمە.

٣٣٦٧. تەڕا کووسیگرە، خەلقێڕا مەعسیگرە.

٣٣٦٨. تەر و هشک تەڤ دشەوتن.

٣٣٦٩. تە فەدی نەکر، چ دکە، بکە.

٣٣٧٠. تە خێرەک کر، ب سەرە (تەمام) بکە.

٣٣٧١. تە هین کر – بیر نەکە،

تە بیر کر – هین نەکە.

٣٣٧٢. تە هلدا لێڤە،

من زانبوو چ ل دێڤە،

ئا) تا هلدا لێڤ،

من زانبوو چ هەیە دێڤ.

٣٣٧٣. تە چێکر ژی خوەڕا و خراب کر ژی ژ خوەڕا.

٣٣٧٤. تە چ دانی بەرۆشێ، تویێ وی بخویی.

٣٣٧٥. تەعڤا سبێ من گەرم نەکە، یا ئێڤەرێ قە گەرم ناکە.

ئا) تەعڤا سبێ مەریا گەرم نەکە، یا ئێڤارێ بۆشە.

٣٣٧٦. تەعف – باڤە، لێ ئاف – دیا ئەکنە.

٣٣٧٧. تەعف عەردێ دخەملینە، لێ خەبات مەرڤا.

٣٣٧٨. تەعزی ژی کووچکە، کووچک ژی کووچکە.

٣٣٧٩. تەعزی وەکی ب زۆر هەرە نێچیرا، نێچیر نابە.

٣٣٨٠. تەعلدێ شێرا، ستارا ڕووڤیا چێترە.

٣٣٨١. تەعنا تلیا گ یەکە، لێ کنای، درێژای پێڕا هەیە.

٣٣٨٢. تەعریێدا چرا ڕۆیە.

٣٣٨٣. تی کەرا ل بال کەرا گرێدێ، ژ هەڤدو چفتلێدان دعەلمن.

٣٣٨٤. تیرا ل هەندێلێ، برینا کەندێلێ.

٣٣٨٥. تیتی گ سار دبیّ، دبیّژه: "ئەزیّ خانیکی خوه بگرم".

٣٣٨٦. تۆڤیّ دژمن برەشینن، ستریّ دەوسیّ شین بڤن.

٣٣٨٧. تویّ سیتلیّ، پارا زارا دەلالیه.

٣٣٨٨. تو ئاش، ئەز قەراش.

٣٣٨٩. تو بده من شڤەکیّ، ئەزیّ بەردم ئێلەکیّ.

٣٣٩٠. تو بخوه، برا من بگڤره.

٣٣٩١. تو دێرێدا چ بووی، کو مزگەفتێدا چ بی؟

٣٣٩٢. تو دەریا نەکوته، وەکی دەریّ تە نەبیّ کوتان.

٣٣٩٣. تو دودیّ خوه زانی، یەکە هەڤالیّ خوه بزانبه.

٣٣٩٤. تو دڤیّ ببە ئێلمەنیکیّ ڤی خەلاتی.

٣٣٩٥. تو دڤیّ من نانەک خواریە، ئەوی کەریک.

٣٣٩٦. تو دڤیّ من چێکریە، خاچۆ چەمل کریە.

٣٣٩٧. تو دڤیّ سووج سەردا هاتیە.

٣٣٩٨. تو دڤیّ خوون ژ بەلانگووشکیّ بەردانە.

٣٣٩٩. تو دڤیّ خوایێ دۆنزدەهـ کەردی گارسە.

٣٤٠٠. تو دڤیّ هنەکی کاپ ژیّ دزینە.

٣٤٠١. تو دڤی هەڤالیّ مەرڤەکی، برا ئەو مەری سەر تەڕا بە.

٣٤٠٢. تو دبی نانکر، گەنم بکرە،
پەرچە دستینی، چوخ بستینە.

٣٤٠٣. تو دکاری ب خورتی ژ من بستینی،
تو نکاری ب خورتی بدی من.

٣٤٠٤. تو دخازی گوڵەکیّ دو نێچیراخی.

٣٤٠٥. تویێ وا تەشک-پەشکا هەری ئاجاریّ مەشکا؟

٣٤٠٦. تو زەووجیی، ژنا خوه زەعف مەشینە مالا باڤیّ.

٣٤٠٧. تو ژی فریکیّ خوه بەر ئاگریّ من نەقەلینە.

٣٤٠٨. تو کیّ ب شێخ بیّ سیّ، ڕۆژێد ئینیّ پڕن.

٣٤٠٩. تو کیّ تر بوخەی، لیّ بێگەیی بکوژێی؟

(تو هاتی تری بخوی، یان باخڤانچی بکوژی؟)

ئا) تو ل تری دگەڕێی، یا ل کوشتنا نەهتۆڕ؟

٢٤١٠. تو کو دچی دەرەکێڤا، پرسا خوە مەزنێ مالێ بکە، هێژا هەرە.

٢٤١١. تو ل ئاڤێ مەیی بترسە.

٢٤١٢. تو ل کو، مالا دەعواتێ ل کو؟

٢٤١٣. تو مێرخاسی باباخ نەبە.

٢٤١٤. تو من بوخورین، ئەز تە بالێسم.

٢٤١٥. تو نە پنجارا هەر گرارانی.

٢٤١٦. تو ئوسا خوە بپەسن، زانی جن دترسە ژ هەسن.

٢٤١٧. تو پایێ خوە مەدە، برا ئێل پایێ تە بدە.

٢٤١٨. تو ڕاستی مرنا مەلە ناسرێدین هاتی.

٢٤١٩. تو ڕەنگێ نەنێرە سبەختێ وی بنێرە.

٢٤٢٠. تو سەر بینە، کۆلۆز زەعف هەنە.

٢٤٢١. تو سبێ ڕادبی، بێژە: "خوەدێ، پێشیێ بدە جیناری من، پاشێ تو بدی من".

٢٤٢٢. تو خرابیێ قەت شا نەبە،

دلێ بەندا تە خوەش نابە.

٢٤٢٣. تو هار بوو، تێ ب جانێ خوە کەڤێ.

٢٤٢٤. تو چ باڤێژی، تویێ وی ژی بچنی.

٢٤٢٥. تو چ بێژی، ب بەژنا حەیران تێ.

٢٤٢٦. تو چ بچنی، تویێ ئەوێ کۆدا خوە دا بڤینی.

٢٤٢٧. – تو چ دچینیی؟

– وێ شین بە تویێ بڤینیی.

٢٤٢٨. تو چ ژی بێژی هینسانێ بێئاقل دوو بایێ خوە دچە.

٢٤٢٩. تو چقاسی ژی دەرگێ هەسنی بی، دیسا شوخولێ تە ئێ بکەڤە دەرگێ دارین.

٢٤٣٠. تو شێری یان ڕووڤی؟

٢٤٣١. تو وەرە دەوێ من بکیێ، ئەز ژی یێ میرا بکیێم.

ئا) تو وەرە شوخولێ من، ئەز هەرم شوخولێ جینارا.

٢٤٣٢. تراكتۆر هاتن، جۆتێد كەڤن هەلاتن.

٢٤٣٣. تماخكارۆ - گونەكارۆ.

٢٤٣٤. تماى دڤە كيماى.

ئا) تماتى - كيماييە.

٢٤٣٥. تمايێ تو مايى.

ئا) تمايى - رێ مايى.

٢٤٣٦. تماى جەگەرا ددە پاش.

٢٤٣٧. تنگ و تنگ دەعواتە،

نان و گۆشت لێ هسرەتە.

٢٤٣٨. ترى خۆشە د وەختێ خودا .

٢٤٣٩. ترسا گورا زكێ سا دەرناكەڤە.

٢٤٤٠. ترسا سا زكێ گورادانە.

٢٤٤١. ترس كو هەيە، برێ رووڤييە.

٢٤٤٢. ترس مەرگى رووڤييە.

٢٤٤٣. تشتا بينە ب جانى،

گاڤا پير بوو تو زانى.

٢٤٤٤. تشتێ ب لەز،

ناگيژە مراز.

٢٤٤٥. تشتێ doorە، ب نوورە.

٢٤٤٦. تشتێ ئەمەنەت، تارى قيامەت.

٢٤٤٧. تشتێ خودێ دكە، باتال نابە

٢٤٤٨. تشتێ چووى پەى ناكەڤن.

٢٤٤٩. تشتەک كۆ گرت ب شيرى،

بەرنادە حەيا پيرى.

٢٤٥٠. تشتنەديتييا تشت نەديتن،

گۆلكەک ديتن كراس لێ كرى.

٢٤٥١. تا نەلێيت "باهار"، هاڤين دێ.

(حەتا دڤێژی: "باهار" هاڤین تێ).

٢٤٥٢. تا کێوێک نەروخێ، کەندەلانێک پر نابەتەوە.

(حەتا چیاک نەهەدمە، گەلیک تژە نابە).

ئا) تا کۆسپێک نەرمێ کەندێک پر نابێتەوە.

٢٤٥٣. تالانا تەڤدا دەعواتە، مرنا تەڤدا خوەشە.

٢٤٥٤. تالانێ ئێڤاردا، بەرفا سڤەدا، برا پێشییا دژمنادا بە.

٢٤٥٥. تالاشا گورە قانتر بهایە.

٢٤٥٦. تالەهێ خەلقێ ڕەشە، تالەهێ من ڕەش و بەشە.

٢٤٥٧. تاریکی مانگ سەر لە ئەیوارێ دیارە.

(تاریبوونا شەڤێ ژ ئێڤارێ کڤشە).

٢٤٥٨. تاسا ڤالا چنگین ژێ تێ.

٢٤٥٩. تا ساهیبمال دزی گرت، دز ساهیبمالی گرت.

(حەتا نی خایێ مالێ دز گرت، دز خایێ مالێ گرت).

٢٤٦٠. تاس بشکێ، نەک بزرنگە.

٢٤٦١. تاسەک ژ بەحرێ، لێ خویاناکێ.

٢٤٦٢. تاس کەت، دەنگ ژێ دەرکەت، بشکێ، نەشکێ، یەکە.

٢٤٦٣. تاس چنگیا، چ ڕاست، چ دەرەو؟

ئا) تاس کو زنگیا، ڕاست و دەرەو یەکە.

٢٤٦٤. تاس نە یا حەموو بەندانە.

٢٤٦٥. تاس هاتیە دەستانە،

ئەو سەڤا دانە،

نە سەڤا زکانە.

٢٤٦٦. تا خان ئەسازێ، لەشکەر ئەترازێ.

(حەتانی خان خوە هازر دکە، ئەسکەر دچە).

٢٤٦٧. تا جێی ڕم نەکەیتەوە، نەیچەقەنیەت.

(حەتانی جیێ ڕمێ کڤش ناکە، ناڤێژە).

٢٤٦٨. تێلەکی بکشینی، سەد پینە لێ دکەڤە.

٢٤٦٩. تێر ئاگای له برسی نیه.

(تێر هاش ژ برچی تونه).

٢٤٧٠. تێرخارنا ئێتیما ڕۆژا عەیدایە.

٢٤٧١. تێر کر چار جوهور.

٢٤٧٢. تەف بکن، تەف بخوون.

٢٤٧٣. تەڤی دۆستا جۆت بکە، ئارشڤێرشێ مەکە.

٢٤٧٤. تەڤی دژمنا ڕێوییتیا مەکە.

٢٤٧٥. تەڤن کو هاتە دارا، نامینە ل وارا.

٢٤٧٦. تەڤن ل دارا.

مال ما ل وارا.

٢٤٧٧. تەزە بیە بەرخەکی بەرخگەلا.

٢٤٧٨. تەزە پێکەتیە، دمینا نەکە.

٢٤٧٩. تەزە هاتن، کەڤن خالاتن.

ئا) تەزا دڤینن، کەڤنا بیر دکن.

٢٤٨٠. تەمیا من تە ڤە، حەلالێ خوە حەرامێ خەلقێ مەشۆ.

٢٤٨١. تەنێبوون تەنێ خومدێڕا خوەشە.

ئا) تەک خومدێی بێ شریکی بێ هەڤالە.

ب) شریک خومدێڕا نایێنە چێکرنێ.

٢٤٨٢. تەنێ گۆڕا تەزە نە پاکە.

٢٤٨٣. تەنوور تا گەرمە، نان ئەبرژێنێ.

(حەیا تەندوور گەرمە، نانێ بپێژە).

٢٤٨٤. – تەرزیۆ، مالا بارکە.

گۆ، – دمرزیا من سەرێ مرانە.

٢٤٨٥. تەخت – بەخت؟

٢٤٨٦. تەو لۆ دلۆ،

چ تێ سەرێ من، حەموو ژ ئاقلێ منۆ.

٢٤٨٧. تەور کلکی خۆی نابرێتەوە.

(تەور دەستوێ خوە نابرە).

٢٤٨٨. تینوو ئاڤ ئەبینە لە خەوا.

(مەرێ تی خەونێدا ئاڤێ دبینە).

٢٤٨٩. تیر ئەخا و کەوان ئەشارێتەوە.

(تیر داڤێژە و کەڤان ڤەدشێرە).

٢٤٩٠. تیر لە کەوان دەر چوو ناگەڕەتەوە.

(گاڤا کۆ تیر ژ کەڤانێ پەکیا، پاشدا نایێ).

٢٤٩١. توبەیی گورگ_مەرگە

(تۆبەیی گۆڕ_مرنە).

٢٤٩٢. تۆزا هنێ نەدە سەر نەینکێ.

٢٤٩٣. تۆم کرد بە جۆلا مەکۆم بدزی؟

(م تە هینی تەڤن چێکرنێ کر، کو تو مەکۆما من بدزی؟).

٢٤٩٤. تۆخمێ خوە خام بەیارا نەرەشینە، تویێ کۆرکێ برەشینیی.

٢٤٩٥. تو دار نینە بایێ لێ نەدایە.

ئا) تو دار تونە با لێ نەکەڤە.

٢٤٩٦. تو کەسی حەتا ناها دەڤە ژ پیا بارکرنە، وەکی ئەز ژی ژێ مامە؟

٢٤٩٧. تو کەس ناڤە دۆستێ کەسیڤا.

٢٤٩٨. تو کەس نینە کولەک نە ل دلدا.

٢٤٩٩. تو ل دەرێ ئار، لێ نوشتی (نشتی) سەکە.

٢٥٠٠. تونەبوون کەڤرێ شینە.

٢٥٠١. تونەبوون کۆتیبوونە.

٢٥٠٢. تونەبوون ڕوورەشیا مەریانە.

٢٥٠٣. تونەدی سیار دڤن،

سەر سیا خوەدا خار دڤن،

وەکی خوەیی ئەسل سێری نەخن،

وێ زووزکا هار بڤن.

٢٥٠٤. تو نەکریا، تویی خراب نایێ پێشیێ.

٢٥٠٥. تو جارا یا هەق یا نەهەق نەدە.

٢٥٠٦. توجار - توجارە، خاپاندن ژێرا کارە (چارە).

٢٥٠٧. تو وەختا گورا ناکنە شڤان.

٢٥٠٨. تبەرکە، نە زکبەرکە.

٢٥٠٩. تڤاقا مەریا هەڤە، دەولەتێ خومخوە بێ.

٢٥١٠. تڤدارەکێ زڤستانێ هاڤینێ ببینە.

٢٥١١. تڤنگ هات، مێرانی هلات.

ئا) تڤنگ دەرکەت، مێرانی ئوندابوو.

٢٥١٢. تزبی دکە ڕەقە - رەق،

دەریا سست دکە چەقە-چەق.

٢٥١٣. تلیا خوە مەکە حەموو قولان، ل ورا هنگی مەعر تێ هەنە.

٢٥١٤. تلیا شریات ببرە، خوون ژێ نایێ.

٢٥١٥. تلیێ دەستا نە وەکە هەڤن.

ئا) تلیێ دەستا حەموو نە یەکن.

٢٥١٦. تلی - پێچیێ بلورڤانا دورڤا کڤشن.

٢٥١٧. تلی - پێچیێ وی زێر دبرن.

٢٥١٨. تلی هەنە تلینە،

تلی ژی هەنە زێرینە.

٢٥١٩. تمێ گێرس خەلایی ڤەگەراندیە.

٢٥٢٠. تم کایێ هلدە تشت ژێ نایێ.

٢٥٢١. تم کووچکا بقۆسین-نابن تاژی.

٢٥٢٢. تمێ تەعڤیا تەیرۆکێ جیکی دکوتە.

٢٥٢٣. تربا مەریا ژی دووری تربا جینارا خراڤ ڤە.

٢٥٢٤. تڤاقا گوندەکی، دەرتێ بەر ئێلەکی.

٢٥٢٥. تڤاقا مەریا کو یەک بە، چیا وێ وەلگەرە.

٢٥٢٦. تڤاقا مووریا چیا دخەشبینن.

٢٥٢٧. تڤاقا ئێلەکێ دەرتێ (دسەکنە) بەر پادشاکێ.

٣٥٢٨. تف كرنه بەڤێ، ل وان كەنيا، گۆ: "رووێ من ژ ئافا بەحرێ شل نەبوويە، ژ تفا وە شل نابە".

٣٥٢٩. تف هەلدەی رووی خۆت ئەگرێتەوه.

(تووی ژۆركی، وێ بكەڤە سەر رووێ تە).

٣٥٣٠. تخوويا خۆرتا تونەيه.

## ف

٣٥٣١. فێدا گاڤانا سياربوونا كەرايه.

٣٥٣٢. فەلەک كەسكيرا نادوومينه.

٣٥٣٣. فەلەک سەرێ مەريا دكه كەلەكا.

٣٥٣٤. فەلەک هنەكارا دكەنه، هنەكارا ژی دگری.

٣٥٣٥. فەلەک چەلخه، چەپ و راست دزڤره.

٣٥٣٦. فەنا ژی زانم، فەنكێ-فەنا ژی زانم.

٣٥٣٧. فەن هات دەردا، فێلارا تركی خەبەردا.

٣٥٣٨. فەرخێن يەک سالێ رادبن هێكێ هەسنی دكن.

٣٥٣٩. فەرخەكی شێرا _ شێره.

٣٥٤٠. فكر و متاله مەريا زوو كال دكن.

٣٥٤١. فلان گوند دەهـ مالن، دۆنزدەهـ رووسپی نه.

٣٥٤٢. فلان تشت دەفتەرا رووڤی يه.

٣٥٤٣. فلانكەسا مه مەريكه ئوسانه، مووريا دەرتێ دكه.

٣٥٤٤. فلانكەسا مه تويێ بێژی دەڤا ژ پيا بار دكه.

٣٥٤٥. فلانكەسا مه هێكا چەمل دكه.

٣٥٤٦. فلانكەسا مه مينا مريشكا سەر كوركايه، ئيچن نادە سەر بيچن.

٣٥٤٧. فلانكەس گليێ دەقنانۆس زانه.

٣٥٤٨. فلانكەس دزەكی ئوسانه، تويێ بێژی كومێ نقتۆكێ سێريدا نه.

٣٥٤٩. فلانكەس دل فراهه، هەسپ و قەسپ جەم وی يەكه.

٣٥٥٠. فلانكەسێ مه ئارڤانێ خەلايێيه.

ئا) فلانكەسێ مە كارسێ خەلايێيە.

٢٥٥١. فلانكەسێ مە با دەرێ وی ڤەدکە، با دەرێ وی دادده.

٢٥٥٢. فلانكەسێ مە بوويە كۆنێ كەڤن.

٢٥٥٣. فلانكەسێ مە بتر بیێ، وێ زوو سەر كەلە بێ.

٢٥٥٤. فلانكەسێ مە ڤۆخۆرمی كەفەندز.

٢٥٥٥. فلانكەسێ مە گەما جنا دەڤێ ویدا نە، دەڤێ وی مالێ وی ڤەناڤە.

٢٥٥٦. فلانكەسێ مە گورە كەتیە پۆستێ بەرخا.

٢٥٥٧. فلانكەسێ مە دەرێ توورێ وی ڤەكی، هەر بێشەیی بێژی تێ دا هەیە.

٢٥٥٨. فلانكەسێ مە دەرەوا دكە، جی ناینە.

٢٥٥٩. فلانكەسێ مە دیكێ وی بەرژێر بانگ دایە.

٢٥٦٠. فلانكەسێ مەیێ وێ ئوسا ئاخكە، بەنێ پشتا ویێ بڤەتە.

٢٥٦١. فلانكەسێ مە ئەز دكمە بەروێرا گێ،

ئەو دڤە دوويەنا كەرێ.

٢٥٦٢. فلانكەسێ مە زار دۆستی، دل دژمنە.

٢٥٦٣. فلانكەسێ مە – ئوسایی ڤورەیە، تو یێ بێژی ئاغێ سەد مال مرتڤی بێ نانی بێ ئارڤانە.

٢٥٦٤. فلانكەسێ مە كی ئالی تەعڤە، وی ئالی عەڤا (ئەبا) خوە ڕادخە.

٢٥٦٥. فلانكەسێ مە مەریكی با بەر پێشێ كەتیە.

٢٥٦٦. فلانكەسێ مە مەریكی ئوسانە، سڤرا وی هەرۆ ڕاخستییە.

٢٥٦٧. فلانكەسێ مە مەریكی سولهەدارە.

٢٥٦٨. فلانكەسێ مە مەریكی سمێل سووباشی، مال مرتڤە.

٢٥٦٩. فلانكەسێ مە مێرەكی چێیە، فەلەكا وی ژ خەو ڕاناڤە.

٢٥٧٠. فلانكەسێ مە مەریكی چل بێشەرە.

٢٥٧١. فلانكەسێ مە مەعر بوو، نها بوويە مەعرگیسک.

٢٥٧٢. فلانكەسێ مە مینا ئاگرێ جەعنمێیە.

٢٥٧٣. فلانكەسێ مە مریێ خوە زێرین هەساب دكە، مریێ خەلقێ دارین هەساف دكە.

٢٥٧٤. فلانكەسێ مە ناڤا جمعەتێدا خوە كریە چەرچی.

٢٥٧٥. فلانكەسێ مە نانێ وی بێ خوێیە.

٢٥٧٦. فلانكەسێ مە نێن دڤینە، دێو ناڤینە، دێو دڤینە نێن ناڤینە.

٢٥٧٧. فلانكەسێ مە نێن ژ مرتڤا دخومزە.

٢٥٧٨. فلانكەسێ مە نە كورێ باڤێ خومیە ئی بەراندزە.

٢٥٧٩. فلانكەسێ مە پۆلكەک دێست كەتیێ جی تونە تێدا ڤەشێرە.

٢٥٨٠. فلانكەسێ مە پارسێ مرتڤا هینبیە.

٢٥٨١. فلانكەسێ مە ڕووتەكی ئوسانە ئی ئیمان چیپلاخییە.

٢٥٨٢. فلانكەسێ مە سەرێ خوە دبرە، زمانێ خوە نابرە.

٢٥٨٣. فلانكەسێ مە سەرێ خوە دشكێنە، خەبەرا خوە ناشكێنە.

٢٥٨٤. فلانكەسێ مە سەر مرێ فلانكەسێ ئوسا گریا، هێسرێ خوە پێ ستریا تەمز كرن.

٢٥٨٥. فلانكەسێ مە سریا مە هات، مە دمڤێ خوە كرە چچكێ دیا وی مێت، سریا وی هات ئەوی دمڤێ خوە كرە چچكێ دیا مە گەست.

٢٥٨٦. فلانكەسێ مە تویێ بێژی مالا وی ژی مالا كەلۆیێ هامۆیە.

٢٥٨٧. فلانكەسێ مە خارنا وی هازر بوو ژی، كەوچیێ وی نەگهیشتە دێڤ.

٢٥٨٨. فلانكەسێ مە خوون لێ دگەرە، دخومزە خوە بدە كوتانێ.

٢٥٨٩. فلانكەسێ مە هەیە، پێ ناڤە بوخوە.

٢٥٩٠. فلانكەسێ مە هەمەڤێ دەورا بەرێ یە.

٢٥٩١. فلانكەسێ مە هەوا پێ كەتیە، كەسی بەر تشتەكی هەساڤ ناكە.

٢٥٩٢. فلانكەسێ مە هەو زانە قوتیا تتوونا وی بوویە كیسكێ ڕەسێ بەكۆ.

٢٥٩٣. فلانكەسێ مە حەیف شیرێ شێرە، عەیارێ بزنێدا یە.

٢٥٩٤. فلانكەسێ مە ئوسا بوویە، مینا ڕووڤیێ مەها حەزیرانێ.

٢٥٩٥. فلانكەسێ مە ئوسای بوخدانبێژە، عەرد و عەزمان ڕابەری هەڤ دڤن.

٢٥٩٦. فلانكەسێ مە ئوسای ڕووتە، فەرهقا وی مێش ناگرە.

٢٥٩٧. فلانكەسێ مە ئوسای خراڤە، بەلكی با كەفەنێ وی برەڤینە، سە ئاڤا وی بچەلپینە.

٢٥٩٨. فلانكەسێ مە ئوسای قورمیە، هەرتم سەر سیا خومدا تەماشە دكە.

٣٥٩٩. فلانکەسێ مەیی ئوسانە، ستارا شەڤێ لێ حسرەتە.

٣٦٠٠. فلانکەسێ مە شریکا خوەدێرا ژی چێدکە.

٣٦٠١. فلانکەسێ مە ئێل وی دپەسنە.

٣٦٠٢. فلانکەسێ مە قازنجا وی خورێ تەیر و تویایە.

٣٦٠٣. فلانکەسێ مە قورەبوونا خوە سیا خوە پشدکە.

٣٦٠٤. فلانکەس، ئەز کۆدکا خوە تژی کۆدکا تە ڤالا ناخم.

٣٦٠٥. فلانکەسی زانەیە، ل رەش – سپی دنهێرە.

٣٦٠٦. فلانکەسی ئوسای کەسیڤە، نەینووک تونە خوە بخۆرینە.

٣٦٠٧. فلانکەسی ئوسای رووتە و لەلاشایە.

٣٦٠٨. فلانکەس مەردێ ژ کیس خەلکێیە.

٣٦٠٩. فلانکەس مەریکی ئوسانە، دێلا خوە حەموو قولادا رووت کریە.

٣٦١٠. فلانکەس مەریکی ئوسای خراڤە، خوەدێ گر بدێ، نەینووکا ژێ بستینە.

٣٦١١. فلانکەس مەریکی ئوسانە، حەیشتێ حەزار دمق–شەق لێ کەتنە.

٣٦١٢. فلانکەس مینا بووکەکە روو ب خێلی.

٣٦١٣. فلانکەس ئوسا بوویە، تویێ بێژی چرا دێرێ دزیە.

٣٦١٤. فلانکەس رسقێ سەر پشتا خەزالێ ڤە، بکە–نەکە پێرا ناگهیژە.

٣٦١٥. فلانکەس سەد چر ئاڤ پشتا گوهێ وی شل ناکن.

٣٦١٦. فلانکەس، تو مینا نانێ سێلێ دو روویی.

٣٦١٧. فلانکەس، فلانکەسێ مە جل و کولاڤ ژ هەڤ بشکاڤت.

٣٦١٨. فلانکەس، خوە زەعف با مەکە، ئەز زانم تو گۆلکێ کیژان چێلەکێیی.

٣٦١٩. فلانکەس خوە خوە قژکە، مەشا وەردەکێ رێ دچە.

٣٦٢٠. فلانکەس خراڤەکی ئوسانە، تو خراڤا پێ ل رێچا وی نەکریە.

٣٦٢١. فلانکەس هەڤالێ رۆژا خوەشە، نە هەڤالێ رۆژا رەشە.

٣٦٢٢. فلانکەس هەڤالنە ئوسانن، تەڤ کراسەکیدا دکەرن.

٣٦٢٣. فلانکەس هەڤالنە ئوسانن، تەک نڤینا شەڤێ ژەڤ باشقەنە.

٣٦٢٤. فلانکەس شەرێ (بوخدان) عەجەمیە.

٣٦٢٥. فلانکەس شیر بەر بێریا مرتڤا ژی درژە.

٣٦٢٦. فلانکەس وەک سەیێ نەقەبا هەردو دێرا.

٣٦٢٧. فلان ماقوولێ (ئاغا، بەگ) مە خوەش مێڤانە، نە تو قوناخە.

٣٦٢٨. فلان تشتێ مالا فلانکەسێ بوویە برنجێ مالا خەیبێ.

٣٦٢٩. فرۆشتن لە خواستن چاکترە.

(فرۆتن ژ خوەستنێ چێترە).

٣٦٣٠. فرا کەوۆکێ ئەیینتربە.

٣٦٣١. فرینا مریشکێ حەتا کادینێ.

٣٦٣٢. فرسەندێ ژێ گرت، فووت نەکە.

٣٦٣٣. فتارا خوە بخوە ب تەنێ، تەعنشتییا خوە ب هەڤالارا، شیڤا خوە بدە نەیارا.

## خ

٣٦٣٤. خازیا من مەها بیستێ زڤستانێ، نە بیستێ حەزیرانێ.

٣٦٣٥. خازی خاسی تونەبوونا،

بووک ب دلێ خوە بوونا.

٣٦٣٦. خازلا منە وی عەقدیدا هاتی، گلێ خومیی پاشیێ پێشییێ ناڤێژە.

٣٦٣٧. خازلا سێویا، نە هێویا.

٣٦٣٨. خازل ئەز وەلاتێ خوەدا بیاما، کووت باڤێتانا بەر من.

٣٦٣٩. خازل ڕیا گوندا چاوا دچوو گوندا، ڕیا دلا ژی ئوسا بچوویا دلا.

٣٦٤٠. خایا دنهێرن، هەسپێ نال دکن.

٣٦٤١. خایا خێرا، ڕەبەنا دێرا.

٣٦٤٢. خایێ بزنەکێ بزنا خوە نەخار.

٣٦٤٣. خایێ گاکی، جۆتێ وی ناڤە.

ئا) خایێ گاکی مالا وی چۆلێ دمینە.

٣٦٤٤. خایێ گۆشت ژی زانە گۆشت گەنییە.

٣٦٤٥. خایێ زێرا زێرا ناخوە.

٣٦٤٦. خایێ کراسێ خوە نینە.

٣٦٤٧. خایێ خەیبێ یان سەر خێنییە، یان بەر دێرییە.

٣٦٤٨. خایی مالۆ – خایی خووچۆ، خایی خالۆ،

بێ مالۆ – بێ خووچۆ، بێ خالۆ.

٣٦٤٩. خالیا مەریا شیرێ دییا مەریا زێدەترە.

٣٦٥٠. خالیا خەریڤا مەریاڕا ناڤە خالی.

ئا) خالیا خەریڤا ڕاکی،

عەمرێ خوە تێدا جوداکی،

ئاخر – ئۆخر تێ ڕۆژەکێ ئونداکی.

ب) خالیا خەریبا، مەزەل ژی نادە مەریا.

٣٦٥١. خالی سەرێ وی مێریبە، وەکی بکەڤە بن شیرەتا.

٣٦٥٢. خانی ب کەڤرەکی ناتێ گرتن.

٣٦٥٣. خان و قووچ، حەموو پووچ.

٣٦٥٤. خانما من، من تو ل ژێر ژی دیتیە، ل ژۆر ژی دیتیی.

٣٦٥٥. خارەکی، دیڤەکی،

بڤنە جەم گەدەکی،

هەردو قیمەتەکی (پەرەکی).

٣٦٥٦. خارزیا مەکنە کەڤر، مەکنە بن کوژێ تێرا خوە.

٣٦٥٧. خارزی ژ خالا،

کوری ژ فەلا.

ئا) خارزی دچن خالا،

ب) خارزی ل خالا دچن.

٣٦٥٨. خارزی کەت، خالانا ڕاکر.

٣٦٥٩. خاریا مەرڤ ژ عەمەلێ مەرڤە.

٣٦٦٠. خار ڕوونێ، ڕاست دەنگکە.

ئا) خار ڕوونە، ڕاست بشتەخلە.

٣٦٦١. خارنا زەعف زکێ مەریا دێشینە.

٣٦٦٢. خارنا زکا ڕەنگ – ڕووێ مەریاڕا کڤشە.

٣٦٦٣. خارنا پارا من تێ تونە ڤە، برا خورێ کووچکا ڤە.

٣٦٦٤. خارنا تەڤ هەڤالا شیرنە.

٣٦٦٥. خارنێ ژی کۆمەک لازمە،

خەڤاتێ ژی کۆمەک لازمە.

٣٦٦٦. خاستیپا رووکی رەشە، نەدایا هەردو روو

٣٦٦٧. – خاستنا کۆری چییە؟

– دو چەعف.

٣٦٦٨. خاسوو هەنە باشن، بووک ژی هەنە نەباشن.

٣٦٦٩. خاتیپا گوهارێ،

خاری نەخاری تەڤ دەرکەتنە باهارێ.

٣٦٧٠. خاچ ئاڤێدا خێر ناکە.

٣٦٧١. خێنیێ تاڤ بکەڤێ، تختۆر ناکەڤێ.

٣٦٧٢. خێرا بکە ڕێدا بەردە، ئەو جیێ خوە دبینە.

ئا) خێرا بکە و ب ئاڤێدا بەردە.

ب) خێرا بکە، داینە سەر کەڤرا، هەرە.

ڤ) خێرا خوە بدە سەر کەڤرا، خێر خو خایا ناس دکە.

٣٦٧٣. خێرا ڤی دەستی وی دەستیڕا تونە.

٣٦٧٤. خێر بێی، وەکە دوهـ نا پێر بێی.

٣٦٧٥. خێر بن حەفت دەستاڕا دەرباز دبە، دیسا قەبوولە.

ئا) خێر بن حەفت دەستاڕا دەرباز دبە.

٣٦٧٦. خێرێ بکە، مالا خوەدا نەمرە.

٣٦٧٧. خێرێ بخوەزە، خێر بێ پێشیا تە.

٣٦٧٨. خێر کرێ، مالا خوەدا نەمرێ.

٣٦٧٩. خێر تێ ب رێز،

شەر تێ حەمێز.

٣٦٨٠. خەبات کەرە، بازۆ هەرە.

٣٦٨١. خەبات جەواهرا دلێ ئەیسێنە.

٣٦٨٢. خەبات شێرە، دەست باڤێژێ، دبێ رۆڤی.

٣٦٨٣. خەباتچیێ خوە بە، شیرنێ خەلقێ بە.

٣٦٨٤. خەبەرا بنێ جڤاتێ مەبە سەرێ جڤاتێ.

٣٦٨٥. خەبەرا کەتە ناڤا سی و سێ درانا،

وێ بکەڤە ناڤا سی و سێ شارستانا.

٣٦٨٦. خەبەرا خەلکێ ڕانەبە-ڕووەنێ، ب خەبەرا خوە ڕابە-ڕوونێ.

٣٦٨٧. خەبەرا خوەش باهارا دلانە.

ئا) خەبەرێ خوەش، باهارا دنێیە.

٣٦٨٨. خەبەرێ خوە با حەمی کەسی نەبێژە.

٣٦٨٩. خەبەرێ خوەش، ژ قولێ دەردخە مارێ ڕەش.

٣٦٩٠. خەبەرا قەنج هەر و دایم دمینە ل ڕووێ دنیایێ.

٣٦٩١. خەبەرێ ئێڤارا دکەڤە قولێ دیوارا.

٣٦٩٢. خەبەرێ مێرا کو هەیە، دورە.

٣٦٩٣. خەبەرێ نەکەسا_تیرێ قەجەرینە.

٣٦٩٤. خەبەرێ تو خوەش خەبەری، لێ نەزانا تو ئانین.

٣٦٩٥. خەبەرێ خراب مینا تیرانا.

٣٦٩٦. خەبەر، خەبەرا ڤەدکن.

٣٦٩٧. خەبەر هەنە زێرن

خەبەر ژی هەنە ئاڤا جێرن.

٣٦٩٨. خەڤاتچی نامینە برچی.

٣٦٩٩. خەزال وەکی نەبەزە، نکارە ڕسقێ خوە بخوە.

٣٧٠٠. خەیسەتێ باڤێ سفەتێ کور دا تێ خانێ.

٣٧٠١. خەیسەتێ پیس خەزمڤا خوەدێیە.

ئا) خەیسەتێ پیس خشما خوەدێیە.

٣٧٠٢. خەیسەتێ خوە دوگهێزی، قۆناخا خوە نەگوهێزە.

٣٧٠٣. خەیسەتێ جاهلا تێ تەرکداینێ،

خەیسەتێ مەزنا نایێ تەرک داینێ.

٣٧٠٤. خەلایی هات، مەرڤایی هلات.

ئا) خەلای هات، خوە جامێری هلنەهات؟

٣٧٠٥. خەل ژ خەبەرا خۆش نارمڤە.

٣٧٠٦. خەلقێ مێر کر، فرۆ فرکر،

من مێر کر، کەزی - گولی کورکر.

٣٧٠٧. خەلقێرا گولە، خوەرا کولە.

٣٧٠٨. خەلقێرا مەعسیگرن، خوەرا کووسیگرن.

٣٧٠٩. خەلق مال و دەولەت چێدکە، ئەز و ئاندرۆ کۆلۆزێ خوە تووژ دکن.

٣٧١٠. خەما بەرفێ نینە، دەبرا کەسیڤا تونە.

٣٧١١. خەما گورە، وەکی دەڤە باهایە؟

٣٧١٢. خەما کۆرە، مووم باهایە؟

٣٧١٣. خەما کۆرە، چرا ڤێسیا؟

٣٧١٤. خەما هلنەینە، خەم خرابن.

٣٧١٥. خەمێ من زەعفن، دەردێ تە گەلەکن.

٣٧١٦. خەنجەر - برایە، تڤنگ پسمام.

٣٧١٧. خەنجەری دەبان خۆی لە کێلانا ناگرێ.

(خەنجەرا دەبان، کالانێدا نامینە).

٣٧١٨. خەنجەر لە کا ئەدا.

(ب خەنجەرێ ل کا دخە).

٣٧١٩. خەرافیا نەکە، نەیێ پێشیا تە.

٣٧٢٠. خەریبێ نێزیک مەریارا دڤە دۆست.

٣٧٢١. خەرجێ خوە ژی ددێ و سەرێ خوە ژی دشکێنە.

٣٧٢٢. خەسوو لە گەل تۆمە، بووکێ تۆ گوێت لێ بێ.

(خاسی ژ تەرا مە، بووکێ تو گوهـ بدێ).

٣٧٢٣. خەتا خار ژ بن کایێ پیرە.

ئا) خەتا قەلپ بن کایێ مەزن دانە.

ب) خەتێ خراب ژ کایێ پیرە.

٣٧٢٤. خەتەکێ زێدە باڤێژە بەیارا،

ئەچە بەر دەرێ نەیارا.

٣٧٢٥. خەوا کوشتیا تێ، لێ خەوا برچیا نایێ.

٣٧٢٦. خەوا پر گران،

مەری زەعف نەزان.

٣٧٢٧. خەوا پر – رسقبرە.

٣٧٢٨. خەوا خوەشە ل چایرێ، بەر زنارا، وەکی مەعر تونەبە.

ئا) ڕازانا بەر سیا قەیێ خوەشە مەعر تونەبە.

٣٧٢٩. خەو برایێ مرنێیە.

ئا) خەو و مرن یەکە.

٣٧٣٠. خەو ژ هەسن گرانترە، شێکر شیرنترە.

٣٧٣١. خەو کافرە.

٣٧٣٢. خەونێ شڤاتێ،

بایێ بەر پیرەڤاتێ،

حەزارا یەک نایێ جڤاتێ.

٣٧٣٣. خەو نەما ل چووکا،

قوماش نەما ل سووکا،

شەرم نە ما ل بووکا،

ئا) خەو نەما ل بچووکا،

فەدین نەما ل بووکا.

٣٧٣٤. خەو و کەو هەردو دەستێ مەرڤ ناکەڤە.

٣٧٣٥. خیبالا برچیبان_نانە.

٣٧٣٦. خیرەتێ ئاڤێتن بەر سێ، تاخبوور نەکر.

٣٧٣٧. خۆی لێرمیە و کلکی لە بەقدا تۆز ئەکات.

(خوە ل ڤرە، لێ پۆچا وی ل بەخدایێ تۆزێ ڕادکە).

٣٧٣٨. خۆی مامرە و هێلکەی قاز ئەکات.

(خوەخوە مریشکە، لێ هێکێ قازا دکە).

٣٧٣٩. خۆی ڕیشی نیە و بە کۆشتە پێ ئەکەنێ.

(رووێ وی تونه، لێ سەر کۆسه دکەنه).

٣٧٤٠. خۆرتێ بچووک ب سالا،

ئەوە کوندر والا.

٣٧٤١. خۆرتێ گەریایی کالێ زمانا چێترن.

٣٧٤٢. خۆرتێ سەرت حەتا بێ سەر حەمدێ خوە، حالێ وێ دبە حالێ سە.

٣٧٤٣. خۆرتەکی زانە، بەرمبەری سەد مێرێ نەزانە.

٣٧٤٤. خۆرتۆ، مەرحەبە،

جل چوو، ما ئابیە.

٣٧٤٥. خۆرت هەنە گولا گۆڤەندانە.

٣٧٤٦. خۆرت حەتا خوە نەحسە،

مینا ڤارکا دمەلسە.

٣٧٤٧. خۆشیا مەرڤ د سەحەتا مەرڤدایە.

٣٧٤٨. خۆشیا مەرڤ، عەمرێ مەرڤە.

٣٧٤٩. خۆف کێشۆ، قەدا پێشۆ.

٣٧٥٠. خودانێ لەزێ هەر پۆشمانە.

٣٧٥١. خودانێ جاناگا نامینە شوونا وارا.

٣٧٥٢. خولامێ بێ تیمار ناڤێ ئاغا خراڤ دکە.

٣٧٥٣. خولامێ مالا خوە بە، نەک ئاغێ سڤرا خەلقێ.

٣٧٥٤. خولی ل سەرێ وی سواری، کو ناگهێ پەیایێک.

٣٧٥٥. خورمە ئبێی بۆ بەسرا؟

(خورمە دبی بەسرێ؟)

٣٧٥٦. خورتارا سینۆر تونە.

٣٧٥٧. خورتا خورتتر ژی هەنە،

٣٧٥٨. خوونا نەهەق عەردێ نامینە.

٣٧٥٩. خوون بەر خوونێ ڤا زەلال دڤە.

ئا) خوون ب خوونێ تێ شووشتن.

٣٧٦٠. خوون ژ دل تێ.

٣٧٦١. خوون ژ نەینۆک تێ.

٣٧٦٢. خوونکا دێرا ژی کێم دڤە.

٣٧٦٣. خوون خوونێ نایێ شووشتن،

خوون ب ئاڤێ تێ شووشتن.

٣٧٦٤. خوون نابە ئاڤ.

٣٧٦٥. خوون ئوندا نابە.

٣٧٦٦. خزان حالێ خزانا زانە.

٣٧٦٧. خزم ئەگەر گۆشتت بخوات ئەیسێقانت ناشکێنێ.

(مەریێ تە گۆشتێ تە ژی بخوە. هەستوێ تە ناشکێنە).

٣٧٦٨. خزمی ژنان بەرە - بەرە،

خزمی مێردان دەربەدەرە.

(مەریێ ژنێ بەرە - بەرە،

مەریێ مێرێ دەربدەرە).

٣٧٦٩. خنامی - گەرمە - گەرم،

نەیاری - نەرمە - نەرم.

٣٧٧٠. خرابیا ژن و مێر ژ نەزانینا وانە.

٣٧٧١. خرابکرن ڕەحەتە، لێ ئاڤاکرن زەعمەتە.

٣٧٧٢. خراڤیا کەلێ ناڤ کەلێدا چێدڤە.

٣٧٧٣. خراڤیا مالەکێ،

ئاڤایا گوندەکێ.

٣٧٧٤. خراڤیا مەریا مەریا ڤا نایێ کڤشێ.

٣٧٧٥. خراڤیێ هەر کەس دکارە بکە، قەنجی چەتنە.

٣٧٧٦. خوایێ بێ مال هەیە، مالێ بێ خوەی تونە.

٣٧٧٧. خوا لە سولتان ماحموود گەورەترە.

(خوەدێ ژ سولتان مەحموود ژی مەزنترە).

٣٧٧٨. خوا پێ بە مار نەدات.

(خوەدێ پێ نەدە مەعر).

٣٧٧٩. خوا ڕاسته و ڕاستی لێ خۆش دێ.

٣٧٨٠. خوارزا خال ڕاکره،

برازا مام ونداکره.

٣٧٨١. خواستن ڕوورەشیکه، نەدان دو ڕوورەشییه.

٣٧٨٢. خوا قەزەب بگرێ له بزن، نانی شوان ئەخوات.

(خوەدێ خەزەبا سەرێ بزن بگەره، بزن نانێ شڤان دخوه).

٣٧٨٣. خوا قەزەب بگرێ لێ مێرووله بالی لێ ئەروێنێ.

(خوەدێ خەزەبا مووریا بەخوەزه، بالا ددێ).

٣٧٨٤. خوەدێ بکه، مەڵەیێ چ بکه؟

٣٧٨٥. خوەدێ برا کورێ خراب نەده مەریا.

٣٧٨٦. خوەدێ گۆتیێ: "ئەزێ دنیاکێ چێکم،

هنەک برچیبا بلەوزن،

هنەک بەرێ دیوارا بدەلزن،

هنەک ژی ناڤا خاره دیڤەدا ڤەگەڤزن".

٣٧٨٧. خوەدێ گۆتییه: "ئەز هەر تشتی دکارم، نەزمرا چەعڤا نکارم".

٣٧٨٨. خوەدێ گۆتییه: "من بەرمکەت، ژ ته ژی هەرمکەت".

٣٧٨٩. خوەدێ گۆشت دده مەرڤێ بێ دران.

٣٧٩٠. خوەدێ دایه، مرجێ زایه.

٣٧٩١. خوەدێ دەرد دانه، دەرمان ژی دانه.

ئا) خوەدێ دەرد دده، سماقا ژی بەر دده.

ب) خوا دەردیش ئەداو، دەرمانیش ئەدات.

٣٧٩٢. خوەدێ دوور دکه، (لێ) دەرموین ناکه.

٣٧٩٣. خوەدێ دوور دکه، لێ بیر ناکه.

٣٧٩٤. خوەدێ دڤێ: "من دەست، پێ، چەعڤ دانه ته،

پێشیا ته ئاڤ، ئاگره، خوه ناڤێژێ".

٣٧٩٥. خوەدێ دده ب عەلبا مەزن.

٣٧٩٦. خوەدێ دده، خوەدێ دبه.

٣٧٩٧. خومدێ د قەلپانە، نە ب زارانە.

٣٧٩٨. خومدێ عەرەبانێ مەڕا بن ڕێکێ نەخینی.

٣٧٩٩. خومدێ ژ مەریا بستینە، درانێ مەری پشرووکێ دا دشکێ.

٣٨٠٠. خومدێ زانە شوون کیژانە.

٣٨٠١. خومدێی ب کێفا خومیە.

٣٨٠٢. خومدێ یار بە، بلا شوور دار بە.

٣٨٠٣. خومدێ یار بە، برا دنیا تەڤ نەیار بە.

٣٨٠٤. خومدێ یا هەق نەدە یا نەهەق.

٣٨٠٥. خومدێ یەکە، دەرگە حەزار.

٣٨٠٦. خومدێ کەلا چێکریە سەڤا مێرا، نە سەڤا ژنا.

٣٨٠٧. خومدێ کو ددە سەر هەڤ ددە.

ئا) خومدێ کو ددە هەر ئالی ددە.

٣٨٠٨. خومدێ کو دستینە، سەر هەڤ دستینە.

٣٨٠٩. خومدێ کو ئەز دۆر گەریامق، قەرتەل ژی قوولێ تە یە.

٣٨١٠. خومدێ کو ژ مەریا بری، سەیێ مەرییا هار دڤە ب کولینا مەریا دکەڤە.

٣٨١١. خومدێ ل تایێ کەتیایە.

٣٨١٢. خومدێ مەرییا ژ ئەقل مەهرووم نەکێ.

٣٨١٣. خومدێ مەریا ژ مالا مەریا شەرمی نەکە.

٣٨١٤. خومدێ مەری ژ نەزمرا چەعڤا خلاسکە.

٣٨١٥. خومدێ مەریا ژ نەفەرێ مەریا ڕوورەش نەکە.

٣٨١٦. خومدێ مەریا فەعش نەکە،

فەعش کر، کاش نەکە.

٣٨١٧. خومدێ ڕیا ڕاستا ڕاستکە، مینا ڕیا هاجەرێ، ڕیا خارا خارکە، مینا ڕیا نەمرووت.

٣٨١٨. خومدێ ڕسقێ گورێ کۆر کولەکێڕا دگهینە.

٣٨١٩. خومدێ ساخێ، دلێ ڕاستە.

٣٨٢٠. خومدێ تا ئالا دوور دکە، دەرمو نەکە.

٣٨٢١. خوەدێ تامارێ عەنییێ مەرییا نەدەتینێ.

٣٨٢٢. خوەدێ تو سیارا پەیا نەکە، تو پەیا ژی سیار نەکە.

٣٨٢٣. خوەدێ تەختێ دژمن دەڤەرووخە.

٣٨٢٤. خوەدێ فرسەندێ شێرا نەکێ ڕووڤیا.

٣٨٢٥. خوەدێ فەرسەنگێ نەدە مەریێ بێ فەرسەنگ.

٣٨٢٦. خوەدێ خێر بدە خێرخازا.

٣٨٢٧. خوەدێ خراڤ بکە بێریا بزنا، جڤاتا ژنا.

٣٨٢٨. خوەدێ خراب بکە خنووک،

چا خاسوو، ئوسا ژی بووک.

٣٨٢٩. خوەدێ هەیە، مە مالێ فلانکەسێ ئوسا خاریە، وەکە شیرێ دیيا خوە.

٣٨٣٠. خوەدێ هەڤسا مەرڤ بکە ژ زالما.

٣٨٣١. خوەدێ هەڤسا مەرڤ بکە ژ نەبوویا ژنەبیا.

٣٨٣٢. خوەدێ هەیە، خەم تونەیە.

٣٨٣٣. خوەدێ هەقیێ نەهەقیێ نەدە.

٣٨٣٤. خوەدێ هەولا وان ژ دەولێ ئاڤیتبوو.

٣٨٣٥. خوەدێ چیا بێ ڕەشکۆن نەکە،

ڕەشکۆنا ژی بێ چیا نەکە.

٣٨٣٦. خوەدێ چیا دڤینە، بەرف لێ داتینە.

ئا) خوەدێ چیا دبینە، بەرفێ سەر داتینە.

ب) خوا تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکەت.

٣٨٣٧. خوەدێ چیا ژی تەنێ نەکە.

٣٨٣٨. خوەدێ شاشی کریە، میرەتا جینار نەدایە جینار.

٣٨٣٩. خوەدێ شەر دایە بۆنا مێرا.

٣٨٤٠. خوەدێ وەکی بدە مەریا،

مریشکا کۆر ژی کارێ ددە مەریا.

٣٨٤١. خوە دەریێ خەلقێدا مەجێربینە، خەلقێ دەریێ تە بشکێنینە.

٣٨٤٢. خوە گران بگرە، سڤک نەبە،

دستێ خەلقێ شڤک نەبە.

٣٨٤٣. خوە ئەز نە ئۆنجەمە، سالێ پێنج جارا بدروون.

٣٨٤٤. خوەزی ب مالێ مرتڤان،

نە ب مالێ زالمان.

٣٨٤٥. خوەیی ئەسلا ئەز ب گۆڕی،

مەریێ بێ ئەسل مینا کەرێ ستو مۆری.

٣٨٤٦. خوەکریا دەرمان نابە.

٣٨٤٧. خوە ل بووشییێ بەر بارانێ شل دکە.

٣٨٤٨. خوە مەدە بەر دیوارێ دەرزی (کەتی)

٣٨٤٩. خوەندکارە - نە بێ کارە.

٣٨٥٠. خوەندن - رۆناییە، جاهلی - تاریبوونە.

٣٨٥١. خوە تێکی چرا، بەر بشخولی، دیسا ئەوە.

٣٨٥٢. خوە خوەیکە، پێ خوە مەکە ئاگر.

٣٨٥٣. خوەخوەتی تەعلە.

٣٨٥٤. خوەخوەتی حال زەواج، تەعلایا تتوونێیە.

٣٨٥٥. خوەخوە خوە پەسنی.

٣٨٥٦. خوەش بە ئوعەزێر،

تونە گزێر؟

ئا) خوەش بە خان،

چما تونە گۆشتێ بەرخان.

٣٨٥٧. خوەشی ئەوێ و خۆرماشی ئەوێ.

٣٨٥٨. خوەش خەبەرە، هەما مەلۆ گۆتیە.

٣٨٥٩. خوەش وەلاتە، قازیێ هەقیێ تێ تونە.

## هـ

٣٨٦٠. ها ببێژ ببێژ،

زمانێ تە درێژ.

٣٨٦١. ها بكه جەعدە، ها بكه جەعدە،

وی چیایی سەر وی چیایی دادە،

وەختا خوەدێ نەدە_نادە.

٣٨٦٢. هاڤینێ بەرهەڤنەکی، زڤستانێ نکاری دەستخی.

٣٨٦٣. هاڤین کو هەیە، دێ و باڤێ فەقیرایە.

٣٨٦٤. هاڤین هات، باران نەهات.

٣٨٦٥. هایێ ل من، هایێ،

ئەرمووش هاتیە ب لبایێ،

ناها خوەیێ ئەرمووش بەر تێ،

خوەیێ لبایێ بەر نایێ.

ئا) هایێ، هایێ، هایێ،

هەڤرمش هاتە بەر لڤایێ،

خودانێ لڤایێ بەر پایێ.

٣٨٦٦. هاتیە مەحەلا جنا، پەهلەوان دلیزە.

٣٨٦٧. هاتە چەنگێ من،

تو یێ بڤینی ڕەنگێ من.

٣٨٦٨. هاتە جیێ من،

ڕابوو ڕووێ من.

ئا) هاتم دەوسا تە،

ڕابووم ڕووێ تە.

٣٨٦٩. هاتی دەردا، شۆڤکی بەر دا.

٣٨٧٠. هاتی ژ چوویانە.

٣٨٧١. هات کول، چوو بلبل.

٣٨٧٢. هات مەریێ مالێ،

نەهات قەدا سالێ.

ئا) هەکێ هات، مالخوێ مالێ، هەکێ نەهات، زیانا سالێ.

٣٨٧٣. هات – "هۆ، هۆ"، – نەکە،

چوو - "هێ، هێ" - نەکە.

٣٨٧٤. هێڤیا یارێ ما، بێ دووندا.

٣٨٧٥. هێیا کو پیس نەبێ، پاک ژی نابێ.

٣٨٧٦. هێکا بێ دیک حەرامە.

٣٨٧٧. هێکەکێ قەیخانەکی چێدکە.

٣٨٧٨. هێک سەر سێری ناسەکنە.

٣٨٧٩. هێک خوەشە ب خۆی.

٣٨٨٠. هێل بکە، ترێل بکە،

یا خوە بکە، یا هەڤێل نەکە.

٣٨٨١. هێلەک مێرانی_رەڤە.

٣٨٨٢. هێلینا مشکا بنێ ئمبارادا نە.

٣٨٨٣. هێلکە بە بن هنگل ئەبەرژێنە.

(هێکا بن بچەنگا خوەدا دپێژینە).

٣٨٨٤. هێلکەی ئەمرۆ لە جووجکە سبەینێ باشترە.

(هێکا ئیرۆ ژ جووجکێ سبێ باشترە).

٣٨٨٥. هێلکەی بێ زەردێنە ئەفرۆشێ.

(هێکێ بێ زەرکای دفرۆشە).

٣٨٨٦. هێ نەبووی ڤارک، هێکێ هەسنی دکی؟

٣٨٨٧. هێسن ساری بادده.

٣٨٨٨. هێسترا باش ئالیکا خوە زێدە دکە.

٣٨٨٩. هێشتر (هێستر) ڕادبن هەڤ،

هێشتر و کەر بن لنگێ وان دا دچن.

٣٨٩٠. هێشتر چقاس گرە ژی، ژ دووڤ کەر دچە.

٣٨٩١. هە بووک، تونە بووک،

هەیە بووکە، تونە نەبووکە.

٣٨٩٢. هەبوونا دنێ چەعفێ دژمنا کۆر دکە.

٣٨٩٣. هەبوونا کێ هەڤە، هەر ڕۆ ژی جەم وی عەیدە.

٣٨٩٤. هەبوونا مەریا پێ خارنا زکا خلاس نافە.

٣٨٩٥. هەبوونا نەزانا، زکێ زانا دانە.

٣٨٩٦. هەبوونا جینارا هەڤە، مەرف پێ دسەکنە.

٣٨٩٧. هەبوونا وانا هەیە، سە خایێ خوە ناس ناکە.

٣٨٩٨. هەبوونێرا چ تەنگاسی؟

٣٨٩٩. هەبوون ژ مەردیێ یە.

٣٩٠٠. هەبوون مەریا دکە ناس،

تونەبوون مەریا دکە نەناس.

٣٩٠١. هەبوون – ستوریێ مێرانە،

تونەبوون – کۆتیبوونە.

٣٩٠٢. هەبوون هەڤە، مرن چەکا جندیانە.

٣٩٠٣. هەڤال گەرمکێ هەڤالێ دل بە،

نە کو هەڤالێ نین بە.

٣٩٠٤. هەڤالێ باش ڕۆژا تەنگایێدا کفش دڤە.

ئا) هەڤال، هاڤالێ تەنگیێ یە.

٣٩٠٥. هەڤالێ باش سەرفنیازیا مەریایە.

٣٩٠٦. هەڤالێ عەزیز ژ براکی خراب چێترە.

٣٩٠٧. هەڤالا مەرف پێشیا ڕیا مەرڤە.

٣٩٠٨. هەڤالێ پیس مەریا ژی ب خوەرا پیس دکە.

٣٩٠٩. هەڤالێ ڕێویا – نانە.

٣٩١٠. هەڤالێ خاشیا زەعفن، یێ تەنگایا کێمن.

٣٩١١. هەڤالێ خراب کولا کێلەکێیە.

٣٩١٢. هەڤالێ خوەرا ساخ بە، هەڤالێ خوە بسپێرە خوەدێ.

٣٩١٣. هەڤالێ هەڤالان زەعفن،

مێریێ کرنا کێمن.

٣٩١٤. هەڤالتیا مەریا گەرە نە یا زکا ڤە،

گەرە یا دلا ڤە.

٢٩١٥. هەڤالتیێ دکی ڕاست بکە، خار نەکە.

٢٩١٦. هەڤالتی نیرە، سەر ستویێ مەریایە، وەکە هەڤ بکشینن.

٢٩١٧. هەڤیرێ خوە ب دەستێ خوە هەڤیر بکە.

٢٩١٨. هەڤیر چڤاس بسترێی، نانێ وێ تەعم دبە.

٢٩١٩. هەڤراز تووکم_سمێلە، بەرژێر تووکم_ ڕوویە.

٢٩٢٠. هەڤال هەڤێل دەر نەدە، کەس نکارە دەردە.

٢٩٢١. هەڤ حەسکرنە_بێسەبرە.

٢٩٢٢. هەگەر کەسە، شارەک بەسە.

٢٩٢٣. هەگەر نە فەندە، چ دار و بەندە؟

٢٩٢٤. هەگەر تو چووی ناڤ ملەتەک تازی، دەرپێ خوە ژ خوە بکە.

٢٩٢٥. هەگەر حەواسە، ئەو ژی بەسە.

٢٩٢٦. هەیا دلۆپێکێ، کە تکا، تکا.

(هەیا دلۆپەکە، کو نقتی، نقتی).

٢٩٢٧. هەیا ئەز هین بووم، ئەز پیر بووم.

٢٩٢٨. هەی دنیایێ، هەی دنیایێ،

عەمرێ بووری ئیدی نایێ.

٢٩٢٩. هەیە ئاگرێ مۆڤەتێ، هەیە ئاگرێ زیانێ.

٢٩٣٠. هەیلۆ، هەیلۆ، بەرفا کەتیە لاکانا ڕاناڤە.

٢٩٣١. هەینی ژن، وەینی ژن، دیسا ژن.

٢٩٣٢. هەیوا گولانێ،

خودێ نادێ بارانێ،

پازێ کووڤی ل بەر زانێ.

٢٩٣٣. هەی شاخ، هەی شاخ،

چیا ژی دڤێن ئەم چیانە.

گۆلک ژی جەم کا دڤێن ئەم گانە،

کەدە – گوودێ ڤان سالا ڕابوونە،

دەستێ خوە دانا سەر قەوزێ قەمانە،

ئەوانا ژی دڤێن ئەم ئاغێ ئێلانە.

٣٩٣٤. هەکێ با هات بدێرە، هەکێ نە هات گوهـ بدێرە.

٣٩٣٥. هەکێ مەرڤ ژن بینە، برا ژنا مێرەکی قەنجبە.

٣٩٣٦. هەکەر دز خۆماڵە، هێلە باتالە.

(ئەگەر دز ژ مالێ بە هەوار بەتالە).

٣٩٣٧. هەکەر شەرە، بانکە مووسا و کەرا،

هەکەر مێکروونە، بانکە مەما و هاروونا.

٣٩٣٨. هەکە خودێ بدێ یەکی عەقد نکارن ژێ بستینن،

هەکە خودێ نەدتێ، عەقد نکارن بدنێ.

٣٩٣٩. حەلال خۆری کەم دەسەلاتییە.

٣٩٤٠. حەتا تالی نەبینیت خۆشی نابینیت.

(حەتا نی تەعلایێ نەبینی، خوەشیێ نابینی).

٣٩٤١. هەلا تە ئاف نەدیتیە، خوە پێخاس نەکە.

٣٩٤٢. هەلان پەرێ مێرخاسانە.

٣٩٤٣. هەلهێل نەکە، هەلهێل نەکە،

یا دلێ تە نایێ، سەرێ هەڤێل نەکە.

٣٩٤٤. هەما تو بێژە چێلەکا مە دزا بریە.

٣٩٤٥. هەمیشە دژمنێ خوە سەر خوەڕا حەسابکە.

٣٩٤٦. هەم ژ دیرێ ما و هەم ژ مزگەفتێ ما.

٣٩٤٧. هەمین هەمینە، تو ب کێف بینە.

٣٩٤٨. هەمن هەمنە، جە برێ گەنمە.

٣٩٤٩. هەنگوین بە دەمی تالە.

(هنگڤ ژی دێڤ دا تەعلە).

٣٩٥٠. هەر بەندە دەردەکی وی هەیە.

٣٩٥١. هەر بەندە وەکە شیرێ خوە ڕادبە، ڕوودنی.

٣٩٥٢. هەر بەرۆشکی دەڤێ خوە دبینە.

٣٩٥٣. هەرکاف لێی ڕانابە، کۆچا نایبنە.

٣٩٥٤. هەرگێ مێر دبی، مێرەکی خاس ببە، نا نا، بمرە ژ دنییایێ خلاس ببە.

٣٩٥٥. هەرگێ مەزنێ مالێ نە هازرە، پرسا خوە ستوونا مالێ بکە.

٣٩٥٦. هەرگێ مەرف خار بە، خالیێ مەریا ڕاستکە.

٣٩٥٧. هەرگێ تو وەعدێ خوە بەرەدایی دەرباز بکی، تێ ب خوە خوە خی.

٣٩٥٨. هەرگێ خودێ بدە، موو ژی دکشینە تینە،

ئەگەر خودێ نەدە، ژنجیرێ کۆتانێ دقەتینە دبە.

٣٩٥٩. هەرگە تو سەبر ناکی، سەبرێ ئاشان ناکی،

تویێ خوە ڕەزیلی دنێ- ئالەمێ بکی.

٣٩٦٠. هەر گولەکێ بینەک ژێ تێ.

٣٩٦١. هەر گلیکی - سەبرەکە.

٣٩٦٢. هەر دارەک سەر پنێ خوە شین دبە.

٣٩٦٣. هەر دەڤەکی پاریکی خوە هەیە.

٣٩٦٤. هەر دەومنە ئەبێ بە دار.

ل بنیا دائەنیشن فەقیر و هەژار.

(هەر دارەکە تەر پاشێ دبە دارا تام.

بنی ڕووەنن فەقیر - فقارە).

٣٩٦٥. هەر دیکەکی ئاغاییێ سەرگوهێ خومیە.

٣٩٦٦. هەرد دنیا بەری ل هەڤە.

٣٩٦٧. هەر دلەکی - ڕەنگەک، هەر مەریکی - بەنگەک.

٣٩٦٨. هەردو ڕێ ژی دچنە گوندەکی.

٣٩٦٩. هەرێ نەفسێ، هەرێ نەفسێ،

لا بێ کەسێ،

تە دل هەیی من باڤێژی هەڤسێ؟

٣٩٧٠. هەر ئێنیشەکی هۆقشەکی خوە هەیە.

٣٩٧١. هەرزمچەنەیان خستە ناڤ ئاگر ئەیووت دارەکەی تەرە.

(زەفزەک کرنە ناڤ ئەگر، دگۆت داری تەرە).

٣٩٧٢. هەر یەک ب عەسلێ خوە.

۳۹۷۳. هەر کارە بێژە، لێ نکارە بکە.

۳۹۷٤. هەرکێ دەشتە، هەرکێ زۆزانە،

رۆحێ پێز_شڤانە.

۳۹۷٥. هەر کەس ئانگۆری دلێ خوە ڕێ دچە.

۳۹۷٦. هەر کەس بەرێ تەڤشۆ ددە خوە.

۳۹۷۷. هەر کەس ب گازا خوە چاو دپیڤە.

۳۹۷۸. هەر کەس ب دەردێ خوە دبلە.

۳۹۷۹. هەر کەس دەردێ وی پێ زەحمەتە.

۳۹۸۰. هەر کەس دەوسا لنگێ خوە دکە.

۳۹۸۱. هەر کەس دکێ گۆریا شیرێ خوە.

۳۹۸۲. هەر کەسێک پەری تائووسی ئەوێ، ئەبێ زەحمەتی سەفەری هندستان بکێشێ.

(کێ کو دخازە پەرێ وی تاشسێ هەبن، گەرێ زەحمەتا سەفەرا چووینا هندستانێ بکشینە).

۳۹۸۳. هەر کەس دچە حەمامێ، گەرمکێ مەشا وی زانبە.

۳۹۸٤. هەر کەسەک هۆستێ شوخولێ خوە یە.

۳۹۸٥. هەر کەسەک چالە بۆ یەکێک هەلکەنێ خۆی تێی ئەکەوێ.

(کێ چەعلێ کێرا دکۆلە، ب خوە دکەڤێ).

۳۹۸٦. هەر کەسە چاوەڕوانی توێشووی خەلق بێ، لە برسا ئەمرێ.

(چەعڤێ کێ دەرێ خەلقێ یە، وێ ژ برچینا بمرە).

۳۹۸۷. هەر کەسەک شینێ سەر مریێ خوە دکە.

۳۹۸۸. هەر کەس کەرا خوە داژۆ.

۳۹۸۹. هەر کەس لە کراسی خۆیا پیاوە.

(هەر کەس کراسێ خوە دا مێرە).

۳۹۹۰. هەر کەس لە هەر چێ بترسێ، لێی ناخەلەسێ.

(کێ کو ژ چ بترسە، ژێ خلاس نابە).

۳۹۹۱. هەر کەس مێڤانێ عەمەلێ خوە یە.

۳۹۹۲. هەر کەس نکارە دۆست–دژمنێ خوە ژەڤ ناس بکە.

٣٩٩٣. هەر کەس رەفیقێ خوەرا دگەرە.

ئا) هەر کەس هەمبەرێ خوەرا دگەرە.

٣٩٩٤. هەر کەس رۆیێ تانگا خوەدا دبینە.

٣٩٩٥. هەر کەس سەر مریێ خوە دگری.

٣٩٩٦. هەر کەس سینۆرێ خوەدا شێرە.

ئا) هەر کەس ل سەر زبلێ خوە خەدەرە.

ب) هەر سەیەک ل بەر دەریێ خوەیێ خوە درەیێ.

٣٩٩٧. هەر کەس وەکە شێرێ خوە.

٣٩٩٨. هەر کەس وەکیلێ نەفسا خوە یە.

٣٩٩٩. هەر کەس وەقی مێزینا خوە.

٤٠٠٠. هەر مەرڤەکی لیکا وی سەر بێڤلا وی شیرینە.

٤٠٠١. هەر مەریکی خەیسەتەکی وان هەیە.

٤٠٠٢. هەر نشووڤیک ئاروازیکی ل بەرە.

ئا) هەر سەرقییامەک سەربەرژێرەک ل پێشییێیە.

٤٠٠٣. هەر پاری تێ جووتنێ، هەر پرس نایێ گۆتنێ.

٤٠٠٤. هەر پەنجەیەک خوێنی خۆی لێ دێ.

٤٠٠٥. هەر رەنگ – رەنگەکە،

بەدرەنگ ژی رەنگەکە.

٤٠٠٦. هەرۆژی گەلەک تەحیبیێ هندکییە.

٤٠٠٧. هەر سەبرەک خێرەک پێرانە.

٤٠٠٨. هەر تو نەگهیشتی دەولەتیا، دەوسا وارێ دەولەتیا داینە.

٤٠٠٩. هەر تشتی ب زراڤی،

مەرڤ ب ستووری.

٤٠١٠. هەر تشت ب متربی چێدبێ، جۆت متربێ چێنابێ؟

٤٠١١. هەر تشت دەستێ هۆستایێ خوەدا مەلوولە.

٤٠١٢. هەر تشت دفرە رەفێ خوەڤا.

٤٠١٣. هەر تشت ل هەیێم دنهێرە، لێ هەیام تو تشتی نانهێرە.

٤٠١٤. هەر تشت خوشە وەعدێ خوەدا.

٤٠١٥. هەر تشت وەعدێ خوە زانە.

٤٠١٦. هەر خانەک دلێ خوەدا سلتانەکە.

٤٠١٧. هەر خرابیکی قەنجیک پەیە.

٤٠١٨. هەرچا بەرێ، گولا زەرێ.

٤٠١٩. هەرچا ل گێ_گەنمە.

٤٠٢٠. هەرچا مالێ وی پرە،
نۆتلانی کەرەکی سمکورە،
وەختا دیوانادا دزرە،
خەبەردانا وی خەلقێ لال و دورە.

٤٠٢١. هەرچا مالێ وی هندکە،
مینا شێرەکی چار گورچکە،
خەبەردانا وی خەلقێ کەڤر و کوچکە.

٤٠٢٢. هەرچا م کر - با و بارانێ بری،
بەندا سەر من حەسابکری.
ئا) هەرچیا من دکر،
ب ئاقلێ من با دبر،
من نزانبوو خوەدێ تالا ل دەفتەر دکر.
ب) هەرچا تو کری، تو ژی ترێ بایێ بری،
لێ نزانیی بەندێ حەسابکری.

٤٠٢٣. هەرچا هێکە، خوەدێ چێکە.

٤٠٢٤. هەرچێ بەرز بفرێ، پیا ئەترێ.

٤٠٢٥. هەرچێ دەردێ خوە دبێژە،
تو ژی ترێ ئەو دەنگبێژە.

٤٠٢٦. هەرچێ ژ رووڤی دوورە، گول-نوورە.

٤٠٢٧. هەرچێ کەسێ ملەتێ خوە نەحەبینە،
وێ خوە مینا زەنگلێ دێرا بچنگینە،

وێ کاسا ژەعرێ سەر خوەدا وەلگەرینە.

٤٠٢٨. هەرچێ کەسێ تەرکێ ئەدەت بمەشینە،

وێ دەردێ کۆتیبوونێ جانێ خوە بڤینە.

٤٠٢٩. هەرچێ لاچک سپینە - باجینە،

هەرچێ کۆلۆس سێرینە - حەجینە.

٤٠٣٠. هەرچێ لە دیزەدابا، بە ئۆسکوێ دەردێ.

٤٠٣١. هەرچێ لە مشک بێ، جەوال ئەدرێ.

(ئەگەر ژ مشکە، وێ چاوێل قولکە).

٤٠٣٢. هەر چێلەک تێ دۆتنێ،

لێ هەر گلی نایێ گۆتنێ.

٤٠٣٣. هەرچی نە ل مالە،

نزانە ب هەوالە.

٤٠٣٤. هەر شێرەک ب لەپێ خوەیە.

٤٠٣٥. هەر شوخول سێریدا چەتنە.

٤٠٣٦. هەر جانەک د دلێ خوەیێ خوە دا سولتانەک.

٤٠٣٧. هەر جی نە ژ خوەدێرا بە، خوەدێ ژی نە ژێرا یە.

٤٠٣٨. هەر جیهێک تو بچی، مالەکێ ژ خوەرا چێکە.

٤٠٣٩. هەر قازی - ژ ئاقلێ خوە رازی.

٤٠٤٠. هەر قەزیەک شیرەتەکە.

٤٠٤١. هەر وەختەکێ حوکومەکی وێ هەیە.

٤٠٤٢. هەرێکرن هەیە بەلایە.

٤٠٤٣. هەرە دوور، وەرە دروست.

٤٠٤٤. هەرە مێڤانێ گورا، لێ بێ سە مەچە.

٤٠٤٥. هەرە مێشە،

هلدە پێشە.

٤٠٤٦. هەرە جیێ نەناس،

پایێ خوە بدە خاس - خاس.

٤٠٤٧. هەرە، وەرە ماشێ تە دو پەرمیە.

ئا) هەرە وەرە، باهایێ تا چار پەرە.

٤٠٤٨. هەرۆ جێر دچە ئاڤێ، ساخ نایێ.

٤٠٤٩. هەسان ئەدا لە بنی پێیێ.

(دووزان ددە ل بن پیا).

٤٠٥٠. هەسپا بۆز وەختا بیست سالی بوو، برا دکارە بفرۆشە برێ.

٤٠٥١. هەسپا بن خوە نەدە کورێ خوە ژی سیار بە.

٤٠٥٢. هەسپا خەڤاتکار جەهێ خوە زێدە دکە.

ئا) هەسپێ چێ (باش) ئێمێ خوە زێدە دکە.

ب) هەسپێ چێ ئێمێ خوە زێدە دکە، هەسپێ کۆتی کێم دکە.

٤٠٥٣. هەسپا خەلقێ سیار نەبە، تێ زوو پەیا بی.

٤٠٥٤. هەسپا هەر کەسی ئانگۆری بەختێ وی دبەزە.

٤٠٥٥. هەسپا چێ قامچییا ل خوە ناخە.

٤٠٥٦. هەسپا قۆلای، تەژیێ توولە، هەردو ژی یەکن.

٤٠٥٧. هەسپ ب هەڤسارا، مێر ب قرارا.

٤٠٥٨. هەسپ دبەزە، سییار پەسنا ددە خوە.

٤٠٥٩. هەسپا باڤێ کور ڤەشارتن نابە.

٤٠٦٠. هەسپێ مەرڤێ خایین حەتا سێری نابەزە.

٤٠٦١. هەسپێ مرنێ هەسپەکی بۆزایە.

٤٠٦٢. هەسپێ نێر ژ هونورا دشەهێ.

٤٠٦٣. هەسپێ تو رەڤاندی؟

٤٠٦٤. هەسپێ خوە نەعلکە، پاشێ رِیا خوە حەسابکە.

٤٠٦٥. هەسپێ چێ زۆرا لەخما دمردکەڤە.

٤٠٦٦. هەسپ کو هەیە، مەرازە.

٤٠٦٧. هەسپ نەکریە، ئافرێ چێدکە.

٤٠٦٨. هەسپ ئۆمدا مێرکێ فەقیرە.

٤٠٦٩. هەسپ سیارا مێرخاس دکە، هەبوون مەریا زمنگین دکە.

٤٠٧٠. هەسپ سیارێ خوە ناس دکە.

٤٠٧١. هەسپ تونە، زین دخەڤتە.

٤٠٧٢. هەسپ و رەقاس؟

٤٠٧٣. هەسپ و قانتر دکنە شەر، کەر د کەڤە ئۆرتێ.

٤٠٧٤. هەچێ ئەڤ دنیا هەیە، ملکێ کۆتەکایە.

٤٠٧٥. هەچی ئاخا وی نینە،

نامووس و دینێ وی نینە.

٤٠٧٦. هەچی دەربا خوە هێفشاند،

ب برینێ خوە هەسساند.

٤٠٧٧. هەچیێ نە ل مالەکێ، نزانە هەوالەکێ.

٤٠٧٨. هەچی ژارە ل هاڤینێ، ژ سارە.

٤٠٧٩. هەچی نە ل گۆڤەندییە، خوەش رەقاسە.

٤٠٨٠. هەچی نیسکە نە بەرە، نە پشتە.

٤٠٨١. هەچی چەعف زەرە، گشک نەزەرە.

٤٠٨٢. هەچی شوخولەک ل بەرە، کو نەکێ، کەرە.

٤٠٨٣. هەق ئاف رادەوەستینێ.

(هەق ئاڤێ ددە سەکناندنێ).

٤٠٨٤. هەقدار لە هەقی خۆی وازدێنێ، شاهید واز ناهێنێ.

(خایێ هەق دەست ژ هەق دکشینە، شەعدە دەست ژێ ناکشینە).

٤٠٨٥. هەقێ دینا مەریێ کێفخوەش تێن دەر.

٤٠٨٦. هەقێ عەلی دخازی وەلی.

٤٠٨٧. هەقێ من نەهەقێ منرا نامینە (نەمینە).

٤٠٨٨. هەقێ من هازر بدە، برا پیڤازەک بە.

٤٠٨٩. هەقیێ بن نەهەقیێدا بارە-بارە.

ئا) هەقیێ دەست نەهەقیێ دا بارە-بارە.

٤٠٩٠. هەو دیتیە، خوەدێ رێتیە.

٤٠٩١. هەوێنێ نۆ قازان شیرە.

(هاڤینا تەزە، بەرۆش تژە شیرە)

٤٠٩٢. هەوی هاتە سڤدەرێ،
تەعنێ دانە جەگەرێ.

٤٠٩٣. هەوی – هەوی دەندکێ قەوی.

٤٠٩٤. هەوری بە گرمە – گرم بارانی لێ نایێ.

٤٠٩٥. هەوسا خوە مووریا کولەک بکە، مووری کو دلکە، وێ چیا خەشەبکە.

٤٠٩٦. هیڤیا یارێ مایە، بێ ژن مایە.

٤٠٩٧. هیڤ هیڤە، عەیبا لێیە.

٤٠٩٨. هیڤ و ڕۆژن پادشێ دنێ.

٤٠٩٩. هینبوون ئیشقا چەعڤایە.

٤١٠٠. هین دەڤی تە گەرمە، دەنگ کە.

٤١٠١. هین کو خوەشە، خێتر زانبە،
مر، شووندا تم خوە خە، فیدە نینە.

٤١٠٢. هینکرییا – هین نەکە،
هین دکی – بیر نەکە.
ئا) هین نەکریا – هین نەکە،
لێ تە هینکر – بیر نەکە.
ب) "هیوو – مەکە، تە" هیوو – کر، قەت دێنگ مەکە.

٤١٠٣. هین مهین نەکریە، ئالف چێدکە.

٤١٠٤. هیجاتا نمێژکارا – پێخاسبوونە.

٤١٠٥. هۆل کو هاتە بەر کاشێ، گەرەکێ دەرپێ لێ نەهێوشینی.
ئا) حەتا هۆل نەیێ بەر کاشێ، لنگ لێ ناکەڤە.

٤١٠٦. هوندور م دشەوتینە، دەورا خەلقێ دشەوتینە.

٤١٠٧. هورمێ کەت، پۆچک هەڤراز.

٤١٠٨. هۆستە ناجار،
وەرە ڕازێ وەکە هەر جار،
خودێ یەکە، دەرگە – حەزار.

٤١٠٩. هۆشە – هۆشە، ئاخریا شەرۆ بۆشە.

٤١١٠. هۆشتر و حەمام؟ مەیموون و عەبا؟

٤١١١. هووکی دکنە مووکی.

٤١١٢. هوور بازۆ، کیوور بازۆ، دەوێر مەیێشینە.

٤١١٣. هوور بفکر، دوور بفکر،

کوور بفکر، شوور بفکر.

٤١١٤. هوورهوورکا نەگهیشتە گرگرکا.

٤١١٥. هزکرن عەمرەکی زێدەیە.

٤١١٦. هلکەتۆ، داکەتۆ، هێ ب خوە کەتۆ.

٤١١٧. هەم دینە، هەم شێر.

٤١١٨. هەم ژنن، هەم ژانن،

هەم مەلهەمێ دلانن،

هەم دەردێ بێ دەرمانن.

٤١١٩. هەم زیارەتە، هەم توجارەت.

ئا) هەم زیارەت و هەم تجارەت.

٤١٢٠. هەم ل مزگەفتێ و هەم ژی ل کلیسێ.

٤١٢١. هنگا من نەخە،

دەنگا من دەرنەخە.

٤١٢٢. هنگێ دنیا خراب دبە،

مالا ترچۆ ئاڤا دبە.

٤١٢٣. هنگێ ڕووڤی دەەلسە، قەڤزک زێدە لێ دکەڤە.

٤١٢٤. هنگێ سەرێ مێرڤ مەزن دبە، خوونا مێرڤ عەجێبا دبینە.

٤١٢٥. هنگە تلیکێ، تژی خانیکێ،

٤١٢٦. هنگی هاڤینە، دەعواتا شێخ عەلەدینە،

هنگی پاییزە، دەعواتا شێخ عەڤدەلەزیزە.

٤١٢٧. هنگڤ دوخوە، مێشا بەری خەلقێ ددە.

ئا) هنا هنگڤ خوار، مێشا ب هنا دادا.

٤١٢٨. هندی پتره – چێتره.

٤١٢٩. هندکا – هندک، زەعفا – زەعف.

٤١٣٠. هندکیرا نەڤێژی شکر، گەلەکیڕا ناڤێژی شکر.

٤١٣١. هندک – رندک.

٤١٣٢. هندک خەبەردە، زەعف ببهێ.

٤١٣٣. هن دکن. هن دخون.

٤١٣٤. هنە زای ب جەلەبن،
کۆفیێد سێری عەلبن،
دڤێ ئەمێ بوخون مەخەلبن.

٤١٣٥. هنەکا ئاڤا موو دەست ناکەڤە،
هنەک ژی هەڤرمش قایل نابن.

٤١٣٦. هنەکا – مرنێ، هنەکا – کێف کرنێ.

٤١٣٧. هنەک دکن، ناموس هنەکاڕا دمینە.

٤١٣٨. هنەک دخازن ڕازێن، عەردێ زیها دەست ناکەڤە،
هنەک ژی ناڤا خارە، دیڤەدانە.

٤١٣٩. هنەک دخەنقن، هنەک دخەرقن.

٤١٤٠. هنەک دخون – خوەدێ نادێ دا،
هنەک ناخون – خوەدێ ددێ دا.

٤١٤١. هنەک مەوژن – نەترن،
هنەک گوورن – خرخرن.

٤١٤٢. هنەک جانن، ما هنەک بادلجانن.

٤١٤٣. هنکاڕا کولە، هنکاڕا گولە.

٤١٤٤. هن مار چووچکە سێرە بچەلقینە.

٤١٤٥. هن نەمرن، هن نازموجن.

## ح

٤١٤٦. حاکمی خوە خوە ناڤ خوەدا خراڤ دبە.

٤١٤٧. حەڤسا خوە ژ مووریا کولەک بکە.

٤١٤٨. حەڤت ئاژن کەرێ هەنە، ل بەر ئاڤێ کشا بیر دکێ.

٤١٤٩. حەڤتارە، خاش فتارە.

٤١٥٠. حەڤتێ عەرد عەزمین زانی، گۆشتێ بن برنجدا نزانی؟

٤١٥١. حەڤتێ تێرا کایێ جڤیان.

٤١٥٢. حەڤت کلامێ هورچێ هەنە ل سەر هولیێنە.

ئا) حەڤت خەبەرێ هرچێ هەنە، ل سەر سێڤا تەلەکێنە.

٤١٥٣. حەڤت نەقلا مالا خوا سەکە، پاشێ هەرە مالا جیرانا.

٤١٥٤. حەڤت سالا یەک دلکەتە بشکولەکێ حەڤت سالا خایکر، ئاخریێ دا هوورکر ناڤا شیر ڤەخوار.

٤١٥٦. حەڤت سالان سالاکی سان.

٤١٥٧. حەڤت تەعزیێ تە توولەکی من ناگرە.

ئا) حەڤت تەعزیێ تە رووڤیکی من ناگرە.

٤١٥٨. حەڤت خوە گۆریسەک نەهووناندن ژ برایێ خوەرا.

٤١٥٩. حەزار دۆست_ کێمن، دژمنەک_ پرە.

٤١٦٠. حەزار نەوال هەیە، سەرێ وان حەزار نەوالا تێ دبرە نەوالەکێ دسەکنە.

٤١٦١. حەزار پەزێ دموریش ل چۆلێبە،

حەزار کیسێ مۆرکری ل عەردێبە،

برا رۆکێ ناڤێ مێرڤ ل دنێبە.

٤١٦٢. حەزار سالی دنێ بی،

مال زێراڤا خنێ بی،

رۆژەکی تێ مێڤانێ قەبرێ بی.

ئا) حەزار سالی ژ دنێ کارکی،

پادشاتیێ مسرێ، حەتا شامکی،

تێ رۆژەکێ کاسا مرنێ تەعمکی.

٤١٦٣. حەزار فەنی باشقەبە، یەکێ وێ ژ باڤێ بە.

٤١٦٤. حەزار شۆرێ شۆرەکێ دبرە.

٤١٦٥. حەزیران – حزرا تەیرانە،
ئادارە – دەو ل دارە،
نیسان – دەو جەم حەموو کەسان.
٤١٦٦. حەیا زار نەگری، دێ چچک نادە.
٤١٦٧. حەیا م ئاقلێ خوە ناس کر.
م عەمرێ خوە خلاس کر.
٤١٦٨. حەیا سەرێ ساخ دمینە،
چەعڤ عەجێبا دبینە.
٤١٦٨. حەیا وێ دەمێ، مەکە وێ خەمێ.
٤١٦٩. حەیفا ڤی دەستی دەستێ دنێ نایێ.
٤١٧٠. حەیفا تە وەلاتی، پادشایی بێ باشەرە.
٤١٧١. حەیفا هیڤەرۆنا، شەڤا ڕەش ل پێیە:
٤١٧٢. حەیفا جوانیێ (جاهلیێ)، پیری ل ڕێیە،
حەیفا هیڤەرۆنێ شەڤێ ڕەش ل پێیە.
٤١٧٣. حەیف پێش حەیفێ ڤا.
٤١٧٤. حەیف، ڕێ ژ دلا ناچە دلا.
٤١٧٥. حەیوانێ پیر بەر دەرێ نەزانایە.
٤١٧٦. حەکیم ئەوە، ئێد کو برینێ ل خوە دبینە.
٤١٧٧. حەموو دۆستا دۆست حەساف نەکە،
حەموو دژمن ژی دژمن حەساف نەکە.
٤١٧٨. حەموو کەسیرا دان و ستاندنێ نەکە.
٤١٧٩. حوکومەت دل بکە، وێ چیا ڕاست و دووز بکە.
٤١٨٠. حەلالی بەندا مێرانە.
٤١٨١. حەلاوێ ژ شیرێزێ چێنابە.
٤١٨٢. "حەلاو، حەلاوە"، دەڤ شیرین نابە.
٤١٨٣. حەمێزکە، لێ بیرنەکە.
٤١٨٤. حەمەدانە، گا و گۆلک دەردانە،

ئەو مانە، ئەو خەبەردانە.

٤١٨٥. حەموو زانن پۆلا هەسنە، لێ خوە خوە مەپەسنە.

٤١٨٦. حەموو کەسێک گۆشتخورە، هەر نافێ گور بەدنافە.

٤١٨٧. حەموو کەس نانێ خۆش ئەوێ، بەلام وەک شوان نایگرێ ب سەر دلیەوە.

(نان حەموو کەسی خوەش تێ، لێ تو کەس مینانی شڤێن وی سەر دلێ خوە خوەی ناکە).

٤١٨٨. حەموو کەس ڕسقێ خوە دخوە.

٤١٨٩. حەموو مێر_مێر نینە، حەموو شێر_شێر نینە.

٤١٩٠. حەموو مەلێک هەنجیرخۆر بوایە، هەنجیر بە دارەوە نە ئەما.

(وەکی حەموو تەیرەدا هێژیر بخورانا، هێژیر سەر دارا نەدما).

٤١٩١. حەموو ڕێیەک ئەچێتەوە سەر بانە.

(هەر ڕێک دچە سەر شێنلکەکێ).

٤١٩٢. حەموو ڕیا دزانی، ڕیا بازارێ نزانی؟

٤١٩٣. حەموو سمێلسۆرەک حەمزە ئاغا نینە.

٤١٩٤. حەموو تەیر و تەوال دوژمنێ سەرێ کەوێیە، کەوێژ بە خوە دژمنێ سەرێ خوە یە.

٤١٩٥. حەموو خورمیەک ئاڤ نییە،

حەموو چنراوێک جاڤ نییە.

٤١٩٦. حەموو چێلەک تێن دۆتن،

حەموو خەبەر نایێن گۆتن.

٤١٩٧. حەموو شتێک بە خوێ، خوێش بە مەعنا.

٤١٩٨. حەسابێ مال و سووکێ ل هەڤ دەرناکەڤن.

ئا) حەسابێ مالێ ل چارسووێ کێم دەرکەت.

٤١٩٩. حەسەن کەچەل – کەچەل هەسەن.

ئا)ها هەسەن، ها کەل هەسەن.

٤٢٠٠. حەسن بجوو، خوا هەوجێئی کەسی مەکە.

٤٢٠١. حەسن دکوتن گەرمە – گەرمە،

مێرا دکوتن نەرمە – نەرم.

٤٢٠٢. حەسنێ بێ ئەساس،

چقاس دکوتی، نە دبە کێلەندی، نە دبە دەعس،

ئا) حەسنێ نە ئەساس،

نا دبە تەڤر، نە دبە دەعس.

ب) حەسنێ نەم خاس،

نە دبە کێر، نە دبە دەعس.

٤٢٠٣. حەسنێ نەخەبتە، زوو زەنگ دگرە.

٤٢٠٤. حەسنۆ، ب خۆ بپەسنۆ،

٤٢٠٥. حەسن چقاسی دخەبتە، هاقاسی دبرقە.

٤٢٠٦. حەتا ئادەم ئەم پێ زانن، ژ وی پێدە تشتەک جەم تە هەیە، بێژە.

٤٢٠٧. حەتا باڵ خوەدێ دەست سەر دەستانە.

٤٢٠٨. حەتا بەلەند تونە ڤە دز نکارە دزیێ بکە.

٤٢٠٩. حەتا بووک خەملی،

دەعوات بەتلی.

ئا) حەتا خانم خەملی،

دەف و دەعوات کەملی.

٤٢١٠. حەتا دەریا نەکۆتی، بەر تە ڤەنابە.

٤٢١١. حەتا دۆن نەکەڤە چرایێ، چرا ڕۆنای نادە.

٤٢١٢. حەتا گەنم فریکە، مەڵە شریکە.

٤٢١٣. حەتا گۆلک نەکە مزە-مز، چێلەک بەر وی ناچە.

٤٢١٤. حەتا دەردێ مەریا تونە ڤە، مەری نکارە کلاما بێژە.

٤٢١٥. حەتا زار نەگری، دێ بستان نادێ.

ئا) حەتا زارۆ نەگری، دێ بستێن نافێژە دێڤ.

٤٢١٦. حەتا زەلال نەبە، بەلوو نابە.

٤٢١٧. حەتا کو دل نەشەوتە ژ چەعڤا هێسر نایێ.

٤٢١٨. حەتا کۆک بێنە حالێ ژارا،

ژارێ هەرنە مەعرزەرا.

٤٢١٩. حەتا کراسێ تە بشەوتە،
جانێ منێ بشەوتە.
٤٢٢٠. حەتا مالێ من خراڤ بە، برا زکێ من خراڤ بە.
٤٢٢١. حەتا مالخو دزی گرت، دز مالخوی گرت.
٤٢٢٢. حەتا مەری کەسیڤە، گازی خودێ دکە،
مەری دەولەتی بوو گازی خودێ ناکە.
٤٢٢٣. حەتا مەری نەچە دیهارێ گۆرێ، مرن ناکەڤە بیرێ.
٤٢٢٤. حەتا مە ترش کر، خەلقێ پێڤا دا.
٤٢٢٥. حەتا م ئاقلێ خوە ناسکر،
مالک ل خوە خلاس کر.
٤٢٢٦. حەتا مریێ مەریا نەکەڤنە بیرا مەریا گریێ مەریا نایێ.
٤٢٢٧. حەتا مرنێ، چەعڤ ل کرنێ.
٤٢٢٨. حەتا م تێ بیرێ،
ل من حەرام بە ئاخ و ئاڤا جزیرێ.
٤٢٢٩. حەتا نەڤە قال، ناڤە مال.
٤٢٣٠. حەتا نەکەڤی گۆڤەندێ، خوە ناهەژینی.
٤٢٣١. حەتانی دل عەلامی دلا نەکن،- حزکرن ناکەڤە ئۆرتا دلا.
٤٢٣٢. حەتا سە هەستو نەکۆژە (نەخوە)، دار ل سێری ناکەڤە.
٤٢٣٣. حەتا تو هلاتی بکی، خەلقێ شکەڤاتی بکە.
٤٢٣٤. حەتا تو جەعنەمێ نەبینیی، جنەت تە خوەش نابە.
٤٢٣٥. حەتا فێلا پاشیێ تێ، فێلا پێشیێ دچە.
٤٢٣٦. حەتا تو وێ دارێ ئاڤ نەدی، ئەو دار بەر ناگرە.
٤٢٣٧. حەتا خەبەر نەیێ سەر مەرڤ، گەرمک مەرڤ خەبەرێ خوە نەبێژە.
٤٢٣٨. حەتا خورت ژاربن، ژار وێ بمرن.
ئا) حەتا قالن زراڤبە، زراڤ وێ بقەتە.
٤٢٣٩. حەتا خوون ژ دەستێ تە نەیێ، دلێ تە نایێشە.
٤٢٤٠. حەتا هەڤراز نەکەڤە بەر تە، قەدرێ بەرژێرا نزانی.

٤٢٤١. حەتا چەعفەكى دەرمانكر، ئێ دنێ كۆر كر.

٤٢٤٢. حەتا شێلوو نە بە، زەلال نا بە.

٤٢٤٣. حەتا شوور كشاندنێ و شوور لێدانێ ژی هەیامەكە.

٤٢٤٤. حەتا جینارا ناس نەكی، مالا خوە جەم چێنەكە.

٤٢٤٥. حەتا جینار ناس بكی، وێ مالا خوە خراڤ بكی.

٤٢٤٦. حەجیۆ مەچە حەجێدا،

سۆلا خوە مەقەتینە ڕێدا،

حەجا تە ئەوە، توی تێدا.

٤٢٤٧. حەجی هەرە ئێش، بارێ وی باجك ژی بە، دۆرا ویێ بێ.

٤٢٤٨. حەولە ب سەبر چێدبە.

٤٢٤٩. حوبا دلا تەرتێ پەسارێ دخە پاشلا.

٤٢٥٠. حوب شیرێ تۆ گرتییە، تە خومینەكر وێ ترشبە.

٤٢٥١. حوكومێ زارا ژ حوكومێ پادشا مەزترە.

٤٢٥٢. حورمەتا بەندا - چەك و ڕحالە.

٤٢٥٣. حورمەتا مەریا دەستێ مەریا دا نە.

٤٢٥٤. حورمەت گۆشتێ (جانێ) ئیسێنە.

٤٢٥٥. حورمەتێرا منەت تونە.

٤٢٥٦. حورمەت هەیە بۆی خوەدێیە.

٤٢٥٧. حورمەت حورمەتێ دخازە.

٤٢٥٨. حوتۆ، تێ نها بێی بەر جۆتۆ.

٤٢٥٩. حلی چاند، ڤرنی كەت.

ئا) زوو چاند، بێكێر دەركەت.

٤٢٦٠. حرچا نۆ نایێ ڕایێ.

٤٢٦١. - حرچێ، ژ كو تێیی؟

- كایێ!

- كوتكێ ژ كو تێیی؟

- ژ دەوسا دایێ.

٤٢٦٢. حرچه کۆره، یان گارسی بێ سەرییە؟

٤٢٦٣. هرچ ژی زانە گارسی بێسەرییە، گارس ژی زانە حرچە کۆرە.

٤٢٦٤. حرچ کەتە نەقەبێکدا، ڕووڤی ژ پشت هاتێ.

٤٢٦٥. حرچ کو هەیە، جانەڤەرەکی بێئادە، هێک کر، نەکر.

٤٢٦٦. حرچ لانا خوە بیر ناکە، چڤیک ژی هێلینا خوە.

٤٢٦٧. حرچ و گۆڤەند کێ دیتیە؟

٤٢٦٨. حرچ و گۆڤەند، شڤان و دیوان؟

٤٢٦٩. حرچ چووبوو بن دارا سێڤادا سەکنی بوو، دەڤێ وێ نەگهیشتێ، دگۆ: "چاوا ترشە".

## ئوو

٤٢٧٠. ئووسێ چ کەڤر هلدا، ئەو بن دا بوو.

ئا) چ کەڤری هلدی فلانکەسی بن دا نە.

٤٢٧١. ئووجاقێ مەرا ژ مەرێ خێرسزدا کوورە.

## چ

٤٢٧٢. چاڤ لە دەست بیت، دەست بەستەیت.

(وەکی چەعڤ ل دەستێ خەلقێ بە، دەستێ خومیی تێنە بەندێ).

٤٢٧٣. چایێ بەر قاوێ دەرکەت،

بهایێ قاوێ کەت.

٤٢٧٤. چاکە بکە و بیدە بە دەم ئاوەوە.

(قەنجیێ بکە، باڤێژە ئاڤێ).

٤٢٧٥. چاکە لە چاکە ئەبێتەوە.

(قەنجی ژ قەنجیێ چێدبە).

٤٢٧٦. چەلخا ڕاست ڤە، ڕسقێ مەریا تەڤی لێی ژی تێ.

٤٢٧٧. چار کورمانج _کۆچەکن.

٤٢٧٨. چار بێ، چار قەدا.

٤٢٧٩. چار پیا، چار رۆژ، دو پیا، دو رۆژ.

٤٢٨٠. چاخێ بچووک بووم، مەزنا درتسیام،

مەزن بوومە، بچووکا درتسم.

٤٢٨١. چاخێ چێبە، رەنگێ دێ دبە.

٤٢٨٢. چەلپاندنا سێ بەر ناحەرمە.

٤٢٨٣. چەم بێ چەقەل نابە.

٤٢٨٤. چەرخا فەلەکێ شووندا نازڤرە.

٤٢٨٥. چاوا گارانا گوند، ئوسا ژی کەرا پیرێ.

٤٢٨٦. چەوا دلە، خەتا ل مالە.

٤٢٨٧. چەوا کورە، قیز بابادە.

٤٢٨٨. چەوا کریە ئوسا دفرۆشم.

٤٢٨٩. چەوا سووکە - گاز پچووکە؟

٤٢٩٠. چییە، کەڤر کلیسێ کەت؟

٤٢٩١. چی مالێ خراڤ بوو، خولام کوتان،

بووکا مالێ رازا، قیز ئانی، دیسا خولام کوتان.

٤٢٩٢. چی تەیی رند هەیە، موقات ڤێدا، چی خێلقێی پاک هەیە، ئەوی ژی لێ زێدەکە.

٤٢٩٣. چۆیێ سالێ سالێرا دچە.

٤٢٩٤. چۆ، چۆ ڤەدگەرینە.

٤٢٩٥. چوڤ بسەنگینە، پاشێ ناڤێ گور بینە.

٤٢٩٦. چوو بۆ ریش، سمێلی نائەبان،

(بۆنا روودانێ چوو، سمێل ژی هیشت).

٤٢٩٧. چوو بوهوری، میراتا جینار نەگهیشتە جینێر.

٤٢٩٨. چوو گەلگەلێ، هات عەمەلێ،

وی دیسا عەمەلێ دەورا بەرێ.

٤٢٩٩. چووی مالەکی مێڤان، جیێ خوە بزانڤە تێ ل کو روونی.

٤٣٠٠. چوویا ژ چوویانە،

وەی حالێ مایانە.

٤٣٠١. چوویه تۆلانا کووچکا، هەستویا دکەرە.

٤٣٠٢. چووینا ڕیا ڕێبەریا ڕیاڕا کڤشە.

٤٣٠٣. چووم دەرمکێ، هاتم مینا کەرمکێ.

٤٣٠٤. چووم مالا دەورێشا،

دانی بەر من ماستێ گامێشا.

٤٣٠٥. چ بێژی ل بەژنا سیارێ من تێ.

٤٣٠٦. چ بێژم، چ نەبێژم،

دەردێ تە کەر و گێژم.

٤٣٠٧. چ بەر دێ چوو، چ سەر زین چوو.

ئا) چ سەر چوو، چ بەر چوو.

٤٣٠٨. چ بیردکی، بیر بکە، شیرێ دیا خوە بیر مەکە.

٤٣٠٩. چ بکم مێرێ کۆر،

چ بکم کراسێ سۆر؟

٤٣١٠. چ بکم جاهلێ کوندرڤالا،

بستینم کالا، بوخوم مالا.

٤٣١١. چ بکم، وەکی دنیا داوە، کێرا منە کۆیە.

٤٣١٢. چ بچنی، تێ وێ هلینی.

ئا) چی بچێنی، ئەوە ئەدرووێتەوە.

٤٣١٣. چ دەڤا کارە، ئستیێ وێ نە خارە.

٤٣١٤. چ دەردێ خوەدێ ددە، دەرمان عەسە پەیدا دبە.

٤٣١٥. چ دبێژی بێژە، قاشا کەمبەرا من ناشکێ.

٤٣١٦. چ دکیی، بکە، ژ هەڤالێ باش نەمینە.

٤٣١٧. چ دخوازی بێژە، تشت سێریدا ڕوونانی. ئەو کافرێ گێژە.

٤٣١٨. چ دچە، ژ بێخ دچە، ژ باخڤانچی چ دچە؟

٤٣١٩. چ دچە ژ عەمرێ مەریا دچە.

٤٣٢٠. چ زانی، بێژێ، هندکە.

٤٣٢١. چ کو هاڤینێ شین دبە، ئەو زڤستانێ لازم دبە.

٤٣٢٢. چ کو دچنیی ل بن دا دبینیی.

٤٣٢٣. چل بێشەر ناڤا ژنا دا دیا زەعفە، نەک ناڤا مێرا دا.

٤٣٢٤. چل بەردیرێ سالەکێ،
نابە دەوێ مالەکێ.

٤٣٢٥. چل حەرەفی نکارن ڕووتەکی بشێلین.

٤٣٢٦. چل چلە، چل بچە، چل ژی هات، بهار هات.

٤٣٢٧. چ ل لێڤە، چ ل دێڤە.

٤٣٢٨. چلپی سەر کوتیکا تێنە هوورکرنێ.

٤٣٢٩. چ ل هەڤانە، چ نان دوورە.

٤٣٣٠. چما ڕازێم نەوالێ کاش،
چما ببینن خەونێ شاش.
ئا) چما ڕازێم نەوالێ کوور،
چما ببینن خەونێ دوور.

٤٣٣١. چ مێزە دکی ل مزێ، هۆخە چارسەد ترامە.

٤٣٣٢. چ مەریکی بێوارارى،
تێ دەرمجە بێ ئیتبارى.

٤٣٣٣. چ مقەدارا خومدێ دایە تە، لێ پۆشمان نەڤە.

٤٣٣٤. چرایا کەڤم داڤنە سەر خانی.

٤٣٣٥. چرا شەوقی بۆ خۆی نییە.

٤٣٣٦. چ تێ سەرێ مەرف، ژ ئاقلێ مەرڤە.

٤٣٣٧. چ تە درێژ کریە، کریە ڕیا کادز؟

٤٣٣٨. چ تو دبێژی، مەسلەهەتە،
زانم بەختێ من نە ئەو بەختە.

٤٣٣٩. چ خوە بەر بارانێ شل دکی؟

٤٣٤٠. چ هەیە شوخولێ چیمە.

٤٣٤١. چ هووردا، چ تووردا.

٤٣٤٢. چڤا ل دنێ بمینی،

عەجێبا تویَ بڤینی،
و دل بکیی ئیسکینی.

٤٣٤٣. چقا کەڤرا باڤێژی سێ، وێ ئەوقا بعەوتە.

٤٣٤٤. چقا لێ درەڤی، هەوقا لێ دوالی.

٤٣٤٥. چقا مێرێ کەر هەیە، ژ دۆلا منە._ دگۆت حەسۆیێ پەرپووت.

٤٣٤٦. چقا مەرف دمەلسە، هەر وێ بقەوزە.

٤٣٤٧. چقا پڤکی ئاگر، ئاگر گور دبە.

٤٣٤٨. چقاس بلند فری، ئەقاس خوار دکەڤی.

٤٣٤٩. چقاس ب خەلقێ بشێوری، دیسا ب ئاقلێ خوە بکە.

٤٣٥٠. چقاس دووری، هاقاس گول و نووری.

٤٣٥١. چقاس دبی میر،
خودەیێ خوە نەکە بیر.

٤٣٥٢. چقاسی گران رِوونی، تێ خەلبار دمرێی.

٤٣٥٣. چقاسی زێدە ڤی، مەرڤێ پێش خو ژ خو زێدە بحەسڤینە.

٤٣٥٤. چقاسی ژی بخەڤتە، پارا وی دۆنزدەهـ مێتر جاون.

٤٣٥٥. چقاسی ژی دووری هەڤڤن، جینار خەیسەتێ جینارا هین دڤە.

٤٣٥٦. چقاسی ژی عەسلێ چێ ڤە، رەخ قژکێ کەڤە، وێ پێرا بڤە قژک.

٤٣٥٧. چقاسی ژی پینەکی،
دیسا ناڤە تشتەکی.

٤٣٥٨. چقاسی شەڤەرمشێدا رێ هەری، گا ئێریشا خوە ئوندا ناکە.

٤٣٥٩. چقاس نەمری، کالبی، تێ بمری.

٤٣٦٠. چقاس رِووڤی شەهرمزە بێ، ئەیارا وی باها نایێنێ.

٤٣٦١. چقاس سەرێ من بمینە،
عەجێبا وێ بڤینە.

٤٣٦٢. چقاس سەر عەردێیە، ئەوقاس ژی بن عەردێیە.

٤٣٦٣. چقاس سنگا بکوتە، ئێ ئاوقاس قولپا ڤێ خینێ.

٤٣٦٤. چقاس فەقیر بی، نەچە بەر دەرێ ئاغا.

٤٣٦٥. چقاس خرابیێ بکن، ئاگر بەعرێ ناکەڤە.

٤٣٦٦. چقا تووکی وێ بێ: "باران تێ".

٤٣٦٧. چقا هێرس ڕابیی تویێ زرار ڕوونێی.

٤٣٦٨. چاڤان ئانجاخ ئاخ تێر دکە.

٤٣٦٩. چاڤێ دوو ڕیا، خوەلی ل سەرا.

٤٣٧٠. چالکێن دەربێخی، چالە.

٤٣٧١. چارا بێچارا_خوەدێ یە.

٤٣٧٢. چێژکێ گورا مەریاڕا نابنە باڤ و برا.

٤٣٧٣. چێلەکێ ددۆشە خاتێ،
تۆ ددنە فاتێ.

٤٣٧٤. چێلەکەکە ڕێخازی ناڤێ گارانەکێ خراب دکە.
ئا) چێلەکەکی بەرێخ ناڤێ گارانەکێ خراب دکە.
ب) چێلەکەک ڕیخوو گارانەک حەرماند.

٤٣٧٥. چێلیێ مارا ژی ب ژاحرن.

٤٣٧٦. چێرە ل چیایێ ئاسێ دمینە.

٤٣٧٧. چەرمێ دەڤێ بارێ کارێیا.

٤٣٧٨. چەرمێ جەناگا سەر پشتا گایێ مەزنە،

٤٣٧٩. چەعف بۆنا دیتنێیە، لێ ئاقل بۆنا زانابوونێیە.

٤٣٨٠. چەعف ب بشکولێ دەرتێ.

٤٣٨١. چەعف دڤینە، دل دمینە.

٤٣٨٢. چەعف دڤینە، دل دحەڤینە،
ئاقل لێ دخە، وەلدگەرینە.

٤٣٨٣. چەعڤێ بەلەک تم بەلانە.

٤٣٨٤. چەعڤێ بن خوەلیێ کەسەک ژێ شەرم ناکە.
ئا) چەعڤێ بن ئاخێدا، کەس ژێ شەرم ناکە.
ب) چەعڤێ بن عەردێ ژێرا چ حۆرمەت؟

٤٣٨٥. چەعڤێ دەرییا، خوەلی سەرییا.

ئا) چەعفێ لە دەرێ، خۆلی تێ وەرێ.

ب) چەعفێ دو ڕێیا، خالی ل سەرا.

٤٣٨٦. چەعفێ دوول - دوول بەلەکن،

شوخولێ دوول - دوول گەلەکن.

٤٣٨٧. چەعفێ کۆر دلۆپەک ژێ هاتیە، هێ نەرازیی؟

٤٣٨٨. چەعفێ کۆر ژ یێ شەیتان چێترە.

٤٣٨٩. چەعفێ کۆر ساخ دبە، دلێ کۆر ساخ نابە.

٤٣٩٠. چەعفێ مەلّا چارن.

٤٣٩١. چەعفێ ڕەش نە حەوجێ کلدانێ.

٤٣٩٢. چەعفێ ترسییایی زوو خوەلی دکەڤێ.

٤٣٩٣. چەعفێ منی کۆر نەنێرە،

بەختێ من بنێرە.

٤٣٩٤. چەعفێ خوە کۆر دکە، نەفسا خوە کۆر ناکە.

٤٣٩٥. چەعفێ ئینسان ژ مال تێر نابە.

٤٣٩٦. چەعفەک پێش چەعفێ دنێڤا ئیشق نادە.

٤٣٩٧. چەعف کول بوون، یا چەعف کۆر بوون؟

٤٣٩٨. چەعف ڕەوشا مەریانە.

٤٣٩٩. چەعف چەعڤا شەرم دکە،

بەرتیل کەڤرا نەرم دکە.

ئا) چەعف ل چەعف شەرم دکە.

٤٤٠٠. چییا باشە بەرف لێ.

٤٤٠١. چییا بەرف کەت، زڤستان چ ما؟

زەڤی سپی بوو، دروونا وێ چ ما؟

مێر وەختا سپی بوو، مرنا وی چ ما؟

٤٤٠٢. چییا گۆتە چییێ (چیا). "بەرفا سەرێ من حەلیا،

پاییزە، زۆزانا من و تە دیسا گەریی..."

٤٤٠٣. چیا گۆتە چیا: "کانێ کۆچەرێ ڤان عەردا؟".

گۆ: "مالا خوه بار کرن، چوونه گوندا".

ئا) چیا گۆتە چیا: "کانێ خەلقێ ل ڤان چیا؟"

"پایزە، ئێل داگەریا".

٤٤٠٤. چیایێ بێ گول، مەرڤێ بێ سور، هەردو ژی یەکن.

٤٤٠٥. چیایێ بلند بێ بەرف ناڤە،

گەلیێ کوور بێ ئاڤ ناڤە،

مێشێ بێ هەچە ناڤە.

ئا) چیایێ بلند بێ دار نابە،

قیزا ئاغێ بێ یار نابە.

٤٤٠٦. چیایێ بلند دخازە بارانێ.

٤٤٠٧. چیایێ بلند تمێ سەر دوومانە.

٤٤٠٨. چیایێ بلند، ژ جینارا خراڤ چێترە.

٤٤٠٩. چیا ڕاستی چیایێ نایێ، لێ مەرڤ ڕاست مەرڤ تێ.

ئا) چیا ل چیا ناقەسدێ،

مێر ل مێرا دقەسدێ.

٤٤١٠. چیا چقاس بلند بە (دیسا) ڕێ پێ دکەڤە.

ئا) چیا چقا بلند بە، پێکە پێ دکەڤە.

ب) چیا چقا بلندە، ڕێ ئاوقا بەرڕا دچە.

٤٤١١. چیا کوتەکا عەردێیە.

٤٤١٢. چیرۆکا پیرێ نە خوەشە؟

٤٤١٣. چووکێ مالێ، کووچکێ مالێ.

٤٤١٤. چووک ل زۆزانا ڕابوون هەڤ، سەر گارسێ دێرشەوا سولها خوە کرن.

٤٤١٥. چووکەک دەستێ تە دا چێترە ژ دەهـ چووکێ ل سەر دارێ.

٤٤١٦. چڤیکا ڤیتڤیتانی تە مالا خوە خراب کر، مالا م ژی ل سەر دانی.

٤٤١٧. چڤیک سەر دارێ کەت، گۆ: "هۆقەکی بەز ژ ناڤا مِن حەلیا". ئیژار حاکمێ میرێ تەیرا گۆ: "یا حەیوانەت، تەڤی پوورتا خوە جۆخسەکی تونەیی، چاوا دو هۆقە بەز ژ ناڤا تە حەلیا"؟ چڤیک گۆ: "یا حاکمێ مە هەر یەک وەکو مێزینا خوە، وەزنا من

ئەڤە".

٤٤١٨. چلکەک – ملکەک.

٤٤١٩. چلۆ بێی خوەدێ ژ دارێ نایێ خوار.

٤٤٢٠. چرا بێ دۆن ڕۆنی (ڕۆنای) نادە.

٤٤٢١. چرا بەر کۆرانە.

٤٤٢٢. چرا دەرهوینان تا نیڤێ شەڤێ ڤێدکەڤە.

٤٤٢٣. چرا ئیشقێ نادە بن خوە.

٤٤٢٤. چرا کەسی حەتا سبێ ناشوخولە.

ئا) چرا نینە، کو حەتا سبێ (ڤێکەڤە) پێکەڤە.

ب) چرا حەموو کەسی حەتا سڤێ ڤێناکەڤە.

٤٤٢٥. چرکەک گارسێ وی هەیە، دەوا ئاشێ حەفت چەعڤی دکە.

٤٤٢٦. چرتۆ – مرتۆ سیاری بوون،

لۆما دنیا خراب بوو.

## ش

٤٤٢٧. شابوون ل مرتڤا نایێ.

٤٤٢٨. شای – شینێ بەتال دکە.

٤٤٢٩. شام دوورە، قەی مشار ژی دوورە.

٤٤٣٠. شام شەکرە، والات شیرنترە.

٤٤٣١. شام خوەشە شامیارا.

٤٤٣٢. شاران لە حەسرەت بەخدا ئەکرا، بەخداش وێران بوو.

(شەهەرا حسرەتا خوە ل بەخدا دانی، بەخدا ژی وێران بوو).

٤٤٣٣. شاهـ زانە شێرڤانی سونییە.

٤٤٣٤. شاهنە ل گوند ناهێلن، دڤێ: "چەکێ من بن مالا کیا".

٤٤٣٥. شەهدێ ڕووڤی دووڤێ ڕووڤییە.

٤٤٣٦. شێر بەم شکێنە نەک ڕێوی بەم خوات.

(برا شێر من بشکێنە، نەک ڕووڤی من بخوە).

٤٤٣٧. شێرە بەفرینە کەس لەی ناترسە.

(کەس ژ شێرێ ژ بەرفێ چێکری ناترسە).

٤٤٣٨. شێر ب لەپێ خوە، شێخادی (شێخ هادی) نایێ هەوارا تە.

٤٤٣٩. شێرەکی بریندار ژ بەر کیسۆڤا دچوو. کیسۆ گۆ: - "ئەڤ ڕیا مە تەڤاییە". شێر گۆ: "ئەز نەمربم ڤێ دەربێ، ئەزێ بمرم ڤێ کەربێ".

٤٤٤٠. شێر کال بوو، دبە کەنێ چەقەلا.

٤٤٤١. شێر کە پیر بوو، ئەبێ بە مەخسەرەی کەران.

ئا) شێر کە پیر بوو، ڕێوی دەمی تێ ئەژانێ.

(گاڤا شێر پیر بوو، ڕووڤی سەر دکەنن).

ب) شێر کە پیر بوو، چەقەل گالتەیی پێ ئەکات.

(گاڤا شێر پیر بوو، چەقەل سەر دکەنن).

٤٤٤٢. شێر کو شێرە، خوە ب شێرە.

٤٤٤٣. شێر لە بێشە دەرچە، چە نێر بێ چە مێ بێ؟

(شێر کو ژ مێشێ هاتە دەر، چ مێ بە، چ نێر).

٤٤٤٤. شێر ب فەنا تێ ئالتکرنێ.

٤٤٤٥. شێر ڕەخ شێرا لنگێ خوە درێژ دکە.

٤٤٤٦. شێر و نیڤ شێر یەکن.

٤٤٤٧. شێر شێرە، چ ژن، چ مێرە.

٤٤٤٨. شێتە، بۆ شێتیت؟ ئەلێ: "بۆم ئەلۆیێ".

(دینۆ، چما دینی؟ دڤێ: "ووسا م خوەش تێ").

٤٤٤٩. شێخ و پیر ل هەڤ کەتن، کەرەمەت ژ ئۆرتێ دەرکەت.

٤٤٥٠. شێورا چووکا (چڤیکا) ل سەر گارسێ مە مایە.

٤٤٥١. شەڤا ڕەشا، یان شۆڤە ڕەشا.

٤٤٥٢. شەڤا ڕەش ژ ئێڤاردا ڕەشە.

٤٤٥٣. شەڤەکە و دز هزارنە.

ئا) شەڤ یەکە، دز حەزارە.

٤٤٥٤. شەڤ و ڕۆیێ زانی، ڕیا بازێر نزانی؟

٤٤٥٥. شەو قەلایی مێردانە.

(شەڤ کەلا مێرانە).

٤٤٥٦. شەڤێ ڕەش کەلێ مێرانە،

کالە - کالێ خوەش بهارا دلانە.

٤٤٥٧. شەلبکی تەزەیە، ئاڤە شیرنە،

وەختا شەلبکی کەڤن دبە، ئاڤ تەعل دبە.

٤٤٥٨. شەل نییە، پای شکاوە.

(شل نینە، لنگی شکەستیە).

٤٤٥٩. شەراڤا بێ هەق هەر کەس ڤەدوخە.

٤٤٦٠. شەراڤێ، کڤاڤێ هایێ-هایێ،

کتاڤێ، حەساڤێ وای-وایێ.

٤٤٦١. شەراڤ ئەسلێ مەریا دەردخە.

٤٤٦٢. شەریکی دز و ڕەفێقی قەفلە.

(هەڤالێ دز و مفتەیە).

٤٤٦٣. شەرمە، ئیرۆ هۆقەیە، یا سبێ ڕتلە.

٤٤٦٤. شەرمە کیسەبرە.

ئا) شەرم - نەڤسبرە.

٤٤٦٥. شەری مار- بە دار.

(سوودا مەر- ب دار).

٤٤٦٦. شەر دەرباز دڤە، پاشی مەرڤ پۆشمان دڤە.

٤٤٦٧. شەرێ ئاخا سەر جمعەتیە.

٤٤٦٨. شەرێ نۆ، ڕەڤێ گەرمکە.

ئا) شەری نۆرا ڕەو گەرمکە.

٤٤٦٩. شەرێ پیس دو جارا شەر دخوازە.

٤٤٧٠. شەرێ سبا، خێرا ئێڤارێ چێترە.

٤٤٧١. شەرێ سبێ ژ خێرا دژمنا چێترە.

٤٤٧٢. شەرێ هەق نەهەقیێڕا.

٤٤٧٣. شەرمکی دکی، شەرمکی چێ بکە، شەرێ کۆتیا مەکە.

٤٤٧٤. شەرە، ومختا هات، خوە نکاری لێ بپارێزی.

٤٤٧٥. شەر ژی شەرە، نیڤ شەر ژی شەرە.

٤٤٧٦. شەر لە نیڤەی بگەڕێتەوە چاکترا.

(شەر نیڤی دا بسەقرە، باشترە).

٤٤٧٧. شەر لە شیڤ، ئاشتی لە خەرمان.

٤٤٧٨. شەر ل شۆڤێ، نە ل بێدەرێ.

٤٤٧٩. شەر خۆش نییە، شەرنامەی خۆشە.

(شەر نە باشە، شەرنەمە باشە).

٤٤٨٠. شەر خومشە مەیدانێدا.

٤٤٨١. شەو ئەنووێ بە جلی گایە، ڕۆژیش ئەلێ پاشایە.

٤٤٨٢. شەشتی ژی ئەزم، نەشەشتی ژی ئەزم.

٤٤٨٣. شەدێ ڕووڤی پۆچا وییە.

٤٤٨٤. شیڤا مە چیە؟

نیسک و عەدەس،

تۆڤێ وی ببرن ب مەقەس،

هەر وەلاتەکی چەپکەکی.

٤٤٨٥. شینای سەر کۆکا خوە شیندبە.

٤٤٨٦. شینا تەڤ برا شاییە.

ئا) شینا تەڤ هەڤال، شاییە.

ب) شینا تەڤ دنێ شاییە.

٤٤٨٧. شینا جینارا دا ناگریی، دەعواتا جینارا دا نالیزی، ئیدی چ جیناری؟

٤٤٨٨. شینێڕا ژی شورمت لازمە.

٤٤٨٩. شین – شای برێ هەڤن.

٤٤٩٠. شین شینێ تینە.

٤٤٩١. شیر بەرە – بەرە دبتە کەرە.

٤٤٩٢. شیر بوو میر، کەوانی بوو هێسیر.

٤٤٩٣. شیر ددۆشی، بشکۆلێ ژی دکی ناڤ.

٤٤٩٤. شیرێ دێ - حەتا پیرێ.

٤٤٩٥. شیرێ میا، ڕووسپیتیا کەڤانیيا.

٤٤٩٦. شیرێ من برا چێ بە، تۆیێ من پاک بە.

٤٤٩٧. شیرێ پایزا بدە عەزیزا،

شیرێ باهارا بدە یارا.

ئا) شیرێ پایزا بدنە عەزیزا.

٤٤٩٨. شیرێ حەلال حەرام نابە.

٤٤٩٩. شیرێ شێرە، عەیارێ سێدا نە.

ئا) شیرێ شێر عەیارێ شێر دا نە،

شێر بازۆ، شێر بینە.

٤٥٠٠. شیر دخوە شڤان، تۆ دخوە بەرخڤان، خەو دکە گاڤان، جەفێ دکشینە گۆلکڤان،

خالی سەرێ دیا گۆلکڤان.

٤٥٠١. شیرەتا مەزنا بکە، لنگێ تە کەڤر نەکەڤە.

٤٥٠٢. شیرەتا نەدە من، نێن بدە من.

٤٥٠٣. شیرەتا خەسووێ ل بووکێ.

٤٥٠٤. شیرەتێ مەزنا ب سەرێ خوەیە.

٤٥٠٥. شیر ژی یێ مەیە، عەیارشیر ژی یێ مەیە.

٤٥٠٦. شیر کە دۆشرا، ناچێتەچە گووان.

(شیر کو هاتە دۆتنێ، ئیدی ناکەڤە گوهانا).

٤٥٠٧. شوخولێ نە شوخولێ تەیە، خوە نەکە ناڤێ.

٤٥٠٨. شوخولێ شەڤێ نێچیرا ڕۆژێیە.

٤٥٠٩. شوریا من وی دبهورە.

٤٥١٠. شوخولا دەرەو نایێ ڕاستکرنێ.

٤٥١١. شوخولا ئوسول، هەم خوەدێ خوەش تێ، هەم ڕەسوول.

٤٥١٢. شوخول بوو دۆر،

ئۆجاخ بوو کۆر.

٤٥١٣. شوخول بکه ب ئەساس،
کو دل نەکە وەسەوەس.

٤٥١٤. شوخول ب کرنێ، کەر ب ئاژۆتنێ.

٤٥١٥. شوخول دەرباز بوو، نه بێ: "ئاخ"، نەبێ:
"واخ"
بەتەسلا نەکە چراخ،
دەڤێ گۆلا دامەچکینە باخ.

٤٥١٦. شوخولێ، کو دەستێ تە نایێ، لێ ئۆرالی نەڤە.

٤٥١٧. شوخولێ مەزن وەلداندنا مەزن دخوەزن.

٤٥١٨. شوخولێ تەبیر مەفا نابە.

٤٥١٩. شوخولێ هاڤینێ زڤستانێ دکن.

٤٥٢٠. شوخولێ قەلپا ناچە پێش.

٤٥٢١. شوخول کو دەست تە دا هەیە، نیڤجی نەهێلە.

٤٥٢٢. شوخولکارێ خوەیی، شیرنێ عەڤدایی.
ئا) شوخولکارێ خوە بە،
شیرنێ دلێ عەڤدا بە.

٤٥٢٣. شوخول کەرە، باژێ، برا هەرە.
ئا) شوخول کەرە، چۆشکە وێ هەرە.

٤٥٢٤. شوخول مرا بکە، لێ خوەرا هین بە.

٤٥٢٥. شوخول (پێشە) چەکە، بەریا خومکە،
کێ گاڤا لازمی تە تێ دەری ڤەکە.
ئا) شوخول چەکە، پاشلا خومکە،
تە حەوجەتێ، دەری ڤەکە.

٤٥٢٦. شووان مێلیبە لە گۆنی بەرانا پەنیر درووست ئەکات.

٤٥٢٧. شووان تا دانیشە گەلەیی دوور ئەکەوێتەوە.
(شڤان چقاس رووني، کەری هاوقاس ژێ دوور دکەڤە).

٤٥٢٨. شووژن ب فەن ددیی قولکرنێ.

٤٥٢٩. شووژنێ سەر تووژێ، بنی کونێ.

٤٥٣٠. شووژنێ چەعڤێ خوە نابینە،

دەرزیێ چەعڤێ هەڤالێ خوە دبینە.

٤٥٣١. شوورا ڕاست دوو گرام زهێر (ژەعر) تێدا نە.

٤٥٣٢. شوور دەرخستنێ شووندا، بێ لێدان ناخنە کالان.

٤٥٣٣. شوورێ کەسیڤا دو دەڤ ڤە ژی، نابرە.

٤٥٣٤. شوورێ نەهەقا ل پەیێیە.

٤٥٣٥. شوورێ تەعزی خوون دخوازە.

٤٥٣٦. شوورێ خیرەتێ سەر شوورێ ڕوحدار درداکریە.

٤٥٣٧. شوور کالانێ خوە نابرە.

٤٥٣٨. شوور کشاندنێ حەتا لێخستنێ ژی عەمرەکە.

٤٥٣٩. شوور مەریکی دوکوژە، لێ زمان حەزاری.

٤٥٤٠. شوور تێرادا ناسترە.

ئا) شوور تێرێدا نایێ ڤەشارتن.

٤٥٤١. شوور – شام، خەنجەر – مام، ژن – دۆتمام.

٤٥٤٢. شوورێ مەریێ مەزن ل عەردێ نامینن.

٤٥٤٣. شوورەک خوەش بارەک دلانە.

٤٥٤٤. شوور (خەبەر) ل شێکر شێرینترە.

٤٥٤٥. شووشا دەرزی هەڤ ناگرە.

ئا) شووشا دل کو شکەست، ناجەبرە.

٤٥٤٦. شووشتی – مووشتی سەر تەختە ڕوونشتی.

٤٥٤٧. شڤان بێ دەست و بێ کۆپال بوو، بێ پێ و بێ پێپار.

٤٥٤٨. شڤان ب کۆدا تێنە ناسکرنێ.

٤٥٤٩. شڤان دارێ چامێیە.

٤٥٥٠. شڤانێ کۆر، بزنێ کولەک دەرێ گۆمێ ڕاستی هەڤ تێن.

٤٥٥١. شڤانێ چێ ڕسقێ گور، دزا دبرە.

٤٥٥٢. شڤان کو دل بکە ژ نێری گولماستا چێدکە.

٤٥٥٣. شڤان و گاڤانا هۆره – هۆره،
ئەوان ترێ دنیا کۆره.

٤٥٥٤. شڤان و دیوان کێ دیتیه؟

٤٥٥٥. شڤا ڕاستیێ داوەشینه چەعڤێ برێ ئاخرەتێ.

٤٥٥٦. شڤکێ چڤا بەر توولا بهەژینی، تووله هاڤا در دبه.

٤٥٥٧. شلی – شاییۆ.

٤٥٥٨. شلی شورەتا دنێیه.

٤٥٥٩. شمکا خوه بڤەتینه، لێ ژ هەڤالا نەمینه.

٤٥٦٠. شریاعەتا ڕاست دەست جبراهیله.

٤٥٦١. شریکه حەتا نان فریکه.

٤٥٦٢. شرۆ هەیه، شرۆچی تونه.

٤٥٦٣. شرکێ ڕێخێ سەر پشتا مەریا دا کو نەچه، شرکێ ڕوون ژی سەر سڤرا وی دا ناچه.

٤٥٦٤. شوێن کلاوی با بردوو کەوتووه.
(پەی کۆمێ خوەی با بری کەتیه).

ج

٤٥٦٥. جار – جارا تێ، گایێ ڕەش بەر بارا تێ.

٤٥٦٦. جاهل کو بفره، باوار بکه.

٤٥٦٧. جاهل و ئالم کو ببنه وەکه هەڤ، دنیا وێ خراڤ به.

٤٥٦٨. جاو بوو کتان، دەو بوو دەرمان.

٤٥٦٩. جاوچێکری بێ کراس–دەرپێیه.

٤٥٧٠. جاوچێکری بێ کەفەن دەره.

٤٥٧١. جێرێ ئاڤێ ل سەر ڕیا ئاڤێ دشکێ.

٤٥٧٢. جەگەره ل جیه، دلی ل دوویه.

٤٥٧٣. جەلەبێ دیزا دەرخوون سەره.

٤٥٧٤. جەم بێ چەقەل نابێ.

٤٥٧٥. جەم تە برایە تەڕا،

پشت تە دژمنە تەڕا.

٤٥٧٦. جەم خەریبا سالەک دڤە سەد سالی.

٤٥٧٧. جەرچیێ باش دکارە جێرێ چەمبیل چێکە.

٤٥٧٨. جەهە کەرا هەبری دکە.

سەڤا شوورا مسری دکە،

مالێ دنێ مەریا بەنگی دکە.

٤٥٧٩. جەعشک کو مەزن بە، دیسا کەرە.

٤٥٨٠. جەوا کەسیڤا ئاڤێ ناینە سەر زەڤیێ.

٤٥٨١. جەعنی ناچن فەلا.

خارزی دچن خالا.

٤٥٨٢. جەعنمێ سیرا دکوتن، تو دەنگا دبهێی؟

٤٥٨٣. جیێ ئاڤ لێ هەڤە، بناڤ سەرێ کەڤرا ژی شین دڤە.

٤٥٨٤. جیێ ئەیی، من کر زەڤی.

٤٥٨٥. جیێ یەکی ل گوند نیبوو، دگۆت: "جیێ من بڤن مالا مالخوێ".

٤٥٨٦. جیێ من خراب کریە، توجار ئاڤا نابە.

٤٥٨٧. جیێ نەڤە جەنگ و قال، ناڤە مال.

٤٥٨٨. جیێ پاکی (قەنجی) لێ، خرابی چیە؟

٤٥٨٩. جیێ هەقی هەیە، نەهەقی دەرباز نابە.

٤٥٩٠. جیێ شین لێ، شای ژی لێ.

٤٥٩١. جی ژ دلا تەنگە.

٤٥٩٢. جینا بەعرە، جینا ژی تەرە.

٤٥٩٣. جینا گولە، جینا ژی کولە.

٤٥٩٤. جینار ئاگرێ ڕەخ تەدا یە، مقاتڤێدا، برا لنگێ تە نەکەڤێدا، نەشەخوتە.

٤٥٩٥. جینار دکەڤە تەنگاسیێ، دیسا جینار دەست داڤێژێدا.

٤٥٩٦. جینارێ باش ژ برێ مەرییا زێدەترە.

٤٥٩٧. جینارێ باش ژ قەومێ خراف چێترە.

٤٥٩٨. جیناریَ کال و باڤا ژ حەمووشکا زێدەترن.

٤٥٩٩. جیناریَ کولهاجەت، مینا دەردیَ بیَ دەرمان.

٤٦٠٠. جیناریَ مەریا ژی قاسی قەلپیَ مەریا ڕاستی مەریا تێن.

٤٦٠١. جیناریَ نێزیک دها زوو دگهیژە مەرڤا، نە کو بریَ دوور.

٤٦٠٢. جیناریَ تەیی نەیی خاینبە، قیزا کۆریَ مێر بکە.

٤٦٠٣. جیناریَ خراب بدە برەڤە،

درانیَ تە ئێشیا بکشینە-باڤێژە،

ئێشا هەردا ژی وەکە هەڤ خرابە.

٤٦٠٤. جیناریَ خراب ستروێ بەر چەعڤیَ مەریانە.

٤٦٠٥. جیناریَ خراڤ، کولهاجەتن.

٤٦٠٦. جیناریَ خراڤ مەریا بێرسق دکن.

٤٦٠٧. جیناریَ خراڤ مینا کاسا ژەرێیە.

٤٦٠٨. جیناریَ خراڤ، هەڕۆ زمانیَ وی سەڤا جینارا شوورە.

٤٦٠٩. جیناریَ خوەڕا بخوەزە، کو خوەدیَ بدە تە.

٤٦١٠. جیناریَ شین و شاییَ جینارا کڤشن.

٤٦١١. جینار زانە کی بەرخیَ بەر کیَ ماکیێە.

٤٦١٢. جینارتیا باش دەست حەموو کەسی ناکەڤە.

٤٦١٣. جینارتیا باش، کەرەما خوەدێیە.

٤٦١٤. جینار خوەزلیا خوە جینێردا تینە.

٤٦١٥. جینار خەیسەتیَ جیناریَ خوە زانە، وەکە خەیسەتیَ زارا خوە.

٤٦١٦. جینار چڤاسی تما ڤە، هەبوونا جینێر هەڤە، مەرڤ دیسا کاریَ تیَ دڤینە.

٤٦١٧. جینار جینێر ڕانەکە، کەس نکارە ڕاکە.

٤٦١٨. جینار قەنجییَ، خراڤییَ هەڤدو هین دڤن.

٤٦١٩. جینار وەکی چوو مالا جینارا، وەکی ئوسانە دەردەکی وی هەیە.

٤٦٢٠. جینکان مرتبیَ دبیَ: "ژن (ئا تە) ب حەڤت توورا دگەرە".

٤٦٢١. جی تەنگە، دلی فرەبە.

٤٦٢٢. جی هەیە خەڤەردی، خەڤەرنەدی، خەڤەردانیَ چێترە.

٤٦٢٣. جی هەنە جینە، جی ژی هەنە_خەراڤجینە.

٤٦٢٤. جیهی ئێشا ددانی زمان دهنگڤە.

٤٦٢٥. جۆ بە دیوارا هەل ئەگێرێ.

٤٦٢٦. جۆگەل لە دەریا لێل ناکات.

(جەو بەحر شێلوو ناکە).

٤٦٢٧. جۆلەکە خۆت چیت و گۆشتاوت چییە؟

(چڤیکۆ، تو ب خوە چیی، کو گۆشتاڤا تە چبە؟)

٤٦٢٨. جۆتێ زەخم خەتا پێشنڕا کڤشە.

٤٦٢٩. جۆتێ خوەیی ڕزیایی، ڕەخ کۆتانێ من نەخە.

٤٦٣٠. "جۆتیارۆ، تو چ دچنی؟"

"ئەکە چنی ب بێتە تو دێ بینی".

٤٦٣١. جۆت ل مرتبا نە ئانە.

٤٦٣٢. جوولەکەیی نابووت دەفتەری کۆن ئەخوێنێتەوە.

(جهوویێ کەسیب دەفتەرێ کەڤن دخوونە).

٤٦٣٣. جووجکێ مریشکا خورێ تەیرانە.

٤٦٣٤. جووانی وەکە دووڤێ ماسییە، تە گرت بەرنەدە، تە بەر دا پەی نەکەڤە.

٤٦٣٥. جفارا بەر بێ، زەڤیا بەر چایێ، تو کار ژێ نایێ.

٤٦٣٦. جفارە بەرێ ڤرە، پاشێ گرە.

٤٦٣٧. جفارە سەبرا مێرایە.

٤٦٣٨. جزیرا بۆتا مەرکەزێ خۆرتا.

٤٦٣٩. جلێ خوە هلددێ، بەریا کو بگهێ بۆرێ.

٤٦٤٠. جلێ خوە شل کر بەریا بارانێ.

٤٦٤١. جمعەت دکارە دەنگێ مەریکی ببرە،

لێ مەریک نکارە دەنگێ جمعەتێ ببرە.

٤٦٤٢. جمعەت کو بەلانگاز ڤە، ئەو قەلسیا ماقوولانە (ئاغا و بەگ).

٤٦٤٣. جمعەت نەینکا مەریانە.

٤٦٤٤. جمعەت، ڕەعمەت، لێ نەڤینیی زەعمەعت.

٤٦٤٥. جمعەت شێرێ کۆلگەدایە، هشیار بوو کەس پێ نکارە.

٤٦٤٦. جنەتا دژمنا مەریارا ناڤە جنەت.

٤٦٤٧. جنەتا ئەز نە تێدا بم، برا کەر تێدا ڤەگەڤزن.

٤٦٤٨. جنەتا جاهلارا جەرمەیە.

٤٦٤٩. جنەتی، بێ منەتی.

٤٦٥٠. جنەت رووێ عەردێیە.

٤٦٥١. جنەت حەمی جارا دەستێ کەسی ناکەڤە.

٤٦٥٢. جهێبوون ژی وەکە مرنێیە.

## ئێ

٤٦٥٣. ئێڤار تێ، خومێ سنیا ئار تێ.

٤٦٥٤. ئێ برچی چوو ناڤ جمعەتێ، ئێ تازی نەچوو.

٤٦٥٥. ئێ دەر هات، ئێ کو ل هوندر قەوتاند (دەر کر).

٤٦٥٦. ئێ ژ خودێ ناترسە، ژێ بترسە.

٤٦٥٧. ئێ کو ڤرا بکێ، لازم بزانبێ پینە بکێ.

٤٦٥٨. ئێ کو دڤێ سەرخواش ببێ، شووشە ناژمێرێ.

٤٦٥٩. ئێ کو ژ بۆ کرینا پرنجێ چوو چارسیێ، ل بلخوورا مال بوو.

٤٦٦٠. ئێ کو مرنێ ببینێ، ب نەخاشینێ قانە دبێ.

٤٦٦١. ئێ کو نە ل گۆڤەندێیە، خومش رەقاسە.

٤٦٦٢. ئێ کو خەبتی - نەخەلتی.

٤٦٦٣. ئێ کو خوێ چاندی، ئەو ژی مر.

٤٦٦٤. ئێ کو چوو - چوو، تو ل ئێ کو تێ سەکە.

٤٦٦٥. ئێلا خراڤ ناڤێ ئاخێ ژی خراڤ دکە.

٤٦٦٦. ئێلێ چ گۆت، ئەو راستە.

٤٦٦٧. ئێل ژ ئاغا ناترسە، ئێل خوە خوە ژ خوە شەرم دکە.

٤٦٦٨. ئێل کارە ماقوولا راکە، ماقوول ژی کارە ئێلێ راکە.

٤٦٦٩. ئێلکانێ دلا، ئەلکانێ بەرا گورترن.

٤٦٧٠. ئێل یەمان، بەگ یەمان،

ئێل ڕابوو، بەگ ئوندا بوو.

٤٦٧١. ئێل ماکا مەریایە.

٤٦٧٢. ئێ ل چیێ هات، ئێ بێخچە قەوتاند.

٤٦٧٣. ئێمیشێ ژ دارێدا هلانی ئەو شابوونا (ئەشقا) دلایە.

٤٦٧٤. ئێتیمێ دمریا پەرێ نەدین ژ بەریا،

دیتن، ئاقل نەمان ژ سەریا.

٤٦٧٥. ئێوا تلیێ، دمردا هێویێ.

## ق

٤٦٧٦. قازی و دزی چل ڕۆژی دا عەیان دبن.

٤٦٧٧. قازانی مێردان بە هەفت سال دێتە جۆش.

٤٦٧٨. قازیێ زارۆکا خوە خەنقاندیە.

٤٦٧٩. قازنجا خەلقێ مەریاڕا ناڤە ملک.

٤٦٨٠. قانتر چقاس نیرکێش بە، چقاس زەخم بە، تو پرسا عەسلێ وی بکی، ژ کەرێ بیتەر بوویە.

٤٦٨١. قارا خوە ناڤێ بەرا.

٤٦٨٢. قار، یان کار؟

٤٦٨٣. قاسکێ ڕەشکێ ب تەنییێ چکێ؟

٤٦٨٤. قاترێ قادی مەترسینە، تشت ژ تەڕا تونە.

٤٦٨٥. قاوە بەر چایێ دمرکەت، بهایێ چایێ کەت.

٤٦٨٦. قەوون ژ قاوون مەزتر هەیە.

٤٦٨٧. قەدا قۆتک، سەرێ نازا لۆتک.

٤٦٨٨. قەدرێ مەرڤا دەست مەرڤادا نە.

٤٦٨٩. قەدرێ پۆرێ سپی زانبە.

٤٦٩٠. قەدرێ سێ تونە، لێ یێ خومیێ؟

٤٦٩١. قەدرێ تەیی بها دەست کەتی ئارزان مەکە.

٤٦٩٢. قەدرێ خوەلیێ زانبی، ئەوێ ئەکن بدە.

٤٦٩٣. قەدری دان وا بە لێومەوە.

(قەدرێ درانا سەر لێڤانە.)

٤٦٩٤. قەدری زەر لای زەرەنگەرە وەیە.

(قەدرێ زێرا زێرکەر زانە).

ئا) قیمەتێ زێر و زیڤا زێرگەر زانە.

٤٦٩٥. قەدری مانگ نییە تا نەگەتە شەو.

(قەدرێ هیڤێ تونە حەتا شەڤ نەیێ).

٤٦٩٦. قەزیاک کو مەریا دقەومە ئەو کلە ڕوون دلێ خوە دخە.

٤٦٩٧. قەزیا کو هاتە سەری، خوەدێ چەعڤا ژێ خومیکە.

٤٦٩٨. قەل بە قەلیێ ئەوت؛ "ڕووڕەش".

(قارقار قارقارڕا دگۆ: "ڕووڕەش").

٤٦٩٩. قەلەم ژ شوور تووژترە.

٤٧٠٠. قەلەم نانێ ڕەحەتییە.

٤٧٠١. قەلپێ خاس باڤێژی ناڤا ئەگر ژی ناشەوتە.

٤٧٠٢. قەل چاوی قەل دەرنەهێنێ.

٤٧٠٣. قەمە زکێ یەکیڕا کرن، گۆ: "وەی ل من پشت"

گۆتنێ: "مە زکێ تە خستیە تو چما دڤێی پشت"؟

گۆت: "وەکی پشتا من هەبیا وە ل زکێ من نەدخست".

٤٧٠٤. قەنجیا مەریا دەست مەریادا نە.

٤٧٠٥. قەنجیا تەرا تووشی سارا.

٤٧٠٦. قەنجیێ بکە مالا خوەدا مەمر.

٤٧٠٧. قەنجییێ خوە بکە باڤێژە ئاڤێ.

ئا) قەنجی بکە بدە سەر کەڤرا.

٤٧٠٨. قەنجی قەنجیێ تینە، خراڤی خراڤیێ تینە.

٤٧٠٩. قەراش کو نە ل بەر ئاش ڤە، ئاش ناگەرە.

٤٧١٠. قەرز کۆن ئەبێ نافەوتێ.

(دمین کەون دبە، لێ ئوندا نابە.)

٤٧١١. قەسەب کەتبوو دمردێ بەزێ بزنێ،

بزن کەتبوو دمردێ ڕوحێ خوە.

٤٧١٢. قەت، یەکە سەقەت،

ڤی گوهی کەت،

گوهێ دنێڕا دمرکەت.

٤٧١٣. قەتلا (خوونا) مێرا عەردێ نامینە.

٤٧١٤. قە جلا خوە بن باڤێ خوەڕا ژی ناکم.

٤٧١٥. قەواتا کێ ناگهیژە کەرێ، پێلین دکوتە.

٤٧١٦. قەوات نە ژ گۆڤدێ ئیسانەتە.

٤٧١٧. قەولێ گران سەر مریا دڤێژن.

٤٧١٨. قەولێ مێرا سێ جارە.

٤٧١٩. قەوم هێدی - هێدی خەریب دبن،

خەریب هێدی - هێدی دبن قەوم.

٤٧٢٠. قەوم - قولبەیە.

٤٧٢١. قیزا ئاغا دخازە، لێ قەلنێ مرتڤا ددە.

٤٧٢٢. قیزا بەنیشتجوو ئار، ئەبوور ڕوو چوو.

٤٧٢٣. قیزا گوندی، گوندی خەیسەتێ وێ زانن.

٤٧٢٤. قیزا دەلالی ڕمڤەکە،

کورێ دەلالی ڤرمکە.

٤٧٢٥. قیزا کو باش، پەی بڤە کاش.

٤٧٢٦. قیزا سێ مە، ژنا مێرێ چێ مە.

٤٧٢٧. قیزا جینارا کێرهاتی نینە.

٤٧٢٨. قیزا جینێر جینار ددە مێر،

کورێ جینێر جینار دزەوجینە.

٤٧٢٩. قیز دارکا شکەستییە.

٤٧٣٠. قیز دەلالا مالێیە.

٤٧٣١. قیزەک ئانی، کۆفی دانی.

٤٧٣٢. قیزە – سۆرن،

خۆرتە – کۆرن.

٤٧٣٣. قیز نازاند، گوندەک بەزاند.

ئا) قیزەکی نەزاندی، گوندەکی بەزاندی.

٤٧٣٤. قیز تەشیا دێ هلتینە، کور کەڤانێ باڤێ.

٤٧٣٥. قیز تم و دایم پشتا دێیە.

٤٧٣٦. قیز چقاس مەزن بە، هاقا بەختێ قیزێ مەزن دبە.

٤٧٣٧. قیز چرا خەلقێیە.

٤٧٣٨. قیز جەهە، زوو دگهیژە،

کور گەنمە، دارەنگ دگهیژە.

٤٧٣٩. قوبێ سپی گشک نە زیارەتن.

٤٧٤٠. قولپا ب هەلینا دخینە.

٤٧٤١. قورووشێ خۆی سپی هلینە ژ ڕۆژا ڕەشرا.

٤٧٤٢. قووچێ هاڤینێ، باڤێژە کادینێ.

٤٧٤٣. قژکارا مەڤە هەڤال، ڕەخ کەوا گۆزەل کەڤە، برا نێچیرڤان تە بوکوژن.

٤٧٤٤. قژکێ دخواست مەشا وەردەکێ هین بە، مەشا وەردەکێ هین نەبوو، جۆتکا خوە ژی بیرکر.

٤٧٤٥. قنامەت – قییامەت.

٤٧٤٦. قرا تەڤ ئێلێ_دەعواتە.

٤٧٤٧. قسە یا لە شێت، ببیە، یا لە منال.

(خەبەرا ڕاست، یان ژ مەرێێ دین، یان ژ زارو ببهێ).

٤٧٤٨. قسەیی هەسابی زۆر زوو سەوز ئەبێ.

٤٧٤٩. قسەیی وەک قووری زستان (دووان باران) وایە.

٤٧٥٠. قسە کەوتە زاری، ئەکەوێتە شاری.

(قسە کەتە سەر زارا، وێ بکەڤە ناڤ شەهەرا).

٤٧٥١. قسە لە پاش هەفت کێو ئەگاتەوە بە خێو.

(خەبەر حەفت چیا ژی دەرباز دبە، دگهیژە خایی).

٤٧٥٢. قسە حەزارە دوانی بە کارە.

٤٧٥٣. قسە حەتا نەکۆلیٚ دەرنایەت.

٤٧٥٤. قسمەت هەیە بۆی ئاڤیٚ خوەدێیە.

٤٧٥٥. قفل بۆ پیاڤی بیٚ حەیایە.

و

٤٧٥٦. وان نە تو تشتە،

لیٚ بەرێزەر ل پشتە.

٤٧٥٧. واریٚ بیٚ ئاڤ دانەینە.

ئا) واریٚ بێوا دانەینە.

٤٧٥٨. واریٚ دەولەتیا نیبە، سەر دانەینە.

٤٧٥٩. وار - واریٚ هێشین،

بەخت - بەختیٚ پێشین.

٤٧٦٠. وێدا تیٚ هۆرە - هۆرە،

گاکی ڕەشە، یەکی سۆرە،

ئەوی تریٚ دنیا کۆرە.

٤٧٦١. وێلیٚ ژنا دچنە کولینیٚ،

وێلیٚ مێرا دچنە گاستینیٚ.

٤٧٦٢. ویٚ ل سەر جلا جهێز کفش بە.

٤٧٦٣. ویٚ قووشیٚ ناچی (ناچە) مووشیٚ.

٤٧٦٤. وەی دنیاییٚ جۆریٚ ب جەفاییٚ،

جەفا بیٚ سەفاییٚ، دەورانا چوو پاژداناییٚ.

٤٧٦٥. وەی کالیٚ، وەی پیریٚ،

مرن چێترە ژ فەقیریٚ.

٤٧٦٦. وەی ل گێرس کورم لێکەت.

٤٧٦٧. وەی ل ئاخری، وەی ل ئاقووبەت،

٤٧٦٨. وەی ل وی لێ قەومی.

٤٧٦٩. وەکە مێوژیە، دەنگ وەکە شەوژیە.

٤٧٧٠. وەکە پرچاموو (پێپووکێ) خوە پێ دا ڕوقوچاند.

٤٧٧١. وەکی بێژن کەسیڤا مالێ دەولەتیا خار، وێ ژی باوار نەکن.

٤٧٧٢. وەکی بەر بووکێ تشتە نەڤێی، پاشێ بووکێ نایێ.

٤٧٧٣. وەکی گۆلکەکە مەرییا هەبە مەری وارا دا نامینە.

٤٧٧٤. وەکی گوری پاک بیا، ستوێ وی ژی وێ بزڤریا.

٤٧٧٥. وەکی گور هاش قەواتا خوە هە ڤە، وێ دنێ خرا بکە.

٤٧٧٦. وەکی دەها هێژایە، پانزدا ژی هێژایە.

٤٧٧٧. وەکی دەم مەریاڕا نەچوو، گەرە مەرڤ دەمێڕا هەرە.

٤٧٧٨. وەکی دەوێ مەریا هەڤە مێش ژ بەغدایێ تێن.

٤٧٧٩. وەکی دو دل بڤنە تەڤای،

وێ چیا هلدن بدنە سەر چیای.

٤٧٨٠. وەکی دز هەبن، شەڤەرەش زەعفن.

ئا) هەرگێ یا دز بیی شەڤەرەش گەلە هەنە.

٤٧٨١. وەکی ئەم هەڤ ناس نەکن ،ئەمێ سەرێ باڤێ هەڤ سۆند بخون.

٤٧٨٢. وەکی کاوا من ڕندە–بەدەو چ بکم شوخول.

٤٧٨٣. وەکی کەسیڤێ بکەنە، خوەدێ چما کەسیڤ کریە.

٤٧٨٤. وەکی کووسی ژ قالکێ خوە دەردکەڤە قێلک بەگەم ناکە.

٤٧٨٥. وەکی مالخوێ من هولۆ بە، خارنا من وێ چلۆ بە.

٤٧٨٦. وەکی مەری هاش خرافیا خوە هەڤە، خرافیێ ناکە.

٤٧٨٧. وەکی مەرڤ گورا زکا بکە، وێ مالا خراڤ بکە.

٤٧٨٨. وەکی مەرڤ جینارتیا بۆشا بکە، وێ پێڕا بڤە بۆشە.

٤٧٨٩. وەکی مە هەڤ ناس نەکرا، مەیێ سەرێ باڤێ هەڤ سۆند بخارا.

٤٧٩٠. وەکی مەعر نەیی مووربیا لنگێ وی نە دکەتە زکێ وی.

٤٧٩١. وەکی نەبیا، نەدهاتە گۆتنێ.

٤٧٩٢. وەکی نە دەفچیی دەفێ مەخە.

٤٧٩٣. وەکی نەگهیشتی دەولەتییا دەوسا واری وان داینە.

٤٧٩٤. وەکی پیری نمێژکاربە، هنگێ بێژە، ئینی و دوشەم زەعفن.

٤٧٩٥. وەکی ڕمز دکەلهن،

سماق ب شوونێ هێشین دبن.

٤٧٩٦. وەکی سەر مریا گریێ تە نایێ، ڕێنجبەرێ خراڤ بینە بیرا خوە.

٤٧٩٧. وەکی تە ئاڤ ژ کانیکی خوار، بشێکرینە.

٤٧٩٨. وەکی توی ئاقلی دوور بفکرە.

٤٧٩٩. وەکی خەریب بڤە پادشا ژی، وێ دیسا بێژە ئاخ م خەریبێ.

٤٨٠٠. وەکی خوەدێ بدا مە بەخت،

ئەمێ ژی ڕوونشتبیان سەر تەخت.

٤٨٠١. وەکی خوەدێ ڕۆژ بدا ئێتیما مەرا سەر پشتا دەڤێ لێ نەدخست.

٤٨٠٢. وەکی هەڤالێ ئاڤێ کەڤر نیبە، دەنگ ژێ نایێ.

٤٨٠٣. وەکی هەڤال هەڤێل نەڤینە،

ئاشێ عەجەلێ سەر سەرێ خوە دگەرینە.

٤٨٠٤. وەکی هەرد چەعڤ هەڤ بڤینن، وێ هەڤسوودیێ هەڤ بکن.

٤٨٠٥. وەکی هەسنی نەیی ئەساسە،

تو زێر بکی کراسە،

نە دبە کێرەندی، نە دبە دەعسە.

٤٨٠٦. وەکی شووشا دلێ مەرڤ شکەست، ساخکرن چەتنە.

٤٨٠٧. وەکی جنەت و جەرمە هەبیانا، مەڵە ناها زوودا جەرمێ دا بوون.

٤٨٠٨. وەکی قۆمسیا نیبە، توجارا بێدلی ناکەڤە ئۆرتا جینارا.

٤٨٠٩. وەک کەوا دوژمنێ جنسێ خوەیە.

٤٨١٠. وەک مارا، ب ئاخێ ددەبرێ.

٤٨١١. وەک مارە، بێ جی و بێ وارە.

٤٨١٢. وەک نیسک، بەر و پشت بۆ نیبە.

(وەک نیسکە، بەر و پشتا وی تونە).

٤٨١٣. وەک پسیا دیووڤ ب ئار (ئاگر).

٤٨١٤. وەک هورچێ دیندۆق دییە.

٤٨١٥. وەک چرا شەوقی بۆ ژێر خۆی نییە.

٤٨١٦. وەک چرا شایە، سیبەری بۆ خۆیە و تیشکی بۆ بێگانەیە.

(وەک چرێیە، ڕۆنکایێ ددە خەلقێ، لێ خوەڕا سی دهێلە).

٤٨١٧. وەلاتێ خەریبیێ مەرڤ بڤە پادشا ژی دیسا حەساڤێ خولامایە.

٤٨١٨. وەلات هەنە خەراوستانن،

وەلات هەنە گولستانن.

٤٨١٩. وەلات ژ دێ شیرنترە.

٤٨٢٠. وەرە بەر بارێ خوە بسەکنە.

٤٨٢١. وەرە برووێ تە شەکم، چەعڤێ تە دەرخم.

٤٨٢٢. وەرسێ دەرهوا کنە.

٤٨٢٣. وەرسێ دۆستا هەرە بیرێ، شەربەتا دژمنا نەخوە.

٤٨٢٤. وەرسێ وی ڕزیە، پێ داناکەڤمە بیرێ.

٤٨٢٥. ار وارێ هێشینە،

بەخت بەختێ پێشینە.

٤٨٢٦. وەختا ئاگر عەردێ دکەڤە، تەر، هشک تەڤ دشەوتە.

٤٨٢٧. وەختا با بێ بدێرە، وەختا نایێ گوهـ بدێرە.

٤٨٢٨. وەختا دێ دمرە، دەستێ وێ ژێکن، پێ ئێتیما بکوتن.

٤٨٢٩. وەختا دکەڤیی تەنگییێ، لازمە یان قیزمکە تە چێ هەبە، یان هەسپەکی تە بەزێ.

٤٨٣٠. وەختا زاڤا نە ب دلێ باڤێ بووکێ بە، قەلەن لێ زێدە دکێ.

٤٨٣١. وەختا کانی هەیە، گەرە ئاڤێ ژێ هلچنی.

٤٨٣٢. وەختا مەری دڤە قازی، گەرە قازیێ هەڤیێ ڤە.

٤٨٣٣. وەختا کەسیبی تونە بە، قەدرێ پەرە وێ چبە؟

٤٨٣٤. وەختا مالخوێ مالێ سلۆ بە، خارنا کۆلفەت سەر چلۆ بە.

٤٨٣٥. وەختا مەرڤ تەنێ دبە، گەرما هاڤینێ دا ژی دبەعجە.

٤٨٣٦. وەختا نێچیرا من تێ، خەوا تەژییێ من تێ.

٤٨٣٧. وەختا تو باڤێ خوە حزدکی، باڤێ خەلقێ نەبێژە.

٤٨٣٨. وەختا خوەدێ بدە لێی ژی ددە.

٤٨٣٩. وەختا هەیە-مێڤانی،

وەختا تونە-گڕلکڤانی.

٤٨٤٠. وەختا هڕل هاتە دەرپێ گەرمکێ لێخی هەرە.

٤٨٤١. وەختا شەرا-خال و خارزی،

وەختا کەڤچی-ئاپ و برازی.

٤٨٤٢. وەختێ گرێ من بێ ئەز دەستێ خوە وا نەخورینم، عەڤدا نکارە بوخورینە.

٤٨٤٣. وەختێ ئەز بووک ڤم تو شووتک بووی.

٤٨٤٤. وەختێ مەرڤ زێرە.

٤٨٤٥. وەختێ خیار تەرن، دێرشەوی کەرن، وەختێ خیار هشک دبن، دێرشەوی گولشک دبن.

٤٨٤٦. وەختێ شەرا بانکن کێرا،

وەختێ فراڤینا بانکن خارنا.

٤٨٤٧. وەختێ ترشکا عەمەلێ ئەیشکا.

٤٨٤٨. وەعدە هەیە ژەعر ژی دەرمانە.

٤٨٤٩. وی ئەرەزی گوشە-گوشە،

کی دڤێ دەوێ منی ترشە.

٤٨٥٠. وی مەرێڕا هەڤالتیێ بکە، وەکی دەستێ وی سەر دەستێ تەڕا ڤە.

٤٨٥١. ووژدان ژ ووژدان چێتر هەیە.

## ئ

٤٨٥٢. ئینسان ب بژانگێ خوّ تێ دالقاندن.

٤٨٥٣. ئینسان ب زمانێ خوە دکەڤە.

ئا) ئینسان ژ ئاقلێ خوە دکەڤە.

٤٨٥٤. ئینسان گیایە، کو تو ئاڤ بەردێی سەرێ ئێشین بڤە، بەرنەدێی سەرێ ئێ هشک بڤە.

٤٨٥٥. ئینسانێ ئاغا بە خولام نابە.

٤٨٥٦. ئینسانێ سالهـ، بەرخێ جنەتێیە.

٤٨٥٧. ئینسانێ تما، نۆبەدارێ مالێ خوەیی.

٤٨٥٨. ئینسانێ فەقیر کۆرە.

٤٨٥٩. ئینسان ژ ئینسان ئاقل دستینە.

٤٨٦٠. ئینسان ئەختیارە، لێ دلێ وی جانە.

ئا) ئینسان پیر دبە، بەس دلێ هینسان پیر نابە.

٤٨٦١. ئینسان سالەکێ تێ دنیایێ، سالەکێ ژی ژ دنیایێ دچە.

٤٨٦٢. ئینسان سەبر ژێرا لازمە.

٤٨٦٣. ئینسان سەر وووژدانێ خوە دمەشە.

٤٨٦٤. ئینسان تەڤ ژ متالا دکەڤە.

٤٨٦٥. ئینسان خوە قیمەت ددە خوە.

٤٨٦٦. ئینسان هەیە_بێ بەخت،

ئینسان هەیە ب بەخت.

٤٨٦٧. ئینسان هەرکەس ڕادهێلا ئاقلێ خوە هلتینە.

٤٨٦٨. ئمبارا ڤالا، کۆدا بێ بنی، چاپکە، ها چاپکە، تشتە ژێ چێ ناڤە.

٤٨٦٩. ئمبارا تژی، زکێ برچی کێری تشتەکی نایێ.

## چرا ها دبێژن؟

"ئەز ژ خوەڕا دبەزم، تو ژی ژ خەلقێرا دبەزی".

نێچیرڤانەکی تەعژی بەردا کێورووشکێ، کێورووشک نەگیهایێدا. ڕابوو ژێ پرسی گۆ: "چما ئەز ناگهم تە، ئەز هەوقاس دبەزم،،. کێشرووشکێ لێ ڤەگەراند گۆ: "ئەز ژ خوەڕا دبەزم، تو ژی ژ خەلقێرا دبەزی".

"تە ب دەڤێ خوە پفدا، دەستێ خوە گرێدا".

یەکی مەشک پفدا، دەڤێ مەشکێ ب دەستێ خوە گرێدا و کەتە ئاڤێ. ئۆرتا ئاڤێ دا دەڤێ مەشکێ دەست وی فلتی ڤەبوو. مێرک کر گازی، گۆ: "هەوار". یەک بەر ئاڤێ بوو گۆ: "قوربا، تە ب دەڤێ خوە پفدا، ب دەستێ خوە گرێدا،،

"سم _ سمێ کەرێنە، فێل - فێلێ، پەرێنە".

وەختەکێ مالەکە گرانە مەزن دا بووکەکە دز هەبوویە. چقا کەڤانیا مالێ دەو دکلا ڕوون دکرە کووپەکی، ئەو هەر جار دکەتە شکێ ڕوونێ وێ تێ دزینێ. کەڤانی دوشورمیش بوو، خاست بزانبە کێ ددزە ڕوونێ وێ. ئەوێ نێزیکایا کووپێ ڕوون کولە دودو ئار سەر عەردێ ڕەشاند، کو دەوسا لنگێ دز ناس بکە.

ناڤێ بووکا دز پەرێ بوو. ڕۆکێ ئەو تێ، وەکی ڕوون بدزە، دبینە کو دۆرا کووپ ئار ڕەشاندیە. دوشورمیش دبە، دچە تەولێ کەرێ دەردخە، لێ سییار دبە داژۆ تێ بەر کووپ دسەکنە. چقا لێ ڕوون لازم دبە ئەو ژێ هلددە.

کەڤانی تێ لێ دنهێرە، وەکی دۆرا کووپ تەنێ دەوسا سمێ کەرێ تێنە خویانێ. دچە کووپ دنهێرە، دنهێرە ڕوون دیسا دزینە. دسەکنە و دبێژە: "ڕاستە سم - سمێ کەرێنە. لێ فێل_فێلێ پەرێنە".

وارس و گارس؟"

یەکی، گۆ، چوو مالا یەکێ وارس خاست، گۆ: "ئەمێ هەرنە ئاش_. گۆ: "مە وارسێ خوە گارس سەر ڕاخستیە". "حەیران،_ گۆ،_ وارس و گارس؟". "ئێ،_ گۆ،_، حەیران مەعنا نەداینێ چیە؟"

"چقاس خرابیێ بکیی ئاگر بەعرێ ناکەڤە".

جارەکێ پیرەک تەرتە سەرگێن نفت دکە، هلددە دچە بەر بەعرێ. یەک ژێ دپرسە، دڤێ: "پیرێ توێ کودا هەری؟ پیرێ دڤێ: "ئەزێ هەرم بەعرێ بشەوتینم. یێ دن دڤێ: "پیرێ لێ پێ تەرتێ سەرگێن بەعر تێ شەوتاندن پیرێ دڤێ: "ئێ، تشتێ ئەز خرابیا خوە دکم، چ دڤە برا بڤە".

"کێ ژ مالێیە حالێ مالا زانە".

رۆژکێ مەریک تێ مالەکێ مێڤان. مالخوێ مالێ مالدا نابە. مالدا تشتێ خارنێ نابە. نیڤرۆ مێڤان ڕادبە دچە. ئێڤارێ مالخوێ مالێ تێ، ژن دڤێ: "مێڤانەک هاتبوو مالا مە_. مێر دپرسە: "لێ تە تشتەک حورمەت کر، تەشتێ دا بەر؟" ژنک دڤێ؛ "وەڵە مێرک مالدا تشت تونەبوو م بدا بەر". مێر دڤێ: "وەڵە وێ هەرە ناڤێ مەیێ دنیایێ خە_. ڕادبە هەسپێ خوە سییار دبە، پەی مێرک دکەڤە کو بگرە بکوژە. لێ نیڤێ ڕێ ڕاستی مێڤان تێ، سلاڤێ ددێ دڤێ: "چەوانی". ئەوی مێڤانی فەعمدار بوویە، دەست خوەدا نێتا مالخوێ مالێ فەعمدکە و دڤێ: "کێ ژ مالێیە_حالێ مالێ زانە". مێرک دڤێ: "وەکی ئوسانە دە هەرە، شیرێ تە تە حەلال بە_.

"مێڤان هەیە ئەزراهیلە"

جارەکێ مەریک دچە مالەکێ مێڤان، ئەو کو بەر دێری ژ هەسپێ پەیا دبە مالخوێ مالێ دەرتێ پێشیێ. مێڤان سەلامێ ددێ. مالخوێ مالێ دڤێ: "ئەلێکم سەلام، ئەزراهیلێ من".

دچن مال دا ڕوودنێن، نان دادنێن، نان دوخون، خوەیێ مالێ دڤێ: "ڕابە ڕازێ بەرخێ من".

مێڤان دوشورمیش دبە: "وەختێ هاتم چرا ئەوی مرا گۆ، ئەزراهیلێ من و هێژا ژی گۆ بەرخێ من؟"

وێ شەڤێ مێڤان مالا مالخوێ ڕادزێ. سبێ ئەو ڕادبن تەشتێ دوخون، پاشێ مێڤان خاترێ خوە ژ مالخوێ دخوازە، هەسپێ سییار دبە کو هەرە، مالخوێ مالێ دڤێ:"هەرە، تەڕا ئۆخر بە زورنەچیێ من".

ئەڤا مێڤانا دچە زەعف دگەرە، مەریێ زانە دبینە و ژ وان دپرسە جاهابێ وان پرسا. مەریێ دنێ دیتی ژێڕا دبێژن: "ئەوی کو گۆتیە "ئەزراهیلێ من_، دیمەک مێڤان هەیە چاخێ تەزە تێ ئەزراهیلە، لێ وەختێ مالدا نان خوێ دخوە دبە مینا بەرخا، وەختێ ڕادبە کو

هەرە ئیدی بەختێ وی دەستێ وی، چ بخوازە ئەوێ قاسی شیرێ خوە وێ گلی بکە، دەنگێ وی مینا زورنەچییا وێ دنێ بەلا بە.

"ئەز نامرم تیرا پێرا،

ئەز دمرم خەبەرا ڤێرا".

خەزال بریندار ببوو. نێچیرڤان لێدابوو تیر مێلەکا خەزالێ دا بوو. خەزالێ گۆ: "ئەم چاوا بکن دەستێ ڤان نێچیرڤانا، ڤە ناهێلن ئەم شەڤێ ژی رازێن". بەقێ سەرێ خوە دەرخست گۆ: "خووشکا خەزال، حالێ مە ژی دەست نێچیرڤانا دا تونە". خەزالێ گۆ: "ئەز نامرم تیرا پێرا، ئەز دمرم خەبەرا ڤێرا. ئەز خەزالم، مەعدێ بەندا ناچە پێشبەری تە نان بخون، یا من، ئەز چیا بانیا دگەرم، حەزار گولی گولەکێ دچرپینم، سبێ حەتا ئێڤارێ سەر ئاڤێ کانیامە، تو هاتی خوە دکی هەڤالێ من؟".

"چ مووشێ، چ بەر دارا دەرکووشێ"

مەلە گۆتە ژنا خوە، گۆ: "نانێ من بپێژە ئەزێ سبێ هەرمە مووشێ". ژنکێ رابوو تەندوور دادا، نانێ وی پەعت، وەکی سبێ شەبەقێ مێرێ وێ هەرە مووشێ. مەلە رابوو نانێ خوە هلدا هات، لاندکا نەڤیێ وێ دەرێ بوو، بەر تەلدێ لاندکێ روونشت، نانێ خوە دانی بەر خوە، نان خوار. ژنا مەلە گۆتێ: "مەلە تە ئەز خاپاندم، هنە روونێ من هەبوو من ئانی تەرا کرە پێخوون، کرە ناڤ نانێ تە، توێ بچووای مووشێ، تە چرا ئەز خاپاندم". "ئێ،_ گۆ،_ ژنک تەرا یەک نینە، تشتێ ئەز تو هەڤ نابینن، یان مووشێ، یان بەر دارا دەرکووشێ".

"چوونە کڤاڤا، لێ کەر داخدکرن".

دو رێوی رەخ گۆمەکێرا دەرباز دبوون، نشکێ ڤا بینا کڤاڤا کەتە پۆزێ وان. ژ رێویان یەکی گۆتە هەڤالێ خوە: "ئۆلۆ، خوەدێ زانە ڤرا پەز سەرژێکرنە و کڤاڤا چێ دکن، وەرە ئەم هەرنە مێڤانی". هەردو رێوییێ برچی چوونە گۆمێ و دیتنیا کو دیتن، شڤانا کەرێ خوە داخ دکرن.

گۆ: "چوونە کڤاڤا، لێ کەر داخدکرن".

"کەرێ کریڤ چ ئانیە، وێ وێ ژی بڤە".

یەک کەرا خوە سیبار دبە دچە مالا کریڤێ خوە. چاخێ ئەو نێزیکایا مالێ دکە، ژ کەرێ پەیا دبە و کەرا خوە ددە بەر شڤدارا..

مالخوێ ژ مال دەرتێ دڤینە کریڤێ وی کەرا خوە دایە بەر شڤدارا دکوتە، دڤێ: "کریڤ چما کەرا خوە دکوتی". دڤێ: "لێ چەوا بکم، من چ لێ بارکر نە ئانی، ئەز وا دەستڤالا تێم مالا کریڤێ خوە_. مالخوێ دڤێ: "قوربا، مەرڤ سەڤا وێ یەکێ کەرا خوە دکوتە؟ کەرێ کریڤ چ ئانیە، وێ وێ ژی بڤە_.

"خاتوون، خاتوون م تە ل ژۆر دیت،

م تە ل ژێر دیت.

جارەکێ خۆرتەکی کورمانج چوو گوندەکی. ل سەر رێ مالەک دیت. ڤا مالا یەکی پیر رادکەڤە. ژێر گۆت: "پیرێ، پیرێ ئاڤ ل با تە هەیە؟"

ژێر گۆت: "کورۆ، هەکە ئەز ل ژێر بووم م دا تە ئاڤ، بەلەم ئەز ل ژۆرم".

جارەکی دن خۆرت هات ژێر گۆت: "خاتوون نان با تە هەیە". ژێر گۆت: "کورۆ، ئا ناکا نان با من ڤرکا تنەیە، ئەو ل ژۆرە. ئەگەر ئەز ل ژۆر باما م دا تە. ئیـژار ژێر گـۆت: "خاتوون، خاتوون م تە ل ژۆر دیت، م تە ل ژێر دیت.

"بوو قسا بزنێ هەسەن چەرمۆ".

گۆ حەسەن چەرمۆک هەبوو، حەڤت بزنێ وی هەبوون.

ڕۆکێ کەتە پێشیا بزنێ خوە، بر سەر کانیێ ئاڤدە. بزنەکێ بناتارا بزنەکێ دا ئاڤ نە خار، حەتا سەرێ کانیێ رەڤین. ئاخریێ هەر حەڤت ژی مانە تی.

"هەر کەزیسۆرەکێ سمبێلسۆرەکی ل بەر هەیە".

یەکی گۆتە دییا خوە: "ئەزێ هەرمە شێر کەزیسۆرەکێ ژ خوەرا بینم". دیا وی گۆتێ: "لاوێ من نەچە، هەر کەزیسۆرەکێ سمبێلسۆرەکی وێ هەیە". لاوک چوون. ئەسکەرێ وان شکەستن. ئەسکەرەکی ژ نەیارا ل دوو کەت، هات کو وی بکوژە. لاوک قیر کر، گۆت: "ئاخ یادێ". ئەسکەر گۆتێ: "ئەز تە ناکوژم، کو تو بێژیی من ژ بۆ چ تە گۆ: "ئاخ یادێ". لاوک ژێرا گۆت، کو من خەبەرا دیا خوە نەکر.

ئەسکەر دەست لێ کشاند. خۆرت ڤەگەریا مالێ. دیا وی پرس کر: "کا کەزیسۆرا تە؟_ گۆ: "یادێ، ئەڤ راستە، کو هەر کەزیسۆرەکێ سمبێلسۆرەکی ل بەر هەیە".

"ما ل هەسپەکی و سێ نالا".

دبێژن هەسپێ جۆتکارەکی تونەبوو. ڕۆژەکێ ئەو رابوو چوو بازێر بۆ هەسپ بکرە. ب رێ دا نالەک دیت و راکر، هەڤالێ وی راستی وی هات پرسی: "گەلۆ کار و بارێ تە چەوا

يه؟_ گۆ: "من نالەک دیت، ما ل هەسپەکی و سێ نالا...

" نانەک گەرم و ئاڤەکە سار نە تشتە،

لێ نە کارا هەر کەسییە".

ڕۆژەکێ مێڤانەکی مالەکێ هات. مالخوێ ل مال بوو، ئەو تشتەک نەدا، ژ بەر کو ل مالێ ژ نان پێڤا تشتەک تونە بوو. مێڤان برچی ڕابوو چوو.

ئەو مێڤان جارەک دی مالەکی دی بوو مێڤان. پیرەک ل مالێ بوو، ب دلەکی خوەش نان و ئاڤ ژ مێڤانێ خوەڕا دانی و مێڤان زەعف ژ پیرێ ڕازی بوو. گۆ: "نانەک گەرم و ئاڤەکە سار نە تشتە، لێ نە کارا هەر کەسییە".

"کی دخەبتە ئەو دخوە".

خۆرتەک چوو خوەڕا ڤیزەکە زەعفە بێخیرەت ئانی. سێ ڕۆژا وەکی بما تی، ئەوێ خوەڕا نەددیت بچووا ئاڤ ڤەخوارا، برچی بما خوارا نەددیت نان بخوارا. شوخول و عەمەل، تشتە پێ نەدبوو. خۆرت دینا خوە دایێ تو چارە ژنا وی نابە، ئەوی تەمی دا دییا خوە گۆ: "دایێ، تو بێی من نان مەدە بووکا خوە، کەنگێ ئەز هاتمە مال پاشێ نان بدە وێ_. خۆرت چوو شوخولێ خوە، ئێڤارێ هاتە مال و ژ دییا خوە پرسی: "دایێ، ئیرۆ ڤە کێ وە چ شوخول کریە". دێ گۆ: "لائۆ، چ شوخولێ مالێ هەیە من ئیرۆ تەمام کریە، بووکێ تشتەک نەکریە". خۆرت گۆ:– "دایێ، وەکی ئوسانە نان مەدە وێ، برا ئەو برچی بمینە".

سڤەترا دن خۆرت دیسا چوو خەباتا خوە. ئەو ئێڤارێ هاتە مال و ژ دێ پرسی: "دایێ، ئیرۆ ڤە کێ وە چ شوخول کریە.". دێ گۆ: "لائۆ، شوخول تەمام من کریە، بووکێ تشتەک نەکریە". خۆرت گۆ: "دایێ، دە وەکی ئوسانە دیسا نان مەدە بووکێ، برا برچی بمینە".

چەند ڕۆژا بووک ئوسا برچی هیشتن. بووکێ دینا خوە دا وێ ژ برچییا بمرە، ما سبەترا دنێ سبێ شەبەقێ دا ڕابوو جینڤێن هلدان، مال گێزیکر. ئێڤارێ خۆرت هاتە مال ژ دییا خوە پرسی: "دایێ، ڤە ئیرۆ کێ وە چ شوخول کریە". دێ گۆ: "لائۆ، وەڵە ئیرۆ بووکێ ئێپێجە شوخول کر_. خۆرت گۆ: "دایێ، دە قاسی کرنا وێ نان و خارنێ بدە بووکا خوە_، ژ وێ شوون دا بووکێ دەست ب خەباتێ کر.

سەکنی وەختەکێ باڤێ بووکێ سەر دا هات، گۆ:"ئەزێ هەرم حالێ ڤیزا خومیە بێخیرەت پرسکم_. وەختێ باڤ هات، ڤیز زوو–زوو پێشیێ دا چوو و گۆتێ: "باڤۆ، تو چەند ڕۆژا ڤرا بمینی گەرەکێ بخەبتی، وەکی نەخەبتی ئەوانا نان نادنە تە_. باڤێ دینا خوە دایێ ڤیزا وی

سەر ئاقلێ خوە دا هاتیە، گۆ: "ئەرێ لائۆ، کی دخەبە، ئەو دخوە_.

تو ڕند زانی ئاخلێڤە چیە،

هەما تە ئاخلێڤە نەدیتیە".

ڕۆژەکێ دەڤێ بهارێ دەولەتیک دڤە میڤانێ دەولەتیکی. مالخوێ مالێ دەولەتیرا و سییارێ ویرا حورمەتێ دکە، لێ نە حورمەتەکە گران. وەختا مێڤان ڕێ دکەڤن مالخوێ دڤێژە: "فلانکەس، توێ بباخشینی، وەکی من تەڕا حورمەتەکە ئوسا نەکر چەوا لازمە. دە تو زانی ئاخلێڤەیە". دەولەتیێ مێڤان دزڤرە و دبێژە: "پسمام، من فەم نەکر تو چ دڤێژی، ئاخلێڤە چیە؟" مالخوێ دڤێ: "قەی، تو نزانی ئاخلێڤە چیە؟" "نا، وەڵڵەهـ، نزانم، بێژە بزانبم". مالخوێ دڤێ: "پاک ئەزێ ڤان ڕۆژا بێمە مالا تە و ورا ئەزێ تەڕا بێژم".

وەختەک دەرباز دبە، دەولەتی ب خولام، خزمەتکارێ خوە ڤا دچە مالا دەولەتیێ دنێ مێڤان. ئەو دەولەتیێ تە چەوا لازمە مێڤانێ خوە قەبوول دکە، چەند پەزا شەرژێ دکە، کێف شایی دکن و وەختا ڕێکەتنێ مالخوێ مالێ دڤێژە: "پسمام، تە وی چاخی گۆتە من تۆیێ بێژی ئاخلێڤە چیە، ئەز هیڤی دکم بێژی ئەو چیە".

مێڤان دفکرە و دڤێژە: "پسمام، تو ڕند زانی ئاخلێڤە چیە، هەما تە ئاخلێڤە نە دیتیە".

"بانێکە و دو هەوا.

ئەگێڕنەوە کە ژنەک، کورەک و کچەکی ئەبێ. کورەکەی ژن ئەهێنێ و کچەکەی شوو ئەکات، وە هەردووکیان لە مالی دایکەکەیانا ئەمێننەوە. شەو ل سەر بان کورەکەی و بووکەکەی لە لایەکەوە، وە کچەکەش و زاواکەشی لە لایەکەوە ئەنوون. نیڤەشەو دایکەکەیان بە سەریانەوە ئەگەرێ، کە ئەچێتە سەر جێگایی بووکەکەی پێ ئەڵێ: "گەرمە، تۆزێ لە یەک دوور بکەشنەوە"، کە ئەچێتە سەر جێگایی زاواکەی پێ ئەڵێ: "ساردە، نێزیێک کەونەو. شەوەک کورەکەی پێ ئەڵێ: "بۆ چی دایە ئەمە، بانێکە و دو هەوا.

"ئاقلێ خوە ژ دووڤێ ڕەپ هلینە".

شێرەک و گورەک و ڕووڤیک گهانە هەڤ و ب هەڤڕا چوون ڕاستی هەسپەکی هاتن. شێر لەپەک ل هەسپ دا کوشت. گۆتە گور، گۆ: "برا تو گۆشتێ مە پار بکە". گور ڕابوو، هەرچی گۆشتێ نەرم ژ خوەڕا دانی و هەستی ژ زێڕا دانین و هوور و ڕووڤی ژ ڕووڤیرا دانین.

شێر ژ ڤێ پارکرنێ پر خەیدی، هەما ڕابوو سەر خوە و لەپەک ل ناڤ چەعڤێ گور دا. سەرێ گور کەتە عەردێ و دووڤێ وی ما ڕەپ.

شێر گۆتە ڕووڤی، گۆ: "رابە تو ڤی گۆشتی ل مە پار بکە". ڕووڤی ڕابوو هەرچی گۆشتێ نەرم و بەز ل بەر شێر دانین و هەرچی هوور و ڕووڤی ل بەر خوە دانین. شێر گۆ: "ڕووڤی تە ئەڤ ئاقل ژ کو گرتیە". ڕووڤی گۆ: "ژ ڤێ دووڤێ ڕەپ".

"دو سەرێ چێ ناچنە سەر بەعلگیکی".

ڕۆژەکێ گوندیک ڕادبە دکە هەرە جەم خودێ. ڕێڤا ڕاستی کالەکی تێ. کالێ ژێ دپرسە، دڤێ: "عەڤدێ خودێ تو کودا هەری_. گوندی دڤێ: "ئەز دخوازم هەرمە جەم خودێ، بزانبم چکا ڕاستیا وی چەوانە. کالێ دڤێژە: "عەڤدێ خودێ، خودێ ئەز شاندمە بال تە، کو ئەز جابا پرسێد تە بدم، وەرە ب مڕا ئەم هەرن".

کالێ و گوندی بەرێ خوە ددنە بەر ب گوندەکی. ڕێڤا ڕاستی جۆتکارەکی تێن، دنهێرن جۆتکار سبێ شەبەڤێدا ڕابوویە جۆتێ خوە دکە. ئەو بەگەمییا خوە ددنە جۆتکار و دەرباز دبن دچن. پر دچن، هندک دچن، دڤینن بووکەک وێ خوەڕا ڕازایە، ڕۆ هاتیە نیڤرۆ، ئەو هێ هاژ خوە تونەیە. کالێ دڤێ: "ئەڤا بووکا، ژنا وی خۆرتییە". ئەو دگهێژنە کەوشەنێ گوند، دڤینن وێ خۆرتەک کایێ خوە تەزە گرتیە کو قۆشکە. ئەو ل خۆرت دنهێرن و دچنە ناڤا گوند. دچنە ناڤا گوند دنهێرن وێ بووکەکە جاهل شوخولێ خوە خلاس کریە و نانێ مێرێ خومیی جۆتکار گرێدایە کو بڤە بدە. کالێ دزڤرە سەر ملێ خوە دڤێ:-"عەڤدێ خودێ ئەڤا بووکا ژی ژنا وی خۆرتێ تەمبەلە، کو کایێ خوە تەزە قۆش دکر".

گوندی دڤێ: "کالێ، لێ چما ئەو بووکا قۆچاخ ئەو خۆرتێ قۆچاخ نەستاندیە، هاتیە ڤی خۆرتێ تەمبەل ستەندیە". کالێ دڤێژە: "ڕاستیا خودێ ژی ئەڤە، گەرە دو سەرێ چێ نەچنە سەر بەعلگیکی".

"کی زانە زانە،

کی نزانە باڤێ نیسکانە".

مەرڤەکی گوندیک کوشتبوو و درەڤیا. گوندی دابوونە پەی مەرڤکوژ، کو بگرن. ئەوی دی ڤا ڕێ دا چەند گوندیێ دن بەرب وی تێن. ترسیا، کو وێ بگرن، خوە زووزووکا ئاڤیتە زەڤیا نیسکایە دەڤێ ڕێ، باڤەک نیسک چنی و ڕەڤی. مەرڤێ کو دابوونە پەی وی گازی کرن، کو ئەوی بگرن. ئەوێد کو ژ پێشبەر دهاتن مێرک گرتن، پرسین چما ئوسا پەی وی کەتنە. مێرک گۆت: "ئەز ڕێدا دهاتم، من ژ زەڤیا وان باڤەک نیسک چنی، ناکا دخازن من بگرن، بکوژن". ڕێوی ئەو بەردان و یێد کو دابوون دوو گرتن، گۆتن: "شەرمە، شەرم، سەڤا باڤە نیسک هوونێ مێرک بکوژن چیە؟" گوندی ئەو یەکا کو بهیستن، عەجێڤمایی گۆتن:

"کی زانە زانە، کی نزانە باقێ نیسکانە".

"تو م باوار ناکی زیرینیا کەرێ باوار دکی؟

ڕۆژەکێ جیناریێ مەڵە نەسرەددین تێ جەم وی دڤێ: "مەڵە کەرا خوە نادی ئەز سڤێ گەنمێ خوە بڤمە ئێش. مەڵە دڤێ: "برا جان، وەڵە منێ کەرا خوە بدا وەکی کەر مال بیا. هەما وێ دەمێ کەر دکە زیرین. جیناریێ مەڵە نەسرەددین دڤێ: "مەڵە، نە خوایە کەر تەولێ دا یە و دکە زیرین". مەڵە هێرس دبە دڤێ: "وەختا تو گۆتنا من باوار ناکی زیرینا کەرێ باوار دکی، هەرە ئەز کەرا خوە نادمە تە.

"کۆرم، لێ بێئاقل نینم".

کۆرەکی ژنەک ستەند. ژنێ گۆت: "مێرۆ، حەیف چەعڤێد تە تونەنن تە بدیتا ئەز چاوا بەدەوم". کۆر گۆت: "باش ژنک چەعڤێد من تونەنن، لێ ئاقلێ. من ژی تونە؟ وەکی تو بەدەو بوویای تە ئەز کۆرا نەدستاندم".

"رسقێ گورێ کۆرە"

ڕۆژەکێ مەریکی زەعفی کەسیف هەبوو، گوندەکی دا بوو شڤان. ڕۆژەکێ میستەورەک ژ پێز قەتیا و ڕەڤی. شڤان دا پەی چوو. چوو لێ نهێری می کەتە گەلیکی ل بەر مخارەکێ. گورەکی کۆر ژ لانا خوە دەرکەت و میستەور گرت بر لانا خوە دا خار. شڤان زڤری چوو گهیشتە پەزێ خوە. ئێڤاریێ پەز بر گوند و ئەلامەتی دا گوندیا، وەکی سبێ ئەو ناچە بەر پێز. ژنا وی پێدا کەت، چما ناچە بەر پێز. شڤان گۆ: "ژنک، ئەزم ئەز ناخەبتم، چما خوەدێ ڕسقێ گورێ کۆر لانێ دا دگهینە، چما من ناڤینە کو ڕسقێ من نەگهینە؟" ژنا شڤێن لێ نهێری کو ئەبوورا زارێ وێ نابە، ڕابوو چوو جەم ڕیسپی و دەوسا مێرێ خوە چوو بەر پێز. شڤانەک ژی هەڤال بوو. ڕۆژەکێ هەردو شڤان چوون چۆلێ بەر قووچەکێ ڕوونشتن لێ نهێرین، وەکی دەرێ کوویەکی تێ خویان. چوون دەرێ کووپ ڤەکرن لێنهێرین وی کووپی دا تژە زێرن. ژنا شڤێن گۆ: "برا، ئەمێ پێز بڤن گوند، پاشێ تو و مێرێ من وەرن زێر دەرخن، بڤن". شڤان گۆ: "برابە". .

ئەو پەز ئاژۆتن هاتن گوند. بەری ئێڤاریێ شڤان هات پەی مێرێ ژنکێ گۆ:"ڕابە، ئەم هەرن، مە کوویە زێر دیتیە، ئەم خوەڕا بینن بێن. مێرێ ژنکێ گۆ: "نا برا، ئەز نایێم. چما خوەدێ دکارە ڕسقێ گورێ کۆر لانێدا بگهینە، چما نکارە ڕسقێ من مالدا بگهینە". شڤان گۆ: "کۆر باڤێ تە، ئەزێ ڤا هەرم کوویە زێر خوەڕا بینم". ژنکێ هەڤسا خوە کر شڤینرا نە چوو. شڤان چوو گهیشتە قووچێ، دەرێ کووپ ڤەکر لێ نهێری چ بڤینە، کووپ تژە مەعرن،

سەر هەف، بن هەفڕا دچن، گۆ: "وەڵە، وەکی ئوسانە ئەزێ ڤی کوویێ مەعرا بڤم کولەکا شڤین دا بافێژم برا وی بێخیرەتی بکوژن". ئەو کووپ هلدا ئانی گوند. چوو ڕابوو سەر خانییێ شڤین، کولەکێڕا کووپ ڤالا کر مالا وی، پشتا خوە دایێ و چوو. مێرک و ژنکێ چرا ڤێخستن، لێ نهێرین، وەکی کوویە زێر ژ کولەکێرا ڕۆ کرنە. ڕابوو زێر تۆپ کرن، مێرک گۆ: "ژنک، تە دی نە من تەڕا دگۆ، چما خوەدێ دکارە ڕسقێ گورێ کۆر لانێدا بگهینە، چما من نابینە کو ڕسقێ من ژی بگهینە".

"داربرۆ دارا مەبر،

گومانا خوە ژ خوەدێ مەبر".

داربر چوو مێشە دارا ببرە، گۆ: "ئەزێ ئوسا بکم، وەکی زیانێ بدم مێشە، ئەزێ دارێ جاهل ژی ببرم، یێ پیر ژی. داربر وەختا چوو مێشە دەسپێ کر ب بالتە دار برین، مەرڤەک ڕاستی وی هات گۆ: "کورۆ، داربر، چما دارێ جاهل دبری وی مێشێ بەدەو خراڤ دکی. داربر گۆ: "ئەز دخوازم خرابیا خوە مێشەڕا بجێربینم". مێرک گۆ: "قوربا ئەز تەڕا دڤێم دارا مەبر گومانا خوە ژ خوەدێ مەبر". داربر گورا وی نەکر، دار برین. چوو دارەکە چنارێیە مەزن بری دار سەر دا کەت بریندار کر. مێرک چوو ساخی گهیشتە داربر گۆ: "نە من تەڕا گۆ زیانێ مەدە مێشە، دارا مەبر، گومانا خوە ژ خوەدێ مەبر".

"هوور-هوورکا نەگهیشتمە کر-کرکا".

ژنەک هەبوویە، مێرێ وێ گاڤان بوویە. ڕۆژەکێ، چاخێ مێرێ ژنکێ گاران ژ گوند دەردخە، ژنک ڕادبە کوچکێ خوە دادده، سەر سێلێ قەینۆکێ خوە دقەلینە. ناڤ مالێ هنە جی تەمز دکە قەینۆکێ خوە سەر تەختە ڕادخە و دەستپێدکە دخوە. نە مالێ تەمز دکە، نە نڤینا بەرهەڤ دکە، نە تەولێ گێزی دکە.

ڕۆ دچە ئاڤا، مێرێ ژنکێ تێ ئەجێڤمایی دمینە. چەند ڕۆژا وا دەرباز دبە، مێرک دڤینە ژنا وی مینا بەرێ نە مال تەمز کریە، نە نڤین بەرهەڤ کرنە، نە تەولە گێزی کریە، ڕادبە دڤێ: "ژنک ئەڤ چ حال-هەواڵە. ژن دڤێ: "مێرک هوور-هوورکا نەگهیشتمە کر-کرکا.

"مەمێ سەیدا دەستێ خوە کریە هەردو عەیدا".

مەمێ سەیدا ڕۆکێ لێدا چوو گوندەکی. د وی گوندی دا عەید بوو، لێ گوندیا عەیدا خوە هێ نەکربوون. گوندەکی دن دا ژی خێر ددان. مەمێ سەیدا فکری، گۆ: "ئەزێ هەرم گوندێ کو خێرێ ددن، خێرا خوە بخوم، پاشێ ئەزێ بێم ڤرا عەیدا خوە دەربازکم. ئەو حەتا چوو

گوندێ کو خێر ددان، خێر کوتا بوو، حەتا زڤری هات عەید خلاس بوو، گۆ: "مەمێ سەیدا دەستێ خوە کریە هەردو عەیدا".

"مریۆ، تو هاڤاسی مریی نکاری گا ژی باژۆی؟

حەسۆ زۆزانێ دا مر. مەیتێ وی گرێدان سەر گا برن ل گوند. ئەوانا گەرمک بچوونا چەم دەرباز بوونا. گا چوو ناف ئاڤێدا کر کو ڕوونە.

ڕەسۆ گا ئاژۆت، ڤرا گێ دا سەکنی بوو، گازی کر: "دە، دە گا، دە، گا. گا نە چوو. ڕەسۆ گازی کر: "ئۆرۆ حەسۆ، حەسۆ تو هاڤاس مریی نکاری گا باژۆی".

"پێلێ بوهوری بوهوریە".

یەک وێدا هات دیت مەریک بەر ئاڤێ سەکنیە پێلێ ئاڤێ دژمرە. گۆ: "حەیران، تو چ دکی؟_ گۆ: "ئەز پێلێ ئاڤێ دژمرم". ئەوی ژی سەکنی گوهێ خوە دایێ دا. دێنا خوە دایێ مێرک هەر دژمرە: "یەک، یەک، یەک..." ڤە ئاڤێ دودو، سسێ، چار...

گۆ: "حەیران تو چما ناڤێژی سسێ، چار...، گۆ: "پێلێ دەرباز بووی ئەز ئێدا ناژمرم، ئەو چوویە، ئەز پەی ئێ چوویی ناکەڤم".

"وەک پەرچەمووک خوە پێشدا ڕوقوچاند".

دبێژن، کاڤا سلێمان پێخەمبەر بەلکیس ژ خوەڕا ئانی بوو، بەلکیس ژێ خوەست کو ژ پوورتا تەیران ژێرا نڤینەکێ چێکە. سلێمان پێخەمبەر فەرمان دا هەمی تەیران و گۆت: "دڤێ هوون خوە بترووچکینن، دا کو ژ بۆ بەلکیسێ نڤینەکێ چێکن". هنگێ پەرچەمووکێ خوە ڕاڤەگرت، دووکا پوورتا خوە ڕووچکاند و چوو. لێ تەیرنە مایی ئەو فەرمان ها نە ل ڕێ دیتن و گۆتن: "سلێمان پێخەمبەر، ما نە گونەنە، کو ژ بۆنا ژنا خوا مە کشکان ها بدی ڕووچکاندن. ئەمێ چاوان زڤستانێ خوە بێ پوورت دەرباس کن. ئەم پوورتێ ها جانێ مە ژی سەرما دپارێزە.

سلێمان پێخەمبەر گۆتنا وان ڕاست دیت و دەڤ ژ وان بەردا. لێ پەرچەمووکێ خوە ڕووچکاندبوو. ژ وێ ڕۆژێدا شەرم دکە کو ب ڕۆ دەرکەڤە، ناڤا هەڤال و هۆگران، ژ لەڤرا ب شەڤ دەر تێ.

"مەرڤێ بێ دەردی، بێ کراسە".

ڕۆژەکێ پادشاک نەخواش دکەڤە. حەکیما چ دەرمانی ددانێ کار نەدکر. حەکیمەکی گۆتێ، گۆ: "پادشای خوەش بە، دەرمانێ تە کراسێ مەرڤێ بێ دەردە، کو تو کراسێ

مەرڤەکی بێ دەرد خوەکی، توێ پێرا-پێرا قەنج بی.

پادشا مەرڤ شاندن، کو کراسەکی ئوسا بینن. ئەو مەرڤانا گەلەکی گەریان، لێ مەرڤێ کو دەردێ وی تونە بە نە دیتن. ئیدا ئەو دخاستن بزڤریانا بچوونا بگۆتانا پادشێ، وەکی مەرڤێ ئوسا تونە ل تو عەردا، نشکێ ڤا ڕێدا ڕاستی شڤانەکی تێن و ژێ دپرسن: "شڤان، قەت دەردێ تە هەنە، یان نا". شڤان دڤێ: "فلانکەس، ئەز گۆتنا تە فەم ناکم، دەرد چیە، هەیوانە، گیهایە، چیە؟" مەرڤێ پادشێ شا دبن، دلێ خوە دا دڤێن: "مە دەرمانێ پادشێ دیت. ئەو شڤانڕا شرۆڤەدکن دەرد چیە. "نا، دەردێ من تونەنن، وەکی سەڤا هەر تشتەکی بفکرم ئەزێ ڕۆژەکێدا بمرم".

مەرڤێ پادشێ دڤێن: "دە وەکی ئوسانە؛ کراسێ خوە بفرۆشە مە، ئەو لازمی پادشێیە. شڤان دڤێ: "کراسێ من تونەیە، هەبیا سەر چەعڤا، سەر سەرا. ئاغا چ ددە من ئەز وی ژی خوە دکم. ئەز وەکی سەڤا کراس بفکریاما، وێ منڕا ببوویا دەرد، لێ ئەز دخوازم بێ دەرد بم.

مەرڤێ پادشێ زڤرینە جەم پادشێ و گۆتن: "پادشای خوەش بە، دەرمانێ تە تونە، مەرڤێ بێ دەردی، بێ کراسە".

"شەری مار بە دار".

ئەگەرنەوە کە مارەک ئەچێتە ناڤ دەوانێکەوە، وە یەکەک ئاگر بە دەوانەکەوە ئەنێ. شێخ ئۆمەر ناڤێک لێ وێ ئەبێ، دار دەستەکەی بۆ مارەکە ڕەت ئەکەت کێ گۆیا مارەکەیی پێ ڕزگار بکات. کێ چ مارەکە ئەپەڕێتە ملی شێخ ئۆمەر وە لە ملی ئالێ وە هەر چەند ئەکات نایەتە خوارەوە.

لە پاشا ئەچن بۆ لای چەند کەسەک کە شەریان بکات، وە حەموو شەرەکە وا ئەکەن، کە ئەبێ مارەکە ل ملی شێخ ئۆمەر ببێتەوە. بەلەم مارەکە ب قسەی کەسیان ناکات وا لێ نابێتەوە.

لە پاشا ئەچنە لای ڕێوی بۆ شەر کردن. ڕێوێ کە بۆ مارەکە ئەلێ: "تا نایێیتە خوارەوە شەرتان ناکم: "کە لە گەل دێتە خوارەوە خیرا بە دار سەری پان ئەکاتەوە. ئینجا "شەری مار ب دار".

"کێ قەنجی دکە_خوەڕا دکە،

کێ خرابێ دکە_خوەڕا دکە".

دەورێشەک هەبوو مالا دگەریا نان بەرهڤ دکر و دگۆ: "کێ قەنجیێ دکە_ خوەرا دکە، کێ خرابیێ دکە_ خوەرا دکە".

ڕۆکێ کولفەتا مالەکێ ژ وی کەسیبی زەعف عەجز دبە، دڤێ: "بۆ ئەڤ دەورێشی زەیلێ مە بریە، هەرۆ-هەرۆ تێ نان دخوازە_. ئەو دوشورمیش دبە کاتەکی دپەعتینە، ب ژەعرێ پەروادە دکە، وەکی دەورێش بێ، کاتە بدە دەورێش، ئەو بخوە ژەعردادایی بە دها نەیێ نان نەخوەزە.

سبە سافی دبە، کەسیب دیسا تێ دکە گازی "کێ قەنجیێ دکە خوەرا دکە". ژنک گازی دەورێش دکە کاتێ پەعتی ددێ دا. دوشورمیش دبە، دڤێ: "ئەڤێ کولفەتێ هەر ڕۆ سەڤا نانەکی خەبەر ددا، گەلۆ چ قەومی، وەکی ئەوێ ئیرۆ کاتە دا من". دەورێش دخوازە ڤەکشە، لێ جارەکە دن کاتە ژ دەستێ ژنکێ دگرە و دڤێ: ""کێ قەنجیێ دکە_ خوەرا دکە، کێ خرابیێ دکە_ خوەرا دکە".

دەورێش کاتە هلددە دکە تۆربێ خوە لێددە دچە.

پر دچە، هندک دچە ئەو بەر کانیکێ ڕوودنێ کو ڕەحەت بە، هنە نان دەردخە نانێ خوە بخوە. و وێ دەمێ دەورێش دینا خوە ددێ خۆرتەکی جاهلی بەدەو وێ ل سەر کانیێە. ئەو سلاڤێ ددە دەورێش، دەورێش ژی سلاڤا وی ڤەدگەرینە. خۆرت دڤێ: "دەورێش بابا، ئەزی زەعف برچیمە، قە نان جەم تە هەیە. دەورێش دبێ: "خۆرتێ جاهل، جەم من تشتێ لایقی خارنا تە ئەڤا کاتەیە تەنێ". دەورێش کاتە دەردخە ب دلێ قەنج ددە خۆرت و ڕادبە دچە.

هەما خۆرت کاتە دخوە جیبجی دکەڤە. شڤان، گاڤانێ نێزیک تێن سەر کانیێ دبینن ڤا خۆرتەک کەتیە. پێ دحەسن، وەکی خۆرت ژ گوندێ وانە، حەفت سالا خەریبیێ بوو. خۆرت ژی کورێ وێ کولفەتێ بوو، کیژانێ کاتە دابوو دەورێش. هەوارێ ددنە دێ باڤێ خۆرت، ئەوانا تێن سەر کورێ خوە، دپرسن چرا ها بوویە. خۆرت دبێ: "حال هەوال ڤێ فۆرمێ بوویە، ئەز برچی بووم، من نان ژ دەورێش خاست، ئەوی ژی کاتە دا من، من کاتە خوار، پەی کاتە ئەز ها بووم". دیبا گەدە فەعم کر، وەکی ئەو کاتێ وێ بوویە. دوشورمیش بوو، کو گۆتنێ دەورێش ڕاستن: "کێ قەنجیێ دکە_ خوەرا دکە، کێ خرابیێ دکە_ خوەرا دکە".

"یێ کو هێکێ بدزێ، کەنگێ هەبێ وێ بزێ".

ژنەک هەبوو و کورەکی وێ هەبوو.

ڕۆژەک کور هات مالێ هێکەک ئانی. دیا وی ژێرا کەلاند. ڕۆژا دی هات مریشکەک ئانی.

دایکێ ژێرا قەلاند. ڕۆژا سسیا هات پارەک ئانی. دایکێ ژێرا پژاند.

پشتی چەند ڕۆژا هاتن گۆتن ژنکێ: "کورێ تە کوشتن". ژنک گری و ل سەرێ خوە خست. جینار گۆتنێ: "نەگری، نەگری، ئێ کو هێکێ بدزێ، کەنگێ هەبێ وێ بزێ".

"هەر تشت متربی چێ دبێ،
جۆت ژی متربی چێ نابێ؟"

متربەک هەبوو دچوو ژ مەریا کراسەک دخاست، کراس ددانێ، دچوو گەنم دخاست، گەنم ددانێ. جارەکی چوو با یەکی جۆتیار، گۆتێ: "گۆ ب خودێکی، جۆتێ خوە بدە من". جۆتیار گۆتێ: "ئێ، لائۆ، هەر تشت متربی چێ دبێ، جۆت ژی متربی چێ نابێ؟"

"کەششایێ تتوانێ مر و ملەت ب خوەڕا کوشت.

گۆ، کەششەیێک هەبوو ل تتوانێ. تشتەک قەنج تو جارا نەکر ملەترا. مرنا وی هات وەسیاتا خوە نڤیسی: "کو ئەز مرم م ل سەر دارێ دالقینن پانزدە ڕۆژ".

کەششە مر، ملەت وی دالقاند. پشتی چەند ڕۆژا ئەسکەرێ ڕۆمێ هاتن گوند و کەششە دیتن دالقاندی. ئەسکەر گۆتن: "کی کەششە کوشت؟" ملەت گۆت: "ئەو وەسیاتا وی یە". ئەسکەرێ ڕۆمێ باوار نەکرن ملەت گرتن و تەڤا کوشتن. ژ هنگیدا دڤێژن فلانکەسێ وەکە کەششایێ تتوانێ کر: "کەششایێ تتوانێ مر و ملەت ب خوەڕا کوشت".

"دەرەو دەرەوە، چ جە، چ گەنم".

جارەکێ دەولەتیکی خوەست شەر باڤێژە جینارێ خوەیی کەسیڤ. چوو جەم قازی گۆ: جینارێ من ژ چەعلێ دو بار گەنم دزیە". قازی لێ پرسی: "شەعدێ تە کییە؟" گۆ: شەعدێ من خولامێ منە". گازی خولام کرن، قازی گۆ: "تە چ دیتیە؟" گۆ؛ "فلانکەسێ دو بار جەهـ ژ چەعلا ئاغایێ من دزی، م ب خوە دیت. گۆ: "کورۆ، ئاغایێ تە دبێ گەنم، تو دبێی جە؟_

"ئێ،-گۆ،-قازی، دەرەو دەرەوە، چ جە، چ گەنم".

"قانترێ قادی مەترسینە، تشت ژ تەڕا تونە"

ڕۆژەکێ کاروانەک ئەوێ د بەر مەزەلەکێرا بچوویا. مرۆڤەک گۆت، وەکی ئەو مرییە، برا وی د مەزەلدا ڤەشێرن تا کو قانترێ کاروان بترسینە و تالان بکە. ئەو ڤەشارتن. کاڤا کاروان هات، ئەوا قانتر ترساندن، خایێ کاروان ڕەڤیان، گەلەک تشت شکەست. پشترا خادییێ کاروان پێ حسیا، وەکی ئەو مەرڤا د تربێ دا خوە ڤەشارتبوو و ئەڤ شوخولا چێکربوو. خادییێ کاروان ئەو مرۆڤێ پیس گەلەک لێدان و ئێشاندن.

گاڤا ئەو ڤەگەریا و هات ناڤا گوند ژێ پرسین: "گەلۆ تو مریبووی، تو چاوا هاتی؟" گۆ: "راسته ئەز نوها ژ دنیا ئاخرەتێ تێم". پرسین: "چ هەیە، چ تونەیە ل وێ دنێ؟" گۆ: "هەر تشت باشە، تەنێ ڤانتریێ ڤادی مەتریسینە، تشت ژ تەڕا تونە".

"ئێ کو خوێ چاندی، ئەو ژی مر".

ڕۆژەکێ دو برایێن دین ژ بەر گرانبها بوونێ خوێ ژ هەڤ دشێورن و دخوەزن ژ بۆ فلتینا کرینا خوێ ببینن. ل پاش مشێورەک دوور و درێژ بریار ددن، کو گشت هەینێن خوە بفرۆشن و پر خوێ بکرن، دا ل جییێ گێنم بچینن و ب ڤی ئاڤاییی ژ بەرێن وێ گەلەک خوێ ب دەست خوە خن.

هەردو برا حەموو جل و جارێن کو تێن فرۆتن ژ هەڤ جڤاندن و برن بازێر و فرۆتن. ب دراڤێ کو دەست کەت خوێ کرین و شووڤێن خوێ چاندن.

گاڤا کو دیتما هێشینبوونا گێنم و جەهـ هات و حەموو چاندنیا سەرێ خوە بلندکرن، هەر دو برا ژی چوون کو سەریکی ل چاندنیا خوە بکن، کا خوێ ڕند هێشین بوویە ئان نا. لێ ژ بەختێ ڕەش، ئا کو وان دیا و هێڤی دکرن نەبووبوو، شووڤێن وان ئێ کو خوێ تێدا هاتبوو چاندن هێد وەکە خوە بەرێ ڕەش دکر.

هەردو برا هەڤ شێورین، دا بزانن ئووستا ڤێ چیە. ب وان کو هن کەس دژمنتییا وان دکن و ناهێلن خوێ هێشین ببە. بریار دان، کو ڕۆژ و شەڤ ل بەر بپێن و دژمنێ خوە بگرن، ئان ژی بناسن. لێ ئەڤ پاینا هان گەلەک ڕۆژ دۆمکر، بێ کو تشتەک خویا بکە. شێنی جیرانێن زۆرا وان حەموویان پالەیا خوە کرن، شخرێ خوە کشاندن و بێندەرێن خوە ڕاکرن، لێ هەردو برا هێژ دژمنێن خوە نەدیتن.

ڕۆژەکێ یەک ژ وان دبینە کو مێش ل سەر شۆڤا وان دفرن. ب دەستڕا ڕادلێ تفنگا خوە و ئاگر بەرێ مێشا ددە. گاڤا برایێ وی دەنگێ تەڤینێ دبهیزە، خوە دگهینە برایێ خوە دا پشتگریا وی بکە ل هەمبەر نەیار و دژمنێن خوە. گاڤا دگهێ برایێ خوە ئەو ژی وەک وی دەست داڤێژە چەکا خوە و هەردو برا ب هەڤڕا پی ل پی ژ دژی دژمنێن خوە شەر دکن...

د داما مێش گرتنێ دا، ل سەر فراڤینێ مێشەک تێ ژ سەر عەنییا یەکی ژ وان دادنشێ. ئەوی ژی هایا ژێ تونەیە و خوەرنا خوە دخوە. برایێ دن ب دزی دکوتە برایێ خوە، وی ئاگاداری دژمنێ کو ل سەر ئەچییا خوە دکە، دا کو خوە نەلڤینە و بێدەنگ بسەکنە. تفنگا خوە ڕادکە ددە بەر چاڤێن خوە و نیشان ل مێشا سەر عەنییا برایێ خوە دگرە و پێچکا

تفنگێ دکشینه. تەقین و کەتنا برێ تەڤ دبن. برایێ زندی ب دلشایی سمێلێن خوه بادده و ب ڕووگەشی دچه سەر برایێ خوه، دا ژ بۆ ڕابوونێ ئالیکاریا وی بکه و نیشانداریا خوه پێرا بپەسینه. لێ برایێ وی وەک مریێ حەفت سالی جەمدیا بوو.

"خەرجێ خوه ژی دده و سەرێ خوه ژی دشکێنه".

گۆ، ئاغایەک هەبوو ل سنجاقا ژ سنجاقێ جزیرا بۆتا. سالێ جارەکێ جەندرمێ ترکا دهاتن ژ ئاغایێد کورمانجا بێش دستاندن. وەختێ دهاتن جەم ئاغای و بێش دخوەستن، بێش نه ددا. جەندرمێ ترکا چ دکرن، نەدکرن ئەوی بێش نەددا. پاشیا پاشی جەندرمێ ترکا لێدخستن و سەرێ وی دشکێناند، وەختێ کو سەرێ وی دشکێناندن، ئەوی د جی دا خەرجێ خوه ددا. ئەڤ ئاغا مر، کورێ وی جیێ وی گرت.

سالەک قولبی، جەندرمێ ترکا دیسا هاتن، وەختێ کو بێش ژ کورک خاستن، ئەڤی پێرا-پێرا بێشا خوه دا. خەلقێ گوند گۆتنێ: "لاوۆ، تو چ بێ زراڤی، ترسۆنەکی؟" گۆ: "چما، خێره؟" خەلقێ گۆتنێ: "وەڵە، جەندرما ژ باڤێ تە ب دلەکی وه خەرجێ خوه نەدستاندن". گۆتنێ: "وەڵە، لێدخستن نه ددا، ئەو دترساندن نەددا، حەتا سەرێ وی نەشکێندانا ئەوی مەجیدییەک ژی نەددا وان". کورک گۆته وان: "ما پاشیا پاشی ددا، یان نه ددا؟". گوندی گۆتنێ: "بەلێ، وەڵە ددا". "ئێ، -گۆ، کارا وی چ بوو، نه خەرجێ خوه ژی ددا، سەرێ خوه ژی دشکێناند".

## ژ سەرهاتییا بەرهڤکرن، نەشرکرنا مەسەلە و مەتەلۆکێ کوردا

مەسەلە و مەتەلۆک، چاوا جوورەکی (ژانرەکی) زارگۆتنا جمعەتێ، جمعەتێرا تەڤایی ژ کووورایا قوورنا تێن. واندا خوبارا سال و زەمانا تێ خانێ. چاوا عەیانە ڕابوون-روونشتاندنا جمعەتێ، فیلۆسۆفیا وێ، خەیسەت و هەلەقەتییا مەریا و سنفا، مینا نەینکێ مەسەلا و مەتەلۆکادا تێنە کفشێ. بادیهەوا نینە، وەکی گوهدارییا گەلە ئولمدارا، مەرێ زانە و دنێدیتی تمێ سەر پرسا بەرهڤکرن و نەشرکرنا مەسەلە و مەتەلۆکا بوویە.

ب پرسا بەرهڤکرنا مەسەلە و مەتەلۆکا ڤا بەرێ عەولن شاییر و ئاقلبەندێ کوردێ قورنا بەرێ و ئۆرتە مژوول بوونە. شەعدەتییا ڤان گلیا ئەو عەفراندنێد کلاسیکێ ئەدەبیاتا کوردا عەلی تەرەمۆکی، بابا تاهر هامادانی، عەلی هەریری، فەقیێ تەیران، مەلە باتی، ئاحمەدێ خانی و ئێد مایین، کیدەرێ کو حوکمێ زارگۆتنا جمعەتێ خوە پێدحەسینە. زارگۆتنا جمعەتێ بۆنا شاییر و ئاقلبەندێ کوردا بوویە جەبرخانا خەبەرا و فکرا، بوویە چەعڤکانیا گەلە-گەلە عەفراندنێد نەمری. مەسەلە، عەفراندنێد فەقیێ تەیران، یێ کو ناڤا جمعەتا مەدا ئوسا بەلا بووی و حزکرینە، ب زەمانەکی ئوسا فەرە و لەتیف هاتنە نڤیسار، وەکی چاخێ هنە عەفراندنێد فەقیێ تەیرانە زەمانێ باشقە-باشقەدا، ژ مەرێد هەڤ لاپە نەناس نڤیسی ئەم هەمبەری هەڤ دکن، دڤینن، وەکی فرقییا وان شێرا جارنا قە تونە، جارنا ژی ئوسا هندکە، کو ئەو قە نایێ خانێ. ئەڤا یەکا هەم دەرهەقا مەزنایا شاییردا، هەم ژی دەرهەقا پەڤگرێدانا شاییر و جمعەتێدا خەبەر ددە. ئەو بەندەیێ ملەتحز، یێ کو عەفراندنێ شاییرێ خوەیە ملی ناسن، ئەو پاک زانن، کو شاییرێ کوردا عەفراندنێد خوەدا چقاس زەعف مەسەلە و مەتەلۆکێ جمعەتێ دانە خەباتێ. و بادیهەوا نینە، وەکی تاریڤا بەرهڤکرنا زارگۆتنا کوردا و ئیلاهی یا مەسەلا و مەتەلۆکا ژ شاییرێ کوردا یێ قورنێد بەرێ و ئۆرتە ڤا دەسپێدڤە.

مەسەلە و مەتەلۆکێ کوردا، گۆتنێ وانە قەدیمی هێنا خوەدا بەرهڤکرنە و عەفراندنێد خوەدا دانە خەباتێ ئوسا ژی گەلە شاییر و وەکیلێ ئەدەبییاتا جمعەتێ ڕۆهلاتا ناڤوو ڕاست.

موستافا کێیڤانی مقالا خوەدا چەند مەسەلا تینە و ددە کفشێ، کو چاوا شاییرێ فارسانە دنێعەیان مەسەلە و مۆتەلۆکێ کوردا ناڤا عەفراندنێد خوەدا ب هۆستاتی دانە خەباتێ. ئاوا مەسەلە، گۆتنا جمعەتییە قەدیمی: "ب قسەیی خۆش مار لە کون دێتە دەر_، فیردۆئووسی وا دایە خۆیاتێ:

"دۆرۆشتی ئۆ توندی نەیایەت بێکار،

بێ نەرمی قەرایەت زێ و سووراخ میر".

یانێ "ب دەستێ زۆرێ و زختیێ ناگهیژی مەرەما،

ب نەرمی مەعر وێ ژ قولا خوە بێتە دەر.،.

شایرەکی فارسایی دنێ: سائادی ناڤا عەفراندنا خوەدا مەسەلا جمعەتا کوردا "دەستیک نەتووانم بیبرم، ماچی دکم" ئاوا دانە خەباتێ:

"با ئانکێ خۆسوومەت نەتڤانی کەرد بێساز"

دەستا کێ بێدەندان نەتڤان بۆرد بێبووس.

یانێ: "کێرا نکاری ببی دژمن-وەرە ڕایێ،

دەستێ کێ ب درانا نکاری گەزکی، پاچکێ".

ماتێنادارانا سەر ماڤێ مێسرۆپ ماشتۆس دا، ل ئێرێڤانێ کیدەرێ کو دەستنڤیسارێ ئەرمەنیایە قەدیمی تێن خوەیکرنێ، هنە دەستخەتێ ئەرمەنی دا نڤیسارا کوردی ژی تێ هەیە. دەستنڤیسارا ٧٣٧١-ئادا، یا کو سالا ١٧١١ هاتییە نڤیسارێ، ئەم ڕەخ تێکستا ئەرمەنی ئوسا ژی چەند مەسەلە و مەتەلۆکێ کوردی دخوونن، یێد کو چاوا تێ کفشێ، ئالیێ مەریکی، کو کوردی زانبیە ب هەرفێ ئەرمەنی هاتنە نڤیسارێ. تێماتیکا وان مەسەلە و مەتەلۆکا هیملی یێ تەربییەتکرنێ و تەمینێنە. ئاوا مەسەلە:

ئاقل تاجێ زێرینە،

سەرێ حەموو کەسی نینە"،

"دنێ خان-مانە،

هنە چوونە، هنە مانە،

یێ کو مانە ئەو ژی مێڤانە".

دەستنڤیسارێ دا هەنە مەسەلە و مەتەلۆکێ ئوسا، یێ کو دارهەڤا نەومکەحەڤتییا سۆسیالیێ دانن. مەسەلە:

"دچمە ئاش-خراب دبی،

دچم کاهنی-زها دبی،

بێدەولەتی وها دبی".

"چۆم کاهانی ئاڤ تونەبوو،

چۆم بێدەرێ با تونەبوو،

فەلەک ل سەرێ من واهابوو".

٢٥٠ سالی زێدەترە، کو ئەڤ مەسەلە و مەتەلۆک هاتنە نڤیسارێ، لێ حەتا رۆژا ئیرۆیین ژی جمعەتا مە دبێژە:

"ئاقل تاجێ زێرینە،

سەرێ حەموو کەسی نینە".

"هوور بفکر، دوور بفکر،

کوور بفکر، شوور بفکر".

دەستنڤیسارێ مەسەلە و مەتەلۆکێ کوردی هەنە نوسا ژی دەستنیڤسارخانا ئینستیتووتا ئاکادێمیا تسسس رۆهلاتزانیێ یا پارا لێنینگرادێ . ئەو دەستنڤیسارا، ب فکرا ئولدارا، دەستنڤیسارا ئولدارێ کوردا مەلە مەهموود بایازیدییە، یا کو کڤشی هەیە سالا ١٨٥٦-ئا ئەرزرومێ دا بەرهڤکرییە. هنە هەڤال هەساف دکن، کو ئەو مەسەلە و مەتەلۆکانا م. بایازیدی ژ رێنیشا (گراماتیکا) زمانێ ترکی تەرجمەکرییە و ئەو مەسەل، مەتەلۆکێ ترکینە. لێ ئەز گەرەکێ بێژم، وەکی ئەو مەسەلە و مەتەلۆک، کو دەستنڤیسارخانا ئینستیتووتا رۆهلاتزانیێ دا تێنە خومیکرنێ، ئەسلی گۆتنێ ملەتێ کوردانە. ئیزباتی ئەوە، وەکی مەسەلە و گۆتنۆکێ ئوسا چاوا "یار حەزار ببە هندکە، دژمن یەک ببە زەعفە"، "دەستێ کو نایێ برین، ئەوی راموسە". "ئەو کو گولی دخوازە ئستریان ژی لازمە بخازە" و ئێد مایین حەتا رۆژێ ئیرۆئین ژی ژ ئالیێ کوردێ ئیرانێ، ئیراقێ، توورکیایێ و سووریایێ تێنە گۆتنێ.

نەشرکرنا مەسەلە و مەتەلۆکێ کوردی هیملی ب نەشرکرنا ڤنیاتێد فۆلکلۆرا کوردا ڤا گرێداییە، یا کو ژ چارێکا ڤورنا خخ-ئایە ئەولن دەستپێ دبە. نەنهێری وێ یەکێ، وەکی میسیۆنێرێ هورۆما مائووریسیۆ گارسۆنی سالا ١٧٨٧-ئا هرۆمێ دا رێنیشا زمانێ کوردی نەشرکربوو، ڤنیاتێ فۆلکلۆرا کوردا ژی دابوو خەباتێ، لێ مەسەلە و مەتەلۆک تێ

تونەبوون.

نموونێ مەسەلە و مەتۆلۆکێ کوردا جارا ئەولن ب کوردی و تەرجما زمانێ ئوورسی پ. لێرخ نەشرکرییە.

هلبەت، چاوا نموونێد فۆلکلۆرا کوردا، ئوسا ژی مەسەلە و مەتەلۆک جارا ئەولن گەرمکێ کوردستانێ دا نەشر بوونا، لێ ئەو حالێ سۆسیالێکۆنۆمیکیێ و سەیاسەتیێ، کو حەتا رۆژا ئیرۆئین ژی مینا زیاکی خوە دایە دۆرا کوردستانێ، مەجال نەدایە، وەکی ژ خزنا زارگۆتنا ملەتێ کورد، ژ نموونێد وێیە بەدەو دها زەعف چاپ بن و ئەیانی دنێ بن. و رۆژا ئیرۆئین ملەتێ کورد ب شێکردارن ناڤێ وان ئولدارا، رێویا و مەریێ خێرخاز بیر تینە، یێد کۆ هێنا خوە دا ب چەتنایێن دەولەمەندتیا ملەتێ مە بەراڤ کرنێ، چاپ کرن و ژ ئوندا بوونێ خلاز کرنە.

سالا ١٨٧٨–ئا س. ئا. ئێخیازارۆڤ خاباتا خومیە ب سەرنڤیسا "ئۆچێرکا ئێتنۆگرافیێیە کورد دەرهەڤا کوردێ قەزا ئێریڤانێ" تەسلیمی پارا قافقازێ یا هەڤالبەندیا ئوورسایە گێئۆگرافییە ئیمپێراتۆریێ کر. ئەو کتێبا سالا ١٧٨٧–ئێ بازارێ تیفلیسێ دا نەشر بوو. کوتاسیا کتێبا خوە دا س. ئا. ئێخیازارۆڤ "تێکستێ کورمانجیێ" نەشر دکە. نێتا خوداننڤیس ئەو بوو، کو ئەو خوەندەڤانا نموونێد زارگۆتنا جمعەتا کوردارا بکە ناس. ناڤا ڤنیاتێد نەشربووی دا نێزیکی سی مەسەلە و مەتەلۆکێ کوردی هەبوون، یێ کو قانوونێ عەمرێ بەرێ نیشان ددان. مەسەلە: "دەولەتا تە هەیە، ئێل بۆ تەرا برایە، دەولەتا تە تونە، دۆستێ تە تونە". "ژ خولیان ڤەلی، ژ ڤەلیان خۆلی". مەسەلە و مەتەلۆکێ ئوسا چاوا "زۆر_زۆر دیسا ل ڤر، "شیرێ پاییزا بدە عەزیزا، شیرێ بهارا بدە یارا"، "هوور بفکر، کوور بفکر" و ئێد ماین حەتا رۆژا ئیرۆئین ژی ئەم ژ جمعەتێ دبهێن.

کۆتاسیا قورنا خخ دەستپێبوونا قورنا خخ گوهداریا شوخولکرێ ئەرمەنیایە پێشڤاچووی بەرب کوردا زێدە بوو. ئەڤا ب وێ یەکێ ڤا تێ شرۆڤەکرنێ، وەکی قورنا خخ-ئادا سالێ ٧٠–٨٠–ئی خێنژ پێشداهاتن و مەهکەم بوونا کاپیتالیزمێ ل قافقازێ، جمعەتا ئەرمەنیا پێ کربوو ئێتاپەکە تەریڤا خومیە نوە، ئێتاپا شەرکاریا ملەتیێ-ئازاداریێ. وێ هێنێ دەرمجا بەرهڤکرن و نەشرکرنا فۆلکلۆرا کوردا ژ ئالیێ وەکیلێ ئەرمەنیا ئێیێجە خەبات هاتە کرنێ. ڤی شوخولی دا پر بوو کرنێ فۆلکلۆریست و ئێتنۆگرافێ ئەرمەنیای ئەیان سارکیس هایکوونی (١٨٣٨–١٩٠٨). ئەوی تەمامیا عەمرێ خوە پێشکێشی بەرهڤکرن و نەشرکرنا ڤنیاتێد فۆلکلۆرا ئەرمەنییا کر. سالا ١٩٠٢–ئا بازارێ مۆسکڤایێ

ڤاخارشاپاتێ جلدا «ئێمینیان ئارگاگراکان ژۆخۆڤاتسو»- ئێیه پێنجا نەشر بوو، یا کو ب تەمامی پێشکێشی ڤنیاتێد زارگۆتنا جمعەتا کوردایه ئەپیکیێ کربوو. خێنژ وێ، س. هایکوونی ب دل و جان، ب هزکرن ژ کوردێ ئالاشکێرتێ (ئەلاشگرێ)، ژ قەبیلا هەیدەرا، ڕەشکۆتا و ئێد ماین مەسەله و مەتەلۆک، زووگۆتنۆک، تێدەرخستنۆک، نفر، دوا بەرەڤ دکر. ئەوێ ئەو جلدا «ئێمینیان ئارگاگراکان ژۆخۆڤاتسو»-ئێیه شەشا دا نەشر کر. پێشخەبەرا وێ بەرەڤۆکێ دا س. هایکوونی نڤیسییه، وەکی مەسەله، مەتەلۆک و کلامێ کوردا زەعفن و هەکی کورد دەستخوە دا مەسەلەکێ، مەتەلۆکەکێ یانێ ژی کلامەکێ بێژە بۆنا وی زەهمەت نینه. س. هایکوونی ددا کڤشێ، وەکی مەسەله مەتەلۆکێ، کو ئەوێ بەرەڤکرنە، فکرکوورن و قیمەتلینە.

ب سایا خەباتا س. هایکوونی یه پر قیمەت ٤٤٠ مەسەله و مەتەلۆکێ کوردی گەهیشتنە مە. قیمەتێ ڤنیاتێ بەرەڤکری ئەوە، وەکی نەنهێری س. هایکوونی ب هەرفێ ئەرمەنی دنڤیسی، یێ کو بۆنا نڤیسارا کوردی نە تامبوو، ئەوێ ئوسا ژی تەرجمێ وان ڤنیاتا ب زمانێ ئەرمەنی ددا. دەرهەقا هەرفا دا س. هایکوونی خوە ژی هلددا سەر خوە، وەکی هەرفێ ئەرمەنی بۆنا ڕاستنڤیسارا خەبەرێ کوردی نە تامن، لەما ژی وەختێ نڤیسارێ کێماسی هەبوونە. نەنهێری ڤێ یەکێ، ژ ئالیێ س. هایکوونی چاوا دەرەجا بەرەڤکرنا فۆلکلۆرا کوردا، ئوسا ژی دەرەجا بەرەڤکرنا مەسەلا و مەتەلۆکا دا شوخولەکی پرقیمەت هاتیه کرنێ.

پەی تەرباندنا شەرکارییا کوردایە ملەتیێ-ئازاداریێ سالێد ١٩٢٠-ئی، ١٩٢٥-ئا، ١٩٣٠ئی، ١٩٣٧ئا ل توورکیایێ، ئیرانێ و ئیراقێ، ملەتێ وەلاتێ ئێڤرۆپاییە ڕۆئاڤا دها زەعف دخواستن دەرهەقا تەریقا کوولتوورا جمعەتا کوردا دا بخواندانا، بزانبیانا.

شوخولکارێ کوردایی ئەیان کامووران ئەلی بادرخان، وەکی جمعەتا فرانسیایێ ب کوولتوورا، ئاقلبەندی، دوشورمیشبوونا کوردا ڤا بدە ناسکرنێ، سالا ١٩٣٧-ئا تەڤی نڤیسکارا فرانسیاییە ئەیان لووسی پۆل مارگاریتێ پاریزێ دا ب تەرجما زمانێ فرانسی بەرەڤۆکەکە مەسەله و مەتەلۆکێد کوردییە بژارە نەشر کر.

کامووران ئەلی بەدرخان ئەوێ بەرەڤۆکا خومیە ژۆرکۆتی دا هەر تەنێ مەسەله و مەتەلۆکێ کوردێد سووریایێ و توورکیایێ نەشرکرنە، زارگۆتیێ وی هیملی دو کورد بوونە. ناڤێ یەکی ئاهمەد بوویە ژ مێردینێ، ناڤێ یێ دنێ نەسیب بوویە ژ گوندێ لیسا، قەزا مووافەرقینێ (کوردستانا توورکیایێ)'. ڤنیاتێ نەشربووی خوەندەڤانا ڕابوون-

روونشتاندن، خەیسەتێ جمعەتا کوردایە ئازایەزرا دکنە ناس.

هەما ل وێ سالێ ژی کۆڤارا ب سەر نڤیسا «رەڤوە دەس ئەعتودەس ئسلامگوەس»-دا خودانێ گەلە خەباتێ دەرهەقا کوردا دا حەواسکار نڤیسی.

رۆژێ لێسکۆ، مقالا خومیە دەرهەقا مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردا دا نەشر دکە. وێ مقالا خوە دا ر. لێسکۆ مەسەلە و مەتەلۆکێد خومیە ژ کوردێ توورکیایێ بەرهڤکری و مەسەلە، مەتەلۆکێد کو کامووران ئەلی بەدرخان بەرهڤ کربوون و دابوونە وی، نەشر دکە. ر. لێسکۆ نێزیکی ٢٨٠ مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردی ب زمانێ دێ و ب تەرجما زمانێ فرانسی چاپ دکە. ئەو حەموو مەسەلە و مەتەلۆکا سەر شێست و نەهـ پارا پاراڤەدکە. ڤێ کلاسیفیکاسیا خوە دا ر. لێسکۆ هیملی فکرا مەسەلا و مەتەلۆکا دایە بەرچەعڤا. ئەو پار ئەڤن: "خەبات"، "هزکرن"، "پسمامتی"، "گومان"، "دلرەمی"، "بەختەواری"، "بوخدان" "ئاخری" و یێد ماین. ر. لێسکۆ مقالا خوە دا دنڤیسە، وەکی مەسەلە و مەتەلۆکێد، کو ئەوی نەشرکرنە، هیملی مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردایە ئەینینە، یێ ملەتێینە، نەنهێری وێ یەکێ، وەکی ناڤا وان مەسەلا و مەتەلۆکا دا دکارە بقەومە یێ ئوسا هەبن، کو ژ ملەتێ ماین دەربازی ناڤا زارگۆتنا کوردا بوونە. ناڤا قنیاتێ رۆژێ لێسکۆ نەشرکری دا ئەم دکارن گەلە مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردایە ئوسا بڤینن، ئێد کو مینا چلکا ئاڤێ زەلال عەمرێ کوردێ سەرێ چیا و کوردێ ئارانا، عەمرێ کوردێ سنەتکار و خومیێ پێشەک نیشان ددن.

نەنهێرن، وەکی کوردستانا ئیراقێ و سووریایێ ئێپێجە وەخت بن هوکومێ ئانگلیایێ و فرانسیایێیە کۆلۆنیالیێ دا بوونە، گەلە شوخولکارێ جمعەتا کوردایە مەخلووقەتیێ و سەیاسەتیێ بۆنا بەرهڤکرن و نەشرکرنا ڤیناتێد زارگۆتنا جمعەتێ، بۆنا چاپکرن و بەلاکرنا ئەفراندنێد شاییرێ کوردایە ملی شوخولەکی پر مەزن کرنە. وانا ب وێ یەکێ ڤا هێنا خوە دا نیشان ددا، وەکی جمعەتا کوردا ملەتەکی کەڤنە، خومیێ کوولتوورا قەدیمییە و ئەختیباریا وی هەیە دەوا خومخومتیا، ئازایا خوە بکە.

ئاوا مەسەلە، جاهلێد سووریایێیە وەتەنهز، لاوێ کوردە پێشڤەچووی کۆمەلەکی- ئەدەبی تەشکیل دکن نێتا، کیژانێ ئەو بوو، وەکی ب زمانێ دێ ئەدەبیاتا کوردایە کۆن و قنیاتێد کو کوولتوورا جمعەتا کوردارا گرێدانە، نەشرکن، بەلای ناڤا جمعەتێ بکن. سەرکارێد وێ کۆمەلێ ژ سلسلەتا بەدرخان بوون. ناڤا چەند سالا دا وانا ئێپێجە کتێب چاپکرن. خێنژ وێ، ئەو کۆمەلە ژ سالێد __-ئی دەستپێکری هەفتێکێ جارەکێ کۆڤارا ب ناڤێ "هەوار"

نەشر دکر. ئەو کۆڤارا ب تیپێ لاتینی چاپ دبوو. لایقە بێ گۆتنێ، وەکی کۆڤارا "هەوار_ ئێ بۆنا نەشرکرن و بەلاکرنا نموونێد ئەفراندنێد چاوا شایر، ئوسا ژی یێ زارگۆتنا جمعەتێ خەباتەکا پر مەزن کر.

سالا ١٩٣٢-ئا چاپخانا "ئێیتام_ ئێ ل بازارێ بەخدایێ کتێبا شوخولکارێ کوردایی بەریچەعف ئیسمایل هەقی شاوێس ب سەرنفیسا "قسەیی پێشینان" چاپکر. ڤێ کتێبێ دا جارا ئەولن ب زمانێ کوردی ب هەرفێ لاتینی ٦١٣ مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردا نەشر بوون. خێن ژ وێ، ناڤا تەریقا بەرهڤکرن و نەشرکرنا نموونێد زارگۆتنا کوردا دا ئەڤا جێرباندنا ئەولن بوو، کو نموونەکە (ژانرەکە) زارگۆتنێ ب کتێبەکە باشقە ڤا ڕابەری خوەندەڤانا کر.

بۆنا هازرکرنا ئەڤێ کتێبێ ئیسمایل هەقی شاوێس بەرێ ئەولن نێت دانیبوو پێشیا خوە، وەکی مەسەلە و مەتەلۆکێد ئوسا نەشرکە، یێ کو نەک تەنێ دژمنێ جمعەتا کوردایە دەر، لێ ئوسا ژی دژمنێ وێیە هوندور گونەکار دکن، کرنێد وانە نەپاک ڕەزیل دکن. خێنژ وێ، کتێبێ دا هەنە مەسەلە، مەتەلۆکێد، کو نەوەکەهەڤبوونا و دەرهەڤا حالێ جمعەتیی سۆسیالیێ دا شەدەتیێ ددن.

پەی نەشربوونا ئەڤێ کتێبێ، سالا ١٩٣٨-ئا دیسا بازارێ بەخدایێ دا ژ ئالیێ چاپخانا "نیجا" بەرهڤۆکا شوخولکارێ کوردایی مەخلووقەتیێ مارووف جیائووک ب سەرنڤیسارا "حەزار بێژ و بەند" نەشر دبە. هەما ب خوە ناڤێ کتێبێ دەرهەڤا چاپا مەسەلە و مەتەلۆکێ نەشربووی دا دبێژە. خودانێ کتێبێ ب هەرفێ ئەرەبی، لێ ب زمانێ کوردی کتێب ڕابەری خوەندەڤانا کرییە.

ئولداریێ کوردایی ئەیان، خودانێ گەلا خەباتێ پرقیمات شێخ ماهموودی خال، سالا ١٩٥٧-ئا بازارێ بەخدایێ دا باراڤۆکەکە مەسەلا و مەتەلۆکا نەشر کر. ئەڤا بەرهڤۆکا ب جوورێ خوا ڤا ژ بەرهڤۆکێد حەتا نها چاپبووی نەک تانێ ب وێ یاکێ جودا دڤا، وەکی خودانێ بەرهڤۆکێ ١٣١٩ مەسەلە و مەتەلۆکێ کوردێ ئیراقێ ب زاراڤێ کوردێ کوردستانا ژێرین چاپ کرییە، لێ ئەو جودە دبە ئوسا ژی ب وێ یەکێ ڤا، وەکی شێخ مەهموودی خال هەر مەسەلەک، هەر مەتەلۆکەک شرۆڤەکرییە و جی-جیا ژی دەرهەقا وان مەسەلە و مەتەلۆکا دا کو چەتن تێنە فەمکرنێ ناسی دایە. خودانێ کتێبێ نێتا وان گۆتن جمعەتێ زەلال کرییە. ناڤا وان مەسەلا و مەتەلۆکا دا ئەم ڕاستی مەسەلە و مەتەلۆکێد ئوسا تێن، یێ کو هەنە ئوسا ژی بال کوردێ ئیرانێ، سووریایێ، توورکیایێ و کوردێ کو تفاقا

سۆڤیێتیێ دا دژین.

قنیاتێ بەرهەڤکری شێخ مەهموود خال ب هەرفێ ئەرەبی نەشرکریە. ئەوی ئەو قنیاتانا نە کو ب تێماتیکی لێ ب قەیدێ ئالفاڤیتی دایە. شێخ مەهموود خال مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردا قیمەت دکە چاوا گۆتنێ پێشییێ مەیە قیمەتلی، گۆتن، کو ناڤا سال و زەمانا دا ناڤا زارگۆتنا جمعەتێ دا بەرە-بەرە شمشات بوونە، چێ بوونە، بوونە دور و جاواهر. خێنژ وێ، شێخ مەهموود خال تێ سەر وێ فکرێ، وەکی مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردی نیشان ددن بیر و باوارییا جمعەتێ، فیلۆسۆفیا وێ.

بەرهەڤکرنا مەسەلا و مەتەلۆکا، چاوا جوورەکی زارگۆتنا جمعەتییە کەڤن، یا کو کوولتوورا جمعەتێ را، بیر و باوارییا وێرا گرێدایە، بەر گوهداریا کوردزانێ سۆڤیێتیێ و وەکیلێ ئینتێلیگێنسیا وێیە. ڤێ دەرەجێ دا خەباتەکە قیمەتلی دکن کوردزانێ ئەرمەنیستانا سۆڤیێتیێ.

فۆلکلۆریست هەجیێ جندی، کو خەباتەکە مەزن کرییە بۆنا بەرهەڤکرن و نەشرکرنا فۆلکلۆرا کوردا، سالا ١٩٥٧ ئا باژارێ ئێرێڤانێدا بەرهەڤۆکا ب سەرنڤیسارا "فۆلکلۆرا کورمانجیێ" نەشر کر. .خێنژ قنیاتێد مایین، ئەوی نێزنکی ٣٦٠ مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردی ژی چاپکر. ئەو مەسەلە و مەتەلۆکانا حەتا ڕۆژا ئیرۆئین کوردێ ئەرمەیینستانێ ناڤا خەبەردانا خومیە هەرڕۆژی دا ددنە خەباتێ. ئەوانا هیملی وەختێ شەرێ هەمدنیاییێ ئەولن ژ قەرسێ، عەردەهانێ، وانێ، بیتلیسێ و ساریقامیشێ هاتنە قاڤقازێ. ئەو مەسەلە و مەتەلۆکێد نەشربووی مەجالێ ددنە ئولمدارا، کو ئەو هەمبەری مەسەلە و مەتەلۆکێد بەرێ نڤیسی و چاپکری بکن و جاهابا گەلە پرسێ حەواسکار ژێ بستینن. مەسەلە و مەتەلۆکێد بەرهەڤۆکا "فۆلکلۆرا کورمانجیێ_-دا نەشر بووی ب جوورێ ئالفاڤیتێ، هاتنە نەشرکرنێ.

خێنژ وێ، مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردی جارنا ڕۆژنەما "ریا تەزە_-دا ژی چاپ بوونە. ئەڤا یەکا نەک تەنێ دەرقا قیمەتێ زارگۆتنا جمعەتێ دا شەدەتیێ ددە، لێ ئەو ئوسا ژی قەواتەکە تەزە ددە بۆنا شوخولێ بەرهەڤکرنا فۆلکلۆرا کوردێ ئەرمەنیستانێ.

هنە مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردی، کو دنێناسبوونێ و تەربیەتکرنا زارا ڤا گرێداینە، گەلە جارا کتێبێ دەرسێ زمانێ کوردی دا ژی نەشربوونە.

سالا ١٩٦١-ئێ باژارێ مۆسکڤایێ، چاپخانا "ڤۆستۆچنایا لیتێراتوورا -ئێ ب تەرجما ئوورسی مەسەلە و مەتەلۆکێد جمعەتێد وەلاتێ ڕۆژهلاتێ ب بەرهەڤۆکەکە ب سەرنڤیسارا "پۆسلۆڤیق ئی پۆگۆڤۆرکی نارۆدۆڤ ڤۆستۆکا" نەشرکر. نێتا هازرکرێ ڤێ بەرهەڤۆکێ

هیملی ئەو بوو، وەکی خوەندەڤانا ب جووریّ مەسەلە و مەتەلۆکێد جمعەتیّ ڕۆهلاتیّ، ب خەیسەت، ڕابوون- ڕوونشتاندنا وان بدە ناسکرنیّ. بۆنا بەرهەڤۆکا قیمەتلی کوردزانیّ لێنینگرادیّ قاناتیّ کوردۆ و م. ب. ڕوودێنکۆ، نێزیکی ٣٥٠-ئی مەسەلە و مەتەلۆکیّ کوردا تەرجمە کربوون و دابوونە چاپیّ. بۆنا ویّ یەکیّ، وانا خێنێ قنیاتیّ خوەیە بەرهەڤکری، ئوسا ژی مەسەلە و مەتەلۆکێد کو خەباتیّ ڕ. لیسکۆ، ڕ. جاردین، ئێدووارد نۆئێل، بەرهەڤۆکا فۆلکلۆرا کورمانجایە سالا ١٩٥٧-ئا، بازاریّ ئێریڤانیّ چاپبووی و پۆئێما ئاهمەدیّ خانییە "مەم و زین" بازاریّ هەلەبیّ دا نەشربووی دابوونە خەباتیّ.

خەباتچییّ ئینستیتووتا زمانزانییّ یا ئاکادێمیا ترسس ئولا، چەرکەزیّ بەکۆ، وەختیّ کۆماندیرۆڤکا خوەیە ئولی ل ڕێسپووبلیکا ئادربێجانیّ، نەهییا لاچینیّ ژ زاریّ کوردا ٢٥ مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردی نڤیسینە. قنیاتیّ ژ ئالییّ چەرکەزیّ بەکۆ بەرهەڤکری و کتێبا وییە ب سەرنیڤسارا "زمانیّ کوردێد ئادربێجانیّ" نەشربووی دا نیشان ددن، وەکی ئەو مەسەلە و مەتەلۆک خووت ییّ ملەتیێنە، ییّ تەربییەت کرنیّ و هین کرنێنە. ئاوا نموونەک ژ وان مەسەلا:

"کی کو قەدریّ نانیّ جەهـ نزانە،

ئەو قەدریّ نانیّ گەننم نزانە.

کی کو قەدریّ زمانیّ داککا خوە نزانە،

ئەو قەدریّ زمانیّ دین نزانە".

قنیاتیّ کو چەرکەزیّ بەکۆ بەرهەڤکریە و تەرجمەیی زمانیّ ئووروسی کریە، چقا م ڤا ئەیانە، حەتا ڕۆژا ئیرۆێن جارا ئەولنە، کو چاپ دڤە و کەتییە ناڤا خزنا جمعەتا مەیە بەرهەڤکری.

هوکومەتا ئیرانیّ، ئیراقیّ، توورکیاییّ و سووریاییّ، بۆنا چاپکرنا کتێبێد کوردی ب زمانیّ دیّ مەجال، ڕیّ نە دانە. هەرچیّ نەشربووی ب چەتنای نەشر بوونە. چاوا سالا ١٩٥٢-ئا ئالادین سووجادین دنیڤیسی: "پەندی پێشینانی کوردی وەکوو شتەکیانی تریان-ل ژێر پەردەیی گویان نەدانا مائوونەتەوەو دەستی چاپ نەیانگەشتووتی... ئەولەدیّ جمعەتییە پێشڤاچووی دجەداندن، وەکی ئەدەبیاتا کوردایە دەولەمەند و قەدیمی هەر تەهەری بدنە خەباتیّ. ئاوا، مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردی تمیّ کۆڤارا "گیلاڤێژ"،. "دەنگیّ گێتی تەزە"، "دیاری کورد"، "ڕۆژی نوو"، "هەوار"، "ڕۆناهی" و کۆڤار، ڕۆژنەمێد ماییندا چاپ دبوون. شاییریّ کوردایی کلاسیک پیرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠) سەر هیمیّ مەسەلە و

مەتەلۆکێ کوردی نێزیکی ٤٤٦ـ چارێک نڤیسین و ئەو ڕوویێلێد ڕۆژنەما، کو ئەوی هیم دانیبوو و چاپدکر، بەرە-بەرە نەشر کر.

پیرەمێرد ناڤا چارێکێ خوە دا نێت و فکرا هەر گۆتنەکە جمعەتێ شرۆڤەدکر و ئەو ب فیلۆسۆفی زەلال دکر.

هەلبەت ئەو مەسەلە و مەتەلۆکانا، ئەو چارێکێ چاپکری تو جارا قیمەتێ خوە بۆنا کوولتوورا ملەتێ کوردا نوندا ناکن.

ب پرسا بەرهەڤکرنا مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردا ڤا ڕۆژێد مە دا نوسا ژی نولدار و وەکیلێ ئینتیلیگێنسیا جمعەتێد جینار مژوول دبن. ئاوا مەسەلە فۆلکلۆرزانێ ئیرانی، ڕێداکتۆر و چاپکرێ ڕۆژنەما "ئیسفاهان" ئەمیر کوولی ئەمینی، کو ژ سالێد ٢٠-ئی دەستپێکری هێژدە سالا بەرهەڤکرنا مەسەلە و مەتەلۆکێ جمعەتا خوە ڤا مژوول بوویە، سەر لەپەرمێ دەفتەرێ خوە، ڕەخ مەسەلە و مەتەلۆکێد فارزا نڤیسییە نوسا ژی گەلە مەسەلە و مەتەلۆکێ کوردێ، کو کوردستانا ئیرانێ دا دژین. لێ حەیف، ئەو قنیاتێ قیمەتلی حەتا ڕۆژا ئیرۆئین چاپ نەبوونە.

مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردی ئەم دەستنڤیسارێ لازۆ دا (هاکۆب خازاریان ١٨٥٦-١٩٢٦)، کو فۆندا مووزێیا ئەدەبیات و ئیسکووستڤایێ یا ئاکادێمیا ئەرمەنیستانێیە نولا دا تێنە خوەیکرنێ، دڤین. لازۆ ئەو مەسەلە، مەتەلۆکانا و هنە قنیاتێد ژ زارگۆتنا کوردا هیملی ژ کوردێ بازارێ تلبیسێ نڤیسییە.

هەرگێ دەرەجا بەرهەڤکرن و چاپکرنا مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردی دا پر هندکی شوخول هاتییە کرنێ، د دەرەجا ب نولی لێنهێراندنا مەسەلە و مەتەلۆکا دا کێم خەڤات هاتییە کرنێ. ئەم هەر ناڤێ دو خەباتێ ئێدووارد نۆئێل و تۆما بووا دکارن بیننە بیر، یێ کو هیملی ب چەعڤێ ئەتنۆگرافیێ هاتنا نڤیسار.

کۆتاسییا ڤورنا خخ، دەستپێبوونا ڤورنا خخ گوهداریا جمعەتێد ئێڤرۆپایێ بەرب کوردا و کوولتوورا وێ زێدە دبوو. مەنا وێ یەکێ نووسیانێ کوردا بوون بۆنا ئازایا و سەربەستییا وان. ئەو نووسیان ئالیێ هوکومەتێ توورکیایێ، ئیرانێ و ئیراقێ ب دەستێ زۆرێ، ب کۆمەکدارییا دەولەتێ ئیمپێریالیستیێ خوونێ دا دهاتنە خەنق_ئاندن. جمعەتێد دەولەتێ ئێڤرۆپایێ دخواستن دەرهەڤا عەمرژییینا کوردا، ڕابوون-روونشتاندنا وان، ئەرف و ئەدەتێ وان دا بزانبن، وێرا ببنە ناس. و وان چاخا، وەلاتێ ئێڤرۆپایێ دا پەی هەڤ کتێب دەرهەڤا کوردا دا و کوردستانێ دا چاپ دبوون.

ئێ. نۆئێل سالا ١٩٢٠-ئی مقالەکە ب سەرنڤیسارا "خەیسەتێ کوردا ناڤا مەسەلە و مەتەلۆکێ وان دا" کۆڤارا «بولّتن ئۆف تهە سجهۆئۆل ئۆف ئۆرمنت ئاند ئافرج ستودەس» نەشر دکە. مقالە هیملی سەر هیمێ ڤنیاتێ، کو ئێ. نۆئێل ژ کوردێ هەکاریان بەرهەڤ کربوو، هاتبوو نڤیسارێ. سەر هیمێ ئەنەنەکرنا مەسەلە و مەتەلۆکێ بەرهەڤکری ئێ. نۆئێل نیشان ددا ئازاییەزی، کۆباریا کوردا، نیشان ددا وەکی چاوا کورد بۆی خیرەتێ، بۆی ناڤناموسا خوە، بۆی هەقیێ هازرن عەمرێ خوە ژی بدن. ڤنیاتێ نەشرکری دا هەنە ئوسا ژی مەسەلە و مەتەلۆکێد ئوسا، یێ کو نەومکەهەڤبوونا عەمرێ جمعەتێ کڤش دکن.

ئێ. نۆئێل ١٠١ مەسەلە و مەتەلۆکێد کوردێ هەکاریان پارەڤەدکە سەر چەند پارا. مەسەلە: "زەواج"، "کولفەت"، "هەبوون و تونەبوون"، "مێڤانهزی" و ئێد ماین. ئەوی نیشان دایە ئوسا ژی پەڤگرێدانا کوردا جمعەتێ جینارڕا. ئەوێ مقالێ دا خێنژ تەرجما زمانێ ئینگلیسی، ئێ. نۆئێل ددە نموونێ مەسەلە و مەتەلۆکا ب زاراڤێ کوردێ هەکاریان، یا کو قیمەتێ ڤنیاتێد نەشرکری زێدە دکە.

سەر هیمێ ڤنیاتێ زارگۆتنا جمعەتێ، کوردزان تۆما بووا خەبەتەکە قیمەت ب سەر نڤیسا "روهێ کوردا سەر هیمێ ڤنیاتێ فۆلکلۆرێ" دنڤیسە. تۆما بووا ب مەسەلا نیشان ددە وێ پەڤگرێدانێ، یا کو هەیە ناڤا عەمر و زارگۆتنا جمعەتێ دا و ئیزبات دکە، وەکی گەلە قەوماندنێ، کو عەمرێ کوردا دا دقەومن بێ بەرمتە ئوندا نابن، ئەو ب تەهەرەکی، ب جوورەکی ناڤا زارگۆتنا جمعەتێ دا تێنە کڤشێ. سەر هیمێ گەلە مەسەلا تۆما بووا نیشان ددە فیلۆسۆفیا جمعەتا کوردا، پەڤگرێدانا مەریا و فەمداریا وان.

ئۆردیخانێ جەلیل.

## ناڤ نیشا چەعڤکانییا

ئاسم: ئالادین سوودژادی، میژووی ئەدەبی کوردی، بەخدا، ١٩٥٢.

با: چ.خ. باکـایێف، قـزک ئـازێربایدژانسکیخ کـووردۆڤ، مـۆسکڤـا، ١٩٥٦. (ب زمـانێ ڕووسی).

بیم: هـ. باگراتوونی (هـ. کارینیان)، بناشخارهن ئنقن ئر مەج، ب ماس، ئەرمڤان، ١٩٢٠. (ب زمانێ ئەرمەنی).

ئەگ: مـەسـەلە و مـەتەلۆکێ، کو خـودانێ ڤێ کـتـێبێ و جـەلیلێ جـەلیل ژ زارێ کـوردێ ڕێسپووبلیکا ئەرمەنستانا و گورجستانا سۆڤێتیێ نڤیسینە.

زکۆ: س. ئا. یەگیازارۆڤ، کراتکی ئێتنۆگرافیچێسکی ئۆچێرک کووردۆڤ ئەریڤانسکۆی گـووبێـرنی ـ زاپیـسکی کـاڤکازسکۆگـۆ ئۆتدەلا ئیـمـپـێـراتۆرسکۆگـۆ ڕووسـسکۆگـۆ گێئۆگرافیچێسکۆگۆ ئۆبشچێستڤا، کن. خ، تیفلیس، ١٨٩١ ستر. ١٥٥-١٥٨.(ب زمانێ ڕووسی).

کی: مەسەلە و مەتەلۆکێ، کو خودانێ ڤێ کتێبێ و جەلیلێ جەلیل ژ زارێ کوردێ ئیراقێ نڤیسین.

کس: مـەسـەلە و مـەتەلۆکێ، کو خـودانێ ڤێ کـتـێبێ و جـەلیلێ جـەلیل ژ زارێ کـوردێ سووریایێ نڤیسین.

پب: پ. بەدار، گرامماره کورده، پارس، ١٩٢٦.

پلپ: پ. لەرخ، ئیسسلێدۆڤانیێ ئۆب ئیرانسکیخ کووردا خ ئی ئیخ پرێدکا خ سێڤێرنیخ خالدێیا خ، کن. ٢، سپب، ١٨٥٧.(ب زمانێ ڕووسی).

ڕلپ: ڕ. لەسـجۆت، پرۆڤـەربەس ئەت ئـەنگمـەس کـوردەس؛ بنهـێر کـۆڤـارا "ڕەڤـوە دەس ئەتودەس ئسلامقوەس" ١٩٣٧، جە. ئڤ، پپ. ٣٥٠-٢٠٥

ڕت-١٩ ڕۆژناما "ریا تەزە، سالا ١٩٦٥ ن ١٩ (٧٠٦)

ڕت-٢٧ڕۆژناما "ریا تەزە، سالا ١٩٥٨ ن ٢٧ (٩٤٣)

ڕت-٦٩ ڕۆژناما "ریا تەزە، سالا ١٩٥٨ ن ٦٩ (٩٨٥)

رت-٥٥ رۆژناما "ريا تەزە، سالا ١٩٦٢ ن ٥٥ (١٣٨٧)

رت- ٥٣ رۆژناما "ريا تەزە، سالا ١٩٦٤ ن ٥٣ (١٥٩٣).

تک: ر. لەسجۆت، تەختەس کۆئوردەس، پت. ١، پارس-بەيرۆنوتھ، ١٩٤٠.

تب: تۆماس بۆس. لعامە دەس کوردەسا لا لومەرە دە لەئورە فۆلکلۆرە، بەيرۆئوتھ، ١٩٤٦

توۆف: مەھمەد تۆفيق ووردى، فۆلكلۆرا كوردى، بەخدا، ١٩٦١، (ب ھەرفێ ئەرەبى).

مەسەلە و مەتەلۆكێ جمعەتا كوردا.

كتێبا ىْ

رێداكتۆر سەهیدێ ئیبۆ

شكلچی ف. ك. مانداكوونی

رێداكتۆرێ بەدەومتیێ ئا. ڤ. گاسپاریا

رێداكتۆرێ تێخنیكیێ ئۆ. س. پانیكیان

كۆرێكتۆرێ كۆنترۆل ج. جەلیل

كۆڤارا "یاخام"، (ب زمانێ فارزی). تێهرای، ١٩٦٦، ژ ٩، رووپالا ٤٦٧.

ئەو دەر.

دەستیڤیسار بن شیفرا د ٤٤٧، ژا (كوردسا) تێ خومیكرنێ.

ر. لەسجۆت پرۆڤەربەس ئەت ئەنگمەس كوردس، بنهێر كۆڤارا «رەڤوە ئەعتودەس ئسلامقومس» پارس، ١٩٣٧ جاهەر ئڤ‌سپ. ٢٠٧-٢٥٢

ئیسمایل هەقی شاوێس، قسەیی پێشینان، بەخدا، ١٩٣٧

ماررووف جیائووك، حەزار بێژ و بەند (ب هەرفێ ئەرەبی)، بەخدا ١٩٣٨

شێخ مەهموود خال، پەندی پێشینان (ب هەرفێ ئەرەبی)، بەخدا ١٩٥٧.

فۆلكلۆرا كورمانجیێ، ئێرێڤان، ١٩٥٧.

نۆئەلە.، تەهە جهاراكتەر ئۆڤ تەهە كوردس ئاس هوستراتەد بی تەهەر پرۆڤەربس ئاند پۆپولار ساینگس، «بنهێر» "بولێتن ئۆڤ تەهە سجهۆئۆل ئۆڤ ئۆرەنت ئاند ئافرج ستودنەس". ١٩٢٠، ڤۆل. ىْ، ئڤ پپ ٩٠-٧٩.

تهۆماس بۆس، ئۆ. پ.لامە دەس كوردس ئا لا لومەرە دە لەئور فۆلكلۆرە، بەیرۆئوتە، ١٩٤٦، ٥٧ پ.

## سەرەجەم

ئەم بەرهەمە تەنیا بۆ زمانە

ئەوەی لە نێوان توێیەلی ئەم بەرگەدا دێتە دیتن، کتێبێکی سەربەخۆ یان بابەتێکی سەربەخۆ نییە. کۆمەڵێك بابەتی لەیەکتر جودا و لەیەکترەوە دوور، لەلایەن بنووسی جیاجیا و لە ساڵەیلی جیادا هاتوونەتە نووسین، کەواتە چییە گەلۆ؟

لە سەردەمی دەوڵەتی سۆڤیەتیدا، کورد پشکێکی بچووکی لە ماف بەرکەوت، ئەویش لە بواری زمان و ئەدەب و کۆوەکردنی کەلەپووردا. کەس نازانێ لە بیستەیلی سەتەی رابردووەوە تا کۆتای هەشتایەل چەند کتێب بە کوردی لەوێ دەرچووە، بەڵام بە مەزەندە ٣٠٠ تا ٤٠٠ دەبێ. کوردی گشت پارچەیلی کوردستان، سوودێکی ئەوتۆیان لەو بەرهەمەیلە وەرنەگرتووە، بە تایبەتیش لەبەرئەوەی بە تیپی کیریلی هاتوونەتە نووسین. بە بۆچوونی ئێمە، ئەو گشت بەرهەمەیلە قۆناغێکی گرینگ لە نووسین بە زوانی کوردی پێك دەهێنن، رەنگە لە بەرهەمەیلی ناو توێی ئەم زنجیرەیەدا، زۆر کتێب و پەلکە هەبن نرخێکیان نەبێ جگە لە زوان. ئێمەش هەر زوانمان مەبەستە.


چاپخانەی
ئاراس
هەولێر - کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil


ISBN 978-9933-487-47-8
9 789933 487478
بایی ٧٥٠٠ دینارە